ئاستانە



# بەر لەوەی شووراکە لێ بدرێت

نووسین: پرۆفیسۆر ئیاد قونەیبی
وەرگێڕان: ئەحمەد نووری





پرۆفیسۆر ئیاد قوونەیبی

ناوی تەواوی «ئیاد عەبدولحفاز حەماد قوونەیبی»یە. ئەم بانگخوازە ئەکادیمییە لە ساڵی (١٩٧٥) لە دایک و باوکێکی فەلەستینی لە شاری « السالمية» لە وڵاتی کوەیت لەدایکبووە. هەر لە منداڵییەوە و لەژێر کاریگەری باوکیدا فێری زانستە ئیسلامییەکان بووە و قورئانی پیرۆزی لەبەرکردووە.

لە ساڵی (١٩٩٢)دا، پلەی یەکەمی بەدەستهێناوە لە پێشبڕکێیەکی ئەدەبی بۆ نووسین و خوێندنەوەی شیعر لەسەر ئاستی عومان.

بڕوانامەی بەکالۆریۆسی لە دەرمانسازی لە کۆلێژی زانست و تەکنۆلۆژیای ئوردن ساڵی (١٩٩٨) بە ئاستی زۆر باش لەگەڵ پلەی شەرەف بەدەستهێناوە.

لە ساڵی (٢٠٠٣)دا لە زانکۆی «هیوستن»ـی ئەمەریکی لە ویلایەتی تکساس، بە پلەی زۆر باش بڕوانامەی دکتۆرای بە پلەی یەکەم لە دەرمانسازیدا بەدەستهێناوە، هەروەها لە ساڵی (٢٠٢١) گەیشت بە پلەی پرۆفیسۆر لە هەمان بواردا. لە ئێستادا پرۆفیسۆر ئەیاد بەهۆی ڕۆشنفیکری و لێهاتووی و ڕەوانبێژی لە قسەکردن و ئەدای وتاردان و زانیاری گرنگ لە وتارەکانیدا، یەکێکە لە کەسایەتییە دیارەکانی دونیایی بانگەواز و هەزاران کەس لە وڵاتە جیاجیاکانەوە گوێگری وتار و وانە و نووسینەکانین. خاوەنی چەندین بەرهەمی نووسراوە لەوانەش (حسن الظن بالله، سيكولوجيا الاحراف، نصرة للشريعة، تحرير المراة الغربية القصة الكاملة). هەروەها یەکێکە لەوانەی بەشداربووە لە پێداچوونەوە و دەستنیشانکردنی هەڵە لە پەرتووکی (Lippincott Illustrated Reviews: Pharmacology (Lippincott Illustrated Reviews Series) کە وەکوو پرۆگرامی خوێندن لە زۆربەی زانکۆکانی جیهان بەشە پزیشکییەکان دەخوێندرێت.

دیارترین وانەکانی لە کەناڵی یوتیوب و تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان کە بە چڕی باسن لە دید و تێڕوانینە ئیسلامییەکان بریتین لە: (فن حسن الظن بالله، سيكولوجيا الانحراف، نصرة للشريعة، بالقرآن نحيا، رحلة اليقين، ...) جگە لە مانەش خاوەنی چەندین وانەی پەروەردەیی ڕۆحی و بەربەرەکانێ لە دژی دژەئیسلام و بێباوەڕان و شیکردنەوە و تەفسیری سورەتەکانی قورئانە.

# بەرلەوەی
# شووراکە لێ بدرێت

نووسینی

د. ئیـــاد قونەیبی

وەرگێڕانی

ئەحمـــەد نووری



# ئەمەیە دووڕوویی، سا وریای بن!

ئەم پەڕتووکە:

❁ هۆشیاریدانێک لە یەک مەترسیدارترین دیاردەکان لە ژیانی هاوچەرخی موسڵماناندا.

❁ ڕاستکردنەوەیەک بۆ چەمکەکانی خەڵک لەبارەی دیاردەی دووڕوویییەوە.

❁ هەوڵێک بۆ تێگەیشتن لەو پرۆسە دەروونییانەی کە سەر بۆ کەوتنە ناو نیفاقەوە دەکێشن.

❁ هۆشیارکردنەوەی موسڵمانان کە زۆرێکیان دەشێت بکەونە ناو سیفەتگەلێکی نیفاقەوە و هەستیشی پێ نەکەن.

❁ یارمەتیدانێک بۆ چارەسەرکردنی نەفس لە سیفەتەکانی دووڕووان.

## هۆ مرۆی خوێنەر!

دەسنیشانی حاڵەتی نەفست بکە و چارەسەری بۆ بدۆزەوە بەر لەوەی شووراکە لێ بدرێت!

﴿فَضُرِبَ بَيْنَهُمْ بِسُورٍ لَهُ بَابٌ﴾ [الحديد: ١٣]، «ئەوجا شوورایەکیان لەنێوان لێدرا کە دەرگەیەکی هەبوو.» شوورایەک کە ڕۆژی دوایی لەنێوان باوەڕداران و دووڕوواندا لێ دەدرێت، مونافیقان ئیدی نە ڕووناکی دەبینن، نە لەگەڵ ئیماندارانیشدا دەچنە بەهەشتەوە!

# پێشەکی

إِنَّ الْحَمْدَ لِلهِ نَحْمَدُهُ وَنَسْتَعِينُهُ وَنَسْتَغْفِرُهُ، وَنَعُوذُ بِاللهِ مِنْ شُرُورِ أَنْفُسِنَا وَمِنْ سَيِّئَاتِ أَعْمَالِنَا، مَنْ يَهْدِهِ اللهُ فَلاَ مُضِلَّ لَهُ، وَمَنْ يُضْلِلْ فَلاَ هَادِيَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ.

پەروەردگارا صەلات و سەلامت بڕژێنە بەسەر خۆشەویستی دڵی باوەڕداران و سوکنایی چاویان، پێشەوای ڕاستاڵان و ئارامگران، کە نەفامی و گومڕاییت پێ سڕییەوە و دونیات پێ ڕووناک کردەوە و بە چرای ڕۆشنات گێڕا، پێغەمبەرەکەت موحەممەدی کوڕی عەبدوڵڵا صلی الله علیه وآله وصحبه وسلم.

پەروەردگارا ڕەزامەندیت بکە بەشی ئەو هاوەڵانەی وەکوو شێر لە دەوری بوون، سەریانخست و پشتیان گرت و مەزنیان ڕاگرت و شوێن ئەو نوورە کەوتن کە داتبەزاندبووە سەری، ئەوانەی بە گیان و ماڵ قوربانیان بۆی دا، سا خوای باڵادەست لێیان ڕازی بە و ناو و دەنگیان لە جیهاندا بەرز بکەوە و ئێمەش لە پۆلی ئەواندا حەشر بکە.

لە پاشان:

وا نازانم لەم ڕۆژگارەماندا باسکردن لە دووڕووان مافی خۆی پێ بدرێت لە گوتار و ئامۆژگاری و نووسراوەکان، وێڕای مەترسیدارییەتیی گەورە و بێئاگاییی قووڵی خەڵک لێی و پڕبوونی قورئان و سوننەت لە گوژمەیەکی گەورە دەق و باس لەسەر ئەم بابەتە. بۆیە پشت بە پەروەردگار تاوم دا بۆ پێکنانی پەڕتووک، مەترسیدارترین سیفەتەکانی دووڕووانی تێدا کۆ کرابێتەوە، بە ئومێدی ئەوەی خەڵکانی پێداگر و بەخەم بۆ سەلامەتمانەوەی باوەڕەکەیان،

بیخوێننەوە و لە ناو خۆیاندا بڵاوی بکەنەوە، بەشکوو بە پشتیوانیی خوا هاوکار بێت لە هۆشیاریدان سەبارەت بە مەترسیی دووڕوویی و دووڕووان.

❊❊❊❊❊

پەڕتووکەکەشم دابەش کردووە بۆ پێشەکییەک گرنگییەتیی بابەتەکە بخاتە ڕوو، پاشان کۆمەڵە چەمکێکی گرنگ لەبارەی دووڕووییەوە، بەشوێنیدا سیفەتەکانی دووڕووان، لەژێر هەر سیفەتێکیشدا ئەم پێکهاتانە هەن:

ئەو ئایەت و فەرموودانەی ئاماژە بەو سیفەتە دەکەن.

نموونەگەلێکی بەرجەستەکەری سیفەتەکە هەر لە واقیعی خۆمان.

کۆمەڵە ئایەت و فەرموودەیەک، سیفەتە بەرانبەرەکە ڕوون دەکەنەوە لە باوەڕداردا کە پەسەندی لای خوا و پێغەمبەرەکەیەتی (ﷺ)، لە بەرانبەر سیفەتە باسکراوەکەی دووڕوویدا. سەرجەم ئەوەش، بە پشتیوانیی خوا، بەبێ کورتکردنەوەیەکی بە کەموکوڕی، یان درێژدادڕینێکی وەڕەزکەر.

# پێشەکیی خستنەڕووی گرنگییەتیی بابەتەکە

## مانای دووڕوویی

نیفاق لە زمانی عەرەبیدا لەو نەفەق/تونێلەوە هاتووە کە ئاژەڵ دەیکەنێت و دوو سەری کراوەی هەیە، جا ئەگەر لە سەرێکەوەی بۆی چوویت لە سەرەکەی دیکەوە هەڵدێت. مرۆڤی دووڕووش بە هەمان شێوە هەڵوێستەکانی لەنێوان ئیمان و کوفردا، بەپێی ترسان یان ئاسایش دەگۆڕێت، وتراویشە: لەو نەفەق/چاڵەوە هاتووە کە ئاژەڵ دەیکەنێت بۆ خۆحەشاردان و پارێزران، مونافیقیش ئاوا باوەڕ دەردەخات و بێباوەڕییەکەی، یان گومان و نەخۆشییەکەی دڵی، دەشارێتەوە.

## زۆری دووڕووان

ئیبن قەییم سەبارەت بە دووڕووان دەفەرموێت: "هێندەی نەمابوو قورئان هەمووی باسی ئەوان بێت، لەبەر زۆرییان لەسەر پشتی زەوی و لە سکی گۆڕەکانیشدا، خوا نەکات زەوی بەتاڵ بێت لێیان، نەوەکا باوەڕداران هەست بە تەنیایی بکەن لە کوچە و کۆڵانەکاندا و ژیان و گوزەرانی خەڵکیش پەکی بکەوێت و دڕەندە و کەڵبەداری چۆڵەوانییەکان بێن بەسەریاندا".

ئەوەتا ئیبن قەییم دوعای ئەوە دەکات دووڕووان پاکتاو نەبن، چونکە ئەوە بە واتای لەناوچوونی زۆرێک لە خەڵک دێت و ژیانیش بەوە پەکی دەکەوێت!

بە حەسەنی بەصری -کە لە پێشەوایانی تابیعینە- گوترا: "ئەرێ باوکی سەعید، ئەمڕۆ و دووڕوویی؟" یانی ئایا ئەمڕۆ نیفاق هەیە؟ فەرمووی: "ئەگەر لەو کۆڵانانەی بەصرەدا نەمێنن، بیریان دەکەیت"!

## زۆری ئەو ئایەتانەی پەیوەستن بە دووڕووانەوە

لەبەر زۆریی دووڕووان و زیاد مەترسیداربوونیان لە هەموو ڕۆژگارێکدا، پەروەردگار لە سوورەتگەلێکی زۆری مەدەنیدا ڕوونکردنەوەی درێژی بە سیفەتەکانیان داوە.

نابینی چۆن خوای بالأدەست باسی لە نەخۆشیی دڵیان و فێڵکردنیان لە موسڵمانان کردووە لە سوورەتی بەقەرەدا، لە پاشان هەرەسکردن و بۆڵەبۆڵ و ساردکردنەوەیان بۆ خەڵک لە ئالی عیمران دا، پاشان پشتکردنیان لە حوکمی خوا و پێغەمبەرەکەی لە نیساء دا، پاشان دۆستایەتیکردن و پشتیوانییان بۆ بێباوەڕان لە مائیدەدا، ئەوجا گومان خستنەسەر بەڵێنی پەروەردگار لە سەرخستن و دەرخستنی ئایینەکەیدا لە ئەنفالدا، پاشان سڵەمینەوە و پەککەوتنیان لە ئاست جیهاد و تانەدانیان لە موسڵمانان لە تەوبەدا، پاشان کەم پێقایمی و چەسپانیان لە سوورەتی حەجدا، پاشان بژارکردنی ئایین بەپێی ئارەزوو و بەرژەوەندیی خۆیان لە نووردا، پاشان کەم سەبرییان لە عەنکەبووتدا، لە پاشان شکاندنیان بۆ پەیمانی خوا لە ئەحزابدا، ترسنۆکییان لە موحەممەددا، گومان خراپییان بەرانبەر بە خوا لە فەتحدا، فریوخواردنیان بە ئومێدەکانیان لە حەدیددا، سوێندی درۆخواردنیان لە موجادیلەدا، پشتبەردانیان بۆ دۆستەکانی خۆشیان وەختێک کە لاواز دەبن لە حەشردا، پاشان بێئەدەبییان بەرانبەر بە پێغەمبەری خوا و باوەڕداران لە مونافیقوندا، ئەوجا شایەنبوونیان بە زبری و توندی لە سوورەتی تەحریمدا. حەقدە سوورەتی لێوانلێو لە هۆشیاریدان لێیان و درێژەدان بە باس و سیفەتیان.

لەپاش هەموو ئەمە، دەشێت وا بزانرێت دیاردەی دووڕووان کۆتایی هاتووە و ئەو ئایەتانەی وەسفییان دەکات لەم دەورانەی ئێمەدا پێویست نین مەگەر بۆ تەبەرڕوکی خوێندنەوە و تۆمارکردنی مێژوویی بۆ دیاردەکە؟!

## مەترسیداری دووڕوویی و دووڕووان

سا شکمان نییە بۆیە پەروەردگار زۆر لەسەر باسی دووڕوویی چووە تاکوو ئێمە بەرچاوڕۆشن بین لەبارەی، وریای نیفاق بین لە خودی خۆماندا و وریای مونافیقانیش بین، ئاگادار بین نەکا یەک لەو سیفەتانەیان لە منداڵەکانماندا سەوز بکەین، بگرە لەسەر ڕێگەی ڕاست و پێچەوانەی ئەوە باریان بهێنین.

(الله) فەرموویەتی: ﴿وَكَذَلِكَ نُفَصِّلُ الآيَاتِ وَلِتَسْتَبِينَ سَبِيلُ المُجْرِمِينَ﴾ [الأنعام: ٥٥]، «ئاوەها ئایەتەکان ڕوون دەکەینەوە و دەخەینە ڕوو، بۆ ئەوەشی کە ڕێگەی تاوانباران ڕوون و دیار بێت.»

پێغەمبەرمان (ﷺ) فەرموویەتی: "نیشانەی دووڕوو سیانە، با ڕۆژوو بگرێت و نوێژیش بکات و بڵێتیش موسڵمانم."[١] جا پێغەمبەر (ﷺ) ئاگاداری سیفەتگەلێکی مونافیقمان دەکاتەوە، تاکوو فریوی ڕۆژوو و نوێژی نەخۆین و ئەوەی کە بڵێت من موسڵمان، وەختێک گورز لە کۆمەڵگەی ئیسلامی دەدات کە موسڵمانان سڕ و بێئاگان لە خۆسازدان و گورجبوونەوە بۆ ڕێپێگرتنی و بەرپەرچدانەوەی شیاوی.

## مەترسیداری دووڕوویی لەسەر نەفس

ساتی یەکلاکەرەوە ئەو ساتەیە کە مونافیق پێی دەزانێت وا فەوتاوە، لە خەونی خۆشیی بەهەشتی هەتاهەتاییەوە بۆ دڵنیابوون لە نەهامەتیی دۆزەخی هەتاهەتایی، ساتێکی بەسام و بیم کە هەموو باوەڕدارێک لێی دەترسێت، ئەو کاتی کە باوەڕداران چەندان وێستگەی پاڵفتەکردنیان بڕیوە و بێباوەڕانی پەتییان لێ دابڕاوە، بەڵام هێشتا دووڕووانێک لە ڕیزەکاندا هەن، مرۆڤی

---

(١) (مسلم: ٥٩)

دووڕوو تا دێت ئومێدی گەورەتر و گەورەتر دەبێت، چونکە ئەوەتا چەند هەنگاوێکی ماوە بۆ بەهەشت، چەند هەنگاوێک کە ڕووناکییان دەوێت بۆ بینینی ڕێگەکە، بەڵام باوەڕداران بە ڕووناکیی خۆیانەوە پێشڕەوی دەکەن و دووڕووان لە تاریکاییدا بەجێ دەهێڵن، وێنەی تاریکاییی دووڕوویی و بەگومانبوونیان لە خوا وەختێکی لە دونیا بوون، هێشتا ئومێدگەلێکیان ماوە، هەر یەکەیان وا دەزانێت بە هەمان درۆ و فێڵی دونیا لەوێش ڕزگاری دەبێت، وای زانیوە دەتوانێت فێڵ لە پەروەردگاریشی بکات! ئەوسا مونافیق بانگ دەکات، وەک خوای گەورە وەسفی حاڵەکەی کردووە:

﴿يَومَ يَقولُ المُنافِقونَ وَالمُنافِقاتُ لِلَّذينَ آمَنُوا انظُرونا نَقتَبِس مِن نورِكُم قيلَ ارجِعوا وَراءَكُم فَالتَمِسوا نورًا فَضُرِبَ بَينَهُم بِسورٍ لَهُ بابٌ باطِنُهُ فيهِ الرَّحمَةُ وَظاهِرُهُ مِن قِبَلِهِ العَذابُ﴾ [الحديد: ١٣]، «ڕۆژێک کە دووڕووانی پیاو و ئافرەت، بە باوەڕداران دەڵێن: چاوەڕوانمان بن ئێمەش لە ڕووناکیی ئێوە بەهرەوەر بین، پێیان گوترا: بگەڕێنەوە پشت خۆتان لەوێ بۆ ڕووناکی بگەڕێن، جا بەربەستێکیان لەنێوان لێ درا کە دەرگەیەکی هەیە، ناوەوەی میهری تێدایە و دەرەوەی ڕوو لە سزایە.»

گەڕانەوە بە شوێن ڕۆشناییيەکدا کە پێی بگەنە ناز و نیعمەتی نەبڕاوە، پاشان شووراکە لێدرا بۆ ئەوەی لەو باوەڕدارانە جیا بکرێنەوە کە وا لەسەر ڕێگەی بەهەشتن، بەڵام دووڕووان لە پشت بەربەستەکەوە دەستبەسەر کراون و وا ڕەوانەی سزای دۆزەخ دەکرێن! ساتێکی یەکلاکەرەوەی مەترسیدار و سامناک!

گەلێک بەگومانی فێڵکردن لە خوا ژیان، بەڵام فێڵلێکراو خۆیان بوون ﴿إِنَّ المُنافِقينَ يُخادِعونَ اللَّهَ وَهُوَ خادِعُهُم﴾ [النساء: ١٤٢]، «دووڕووان لەسەر ڕێگەی فێڵکردن لە خوان لە کاتێکدا کە ئەوە ئەوە فێڵ لەوان دەکات.»

سا برام لە خۆت بپرسە، دەی خوشکم تۆش لەخۆت بپرسە: "بڵێی ئەو ساتە من لە پێش بەربەستەکەوە بم، یان لە پشتی؟!" خۆت بێنە پێش چاو وەختێکی ئەو شوورایە لێدراوە، لە پشتتەوە بێت و بزانیت کە تۆ باوەڕدار و ڕزگاربوویت، دەکەویتە سەر ئەژنۆ و بەگریانەوە سەر دادەخەیت لە خۆشی سایەی میهر و منەتی پەروەردگار بەسەرتەوە، یان بڵێی ئەو شوورایە لە پێشتەوە قوت بێتەوە و کۆتت لە مل بکەن و بە زنجیر پەلکێشی ئاگری دۆزەخت بکەن، بەرەو قووڵایی ڕاست بۆ چاڵترین خاڵ: ﴿إِنَّ الْمُنَافِقِينَ فِي الدَّرْكِ الأَسْفَلِ مِنَ النَّارِ﴾ [النساء: ١٤٥]، «بەدڵنیاییەوە دووڕووان لە پلەی هەرەخواری ئاگردان.»

دەی خوایە یەکەمان پێ بدەیت ...

## وریابوون لە دووڕوویی

ئیبن قەییم دەفەرمووێت: "ناڕەحەتی و ناڵەی ئیسلام بە دەستیانەوە (دووڕووان) گەلێک سەختە، چونکە ئەوان دەدرێنە پاڵی و بە سەرخەر و دۆست و پشتیوانی هەژمار دەکرێن، کەچی لە حەقیقەدا دوژمنین، بە هەموو قەبارە و قاڵبێ بەزم و دوژمنایەتی بۆ دەسازێنن، یەکێ نەزان بێت بە زانست و چاکسازی تێی دەگات، بەڵام ئەو پەڕی نەفامی و خراپەنانەوەیە. داخی گرانم چەند لانکەی ئیسلامیان شێواند! چەند قەڵایان لە ڕیشەوە کێشا و ڕووخاند! شکۆی چەند چیا و هەڵکەوتەی ئیسلامیان شکاند! چەند ئاڵای سەرکەشیان هێنایە خوارەوە! چەند پاچ و پێمەڕەی دەستیان گیراندە ڕەگەکانی کە بیپسێنن! چەند چاوگەی ڕۆشنیان بە ڕاوبۆچوون و دەمی هەراشیان داشاری و کوێر کردەوە! هێشتا کە ئیسلام بەدەست ئەوانەوە دەناڵێنێت و شەڕی ئەوانە یەخەی دەگرێت، هەردەم لەشکری گومانسازی ئەوانە جار لەدوای جار گورزی لێ دەوەشێنێت، بەوەشەوە بانگەشەی چاکسازی دەکەن! ئەرێ سوێند بە (الله) خراپساز هەبێت

ئەوانن بەڵام هەستی پێ ناکەن."

هەر بەهۆی مەترسییانەوە پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿هُمُ العَدُوُّ فَاحذَرهُم قاتَلَهُمُ اللَّهُ أَنّى يُؤفَكونَ﴾ [المنافقون: ٤]، «دوژمن ئەوانن سا وریایان بە.»

جا تەواوی دوژمنایەتی لەواندا کۆ کردووەتەوە چۆن بڵێیت هیچ دوژمنێک بوونی نییە جگە لەوان: ﴿هم العدو﴾ «دوژمن ئەوانن» چونکە خراپترین دوژمن ئەوانن.

پێغەمبەریش (ﷺ) فەرموویەتی: "ئەو ترسەی لە هەموو ترسێکم گەورەترە سەبارەت بە ئوممەتەکەم: هەر دووڕوویەکی زمان زانایە."[1] مونافیقی زمان زانا حەق نابووت دەکات و باتڵیش بەو زمانە پاراوەی دەڕازێنێتەوە، لەوانەشە ئەم هەوڵە نەگریسانە پڕ بکات لە (قال الله) و (قال رسول الله)! دەقەکان بە غەیری واتای خۆیان و ئاوەژوو لێک دەداتەوە. ئەمەش یەک لە واتاکانی فەرمایشتەکەی ئیبن قەییمە "چەند چاوگەی ڕۆشنی ئیسلامیان بە ڕاوبۆچوون و دەمی هەراشیان داشاری و کوێر کردەوە." دووڕووی زماندرێژ حەقیقەت سپاردەی خاک دەکات و ئارەزووە ناساغەکان دەردەهێنێت و باش دەیانتەکێنێت و جلی جوانیان لەبەر دەکات، ڕەوانبێژییەکەی و تێکەڵکردنی بۆ پێکهاتەکان، بۆ کوێرکردنەوەی کانییەکانی ئیسلام بەکاردەخات.

هەر لەبەر مەترسییانە کە پەروەردگار فەرمانی پێ کردووین هەڵوێستی ڕوون و پێداگر لە ڕوویاندا بگرینە بەر. ڕازی نەبووە کە باوەڕداران لەبارەی ئەوانەوە ببنە دوو گرۆوە و گرۆیەک هەبن کە نەرمی بنوێنن لەگەڵیاندا: ﴿فَما لَكُم فِي المُنافِقينَ فِئَتَينِ وَاللَّهُ أَركَسَهُم بِما كَسَبوا﴾ [النساء: ٨٨]، «سا ئێوە چیتانە کە سەبارەت بە دووڕووان بوونەتە دوو گرۆوە کە خوا بەهۆی کردەوەی خۆیانەوە پەکی خستوون.»

---

(١) (مسند أحمد: ١٤٣)

بەڵکوو، پێی خۆشە کە باوەڕداران لەگەڵ پێغەمبەرەکەیاندا کۆ ببنەوە بۆ جیهادکردن دژ بە دووڕووان و توندبوون بەرانبەریان. ﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ جَاهِدِ الْكُفَّارَ وَالْمُنَافِقِينَ وَاغْلُظْ عَلَيْهِمْ وَمَأْوَاهُمْ جَهَنَّمُ وَبِئْسَ الْمَصِيرُ ۝﴾[التحريم: ٩]، «ئەی پێغەمبەر جیهادی بێباوەڕان و دووڕووان بکە و لە ڕوویان توند بە و لانەشیان دۆزەخە سا خراپترین سەرەنجامە.»

پێغەمبەریش (ﷺ) ڕەتی کردووەتەوە ئیمان لە کەسێکدا هەبێت کە -لانی کەم بە دڵ- جیهادی ئەوانە نەکات هەندێک سیفەتی دووڕووانیان تێدایە، فەرموویەتی: "هیچ پێغەمبەرێک نییە پەروەردگار ناردبێتی لە گەلێکی پێش مندا، ئیللا لەناو ئەو گەلەی خۆیدا حەواری و هاوەڵی هەبوون دەستیان بە ڕێبازەکەیەوە گرتووە و ئایینەکەیان بە پێشەنگ گرتووە، لە پاشان پاشینانێک دێن بە شوێن ئەواندا، شتێک کە دەیڵێن نایکەن، شتێکیش کە دەیکەن فەرمانی ئەوەیان پێ نەکراوە، سا هەر کەس بە دەستی جیهادیان بکات باوەڕدارە، هەر کەسیش بە زمانی جیهادیان بکات باوەڕدارە، هەر کەسیش بە دڵی جیهادیان بکات باوەڕدارە، لە پشت ئەمەوە ئیتر دەنکە خەرتالەیەکیش باوەڕ بوونی نییە."[1]

پەروەردگاریش نەهی گوێڕایەڵیکردنی دووڕووانی لە پێغەمبەر و باوەڕداران کردووە:

﴿وَلا تُطِعِ الكافِرينَ وَالمُنافِقينَ﴾ [الأحزاب: ٤٨]، «بە گوێی بێباوەڕان و دووڕووان مەکە.»

هەر بۆ ئەوەشی پێیان نەخەڵەتێین، پەروەردگار سیفەتەکانیشیانی بۆ خستووینەتە ڕوو، وەختێک کە هەوڵی فریودانیان داین وەڵاممان بۆیان: ﴿قُل لا تَعتَذِروا لَن نُؤمِنَ لَكُم قَد نَبَّأَنَا اللَّهُ مِن أَخبارِكُم﴾ [التوبه: ٩٤]، «بڵێ عوزر

---

(١) (مسلم: ٥٠)

مەهێننەوە بڕواتان پێ ناکەین خوا لە باس و خەبەری ئێوەی پێ ڕاگەیاندووین.»

لە هەموو ئەمەوە دەزانین مەودای پێویستییەتیی ناسینی سیفەتەکانی دووڕووان چەندە، هەم بۆ خودی خۆمان هەمیش بۆ ناسینەوەی دووڕووان کە ئاگاداریان بین و شوێنیان نەکەوین. یەکێکیش لە مێژووی ئیسلام کۆڵیبێتەوە، دەزانێت هەر کارەساتێک یەخەی ئەم ئایینەی گرتبێت، لەلای مونافیقانەوە بووە، پەڕاوەکانی مێژوویان تاریک و ڕەش کردووەتەوە خوا ڕوویان ڕەش بکات!

هەر لە عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلوولەوە، ڤایرۆسی خراپە، تەمەنێک دڵی پێغەمبەری (ﷺ) سەغڵەت کرد و ستەمی لە زۆرێک شوێنکەوتووی خۆشی کرد، بەهۆی ئەوەوە لەبری بوون بە هاوەڵی پایەبەرز، بە مونافیقی شۆڕبوونەوە بۆ بنی دۆزەخ. هەتا دەگاتە عەبدوڵڵایکوڕی سەبەء بە ئاشووبی خۆیەوە دەگەڕا بەناو موسڵماناندا و هەوڵی نەپساوی دا هەتا ئەو گورزەی لێ دان، بوو بە پێشەنگێکی خراپی ئەوانەشی کە دوای ئەو هاتوون و جەستەی ئیسلامیان کردووەتە بەر دڵی ئاگرپەرەستیان و لە دێرین و ئێستەشدا بەبەردەوامی هەرچی جۆری ئەشکەنجەیە بە ئوممەتی ئیسلامیان چەشتووە. تا دەگاتە موحەممەدی کوڕی موحەممەد مؤید الدین ئیبن عەلقەمی، کە ناپاکی لە موحەممەد (ﷺ) کرد دەرهەق بە ئوممەتەکەی و پشتی تەتاری گرت و لە دین دەرچوو، تاڵاوی دونیای کرد بە قوڕگی موسڵماناندا.

تا دێتەوە سەر موحەممەد کوڕی موحەممەد (نصير الدين)ی طووسی، کە ئیبن قەییم لەبارەیەوە لە (إغاثة اللهفان)دا فەرموویەتی: "کاتێکیش نۆرەی پشتیوانە بێدینەکەی شیرک و بێباوەڕی هات، وەزیری بێدینان، نەصیری طووسی وەزیری هۆلاکۆ؛ دڵی ئاوی خواردەوە بە کارێک بەسەر شوێنکەوتووانی پێغەمبەر و ئایینەکەی ئەویدا هێنا، خستنییە سەر لێوی شمشێر و کینەی دڵی خۆی و دڵی برا بێدینەکانیشی پێ فێنک کردەوە، خەلیفە و قازییەکان

و فەقیهەکان و فەرموودەوانانی سەرجەم کوشت و فەیلەسووفان و ئەستێرەناسان و سروشتناسان و جادووبازەکانی هێشتەوە!"

تا دەگاتە هەندێک لە میرەکانی ڕۆژانی لەشکری خاچپەرستتان سەردەمی (ملوك الطوائف)ی لە ئەندەلووس. ئەوانەی دووڕوو سیفەت بوون و بەربەرەکانێی حوکمی خوایان کرد و پشتیوانیی دوژمنانی بوون و لەگەڵ میللەتی موسڵمان و ژێردەستەشیاندا درۆیان دەکرد و جیهادیان پەک خست، لەسایەی ئەواندا ئوممەت ڕسوایی بە چاوی سەر بینیی و پارچەپارچە بوو و خوێنی ڕژا و کرا بە کۆیلە و کەنیزەک.

سا خۆزگە موسڵمان ژیر دەبوون و وازیان لە فریوخواردن بە ڕوواڵەتەکان دەهێنا، کوێر نەبوونایە لە ئاست ناسینەوەی دووڕووان تەنیا بەوەی کە ناوی ئیسلامییان لەخۆیان ناوە، گومانی باش و دڵی نەرمییان بۆ نەخستنایەتە کار، کە هەرگیز مونافیق شایەنی نیانی نییە. بینیمان یەکەم ناوی عەبدوڵلا بوو، دووەمیش هەر عەبدوڵلا، سێیەم و چوارەمیش موحەممەد، هەر تەنیا موحەممەد نا، بگرە موحەممەدی کوڕی موحەممەد! هەمووشیان دوژمنی پەروەردگار و موحەممەدی پێغەمبەری (ﷺ) دەرچوون، لە تاوانی ئەمانە بڕوانە دەرهەق بە ئیسلام و ئەهلەکەی، ئەوجا تەماشای ئەو کۆمەڵانەی دووڕوویی بکە کە دەوڵەتی عوسمانییان داخوراند، ئیدی ئوممەتیان شەقارشەقار کرد و موسڵمانان بوونە هەتیوی سەر سفرەی قەوارە هەرچی و پەرچییەکانی جیهان.

لە هەر گۆڕەپانێکیشدا بەرەنگارییەک هەبێت لەپێناو پاراستنی چەوساوان و شکۆ و نامووسیان، بەردەوام دەستێکی نیفاق لە پشتەوە پەیدا دەبێت کە خەنجەر لە موسڵمانان بدات و چاوی دوژمنیان ڕۆشن بکاتەوە، جا کوفری دیار و ڕاشکاو چەندێکیش بە مەترسی و زیان بێت، هەردەم لە وەختی ڕووبەڕووبوونەوەی ئوممەتی ئیسلامیدا دەستەوەستانە لە بەدەستهێنانی سەرکەوتنێکی گشتگیر و

بەشکۆ بۆ خۆی، مەگەر بە پاڵپشتیی قەتارێکی*[١] لەناو وڵاتانی موسڵماندا و هەر بەناو موسڵمانیشەوە یارمەتیی دوژمن بدات و دڵسۆزی بۆ بکات و بەربەستی سەر ڕێگەی لادات و لێرەوە دەرگاکانی بە ڕوودا بکاتەوە.

هەرگیز دووڕوویەک نابینیتەوە دوژمنایەتیی خۆی بۆ ئیسلام ئاشکرا بکات، بگرە: ﴿وَمِنَ النَّاسِ مَن يُعجِبُكَ قَولُهُ فِي الحَياةِ الدُّنيا وَيُشهِدُ اللَّهَ عَلى ما في قَلبِهِ وَهُوَ أَلَدُّ الخِصامِ﴾ [البقرة: ٢٠٤]، «هەیە لە خەڵکدا کە لە ژیانی دونیادا قسەی سەرسامت دەکات و خواش دەکات بە شاهید لەسەر ئەوەی لە دڵیدایە لە کاتێکدا کە سەرسەختترین دوژمنیشە.»

جا بە قسەی شیرین و لووس فریو مەخۆ و ئەوەت لەپێشچاو بێت کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: "ئەو ترسەی لە هەموو ترسێکم گەورەترە سەبارەت بە ئوممەتەکەم: هەر دووڕوویەکی زمان زانایە."

لە هەمان کاتیشدا وریابوون لە دووڕوویی و دووڕووان، نابێت پاڵنەر بێت بۆ دۆخێک کە بە هەر گومانێک و هەر خەڵکێک بە گۆترە ڕەوانەی تۆمەتی دووڕوویی بکەین و بڕیار لەسەر دیوی نهێنی و شاراوەیان بدەین، بەڵکوو کارمان لەسەر دیوی دیار و لە ڕووی خەڵکە.[٢] گێڕاوییەتییەوە کە عومەر خوا لێی ڕازی بێت فەرموویەتی: "بەڕاستی خەڵکێک لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا (ﷺ) بە بەڵگە و پاڵپشتی وەحی بەرۆکیان دەگیرا، وا ئەمڕۆ وەحی پچڕاوە، ئێستە ئێمە تەنیا بەو کارانەتان کە لێمان دیارە بەرۆکتان دەگرین، جا هەر کەس چاکمان پیشان بدات، لێی بێخەم دەبین و نزیکی دەخەینەوە، نهێنیی هەرچۆن بێت لە ئەستۆی ئێمە نییە، خوا لێی دەپرسێتەوە لەسەر نهێنی و شاراوەکانی،

---

(١) طابور خامس، دەستەواژەیەکە بە واتای ئەو هێزە دێت کە لەناو هێڵەکانی دوژمنی بەرانبەرت ڕێکی دەخەیت و سوودی لێ دەبینیت.

(٢) بوخاری [١: ١٤٦٢]

هەر کەسیش خراپمان بۆ دەربخات، نە لێی بێترس دەبین و نە بڕوایەکی پێ دەکەین، با بڵێتیش نهێنی و شاراوەم پاکە."

لە ئەبوو ئیدریسی خەولانییەوە کە لە حوذەیفەی کوڕی یەمانی بیستووە فەرموویەتی: "خەڵک پرسیاری چاکەیان لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەکرد، من پرسیاری خراپەم لێ دەکرد لە ترسی ئەوەی کە تووشم بێت، جا گوتم ئەی پێغەمبەری خوا، ئێمە لە نەفامی و خراپەدا بووین و ئەوجا خوا ئەم چاکەیەی بۆ هێناین، سا ئایا لەپاش ئەم خێرەوە خراپەیەک هەیە؟ فەرمووی بەڵێ، گوتم دەی لەپاش ئەو شەڕەوە چاکەیەک هەیە؟ فەرمووی بەڵێ، شەخەڵ و خڵتەشی تێدا هەیە، گوتم خڵتەکەی چییە؟ فەرمووی خەڵکێک کە غەیری ڕێگەی من دەگرن، چاک و خراپیشیان لێ دەبینیت، گوتم دەی پاش ئەو خێرە شەڕی تر هەیە؟ فەرمووی بەڵێ، بانگخوازانێک کە لەسەر دەرگەکانی دۆزەخ وەستاون، هەر کەس بە دەنگیانەوە بچێت دەیهاوێژنە ناوی، گوتم ئەی پێغەمبەری خوا، پەسنی ئەوانەمان بۆ بکە؟ فەرمووی ئەوانە لە پێستەی خۆمانن و بە زمانی خۆشمان دەدوێن."

ئیبن حەجەر لە فەتحدا لەسەر ئەو فەرمایشتە «ئەوانە لە پێستەی ئێمەن»: "قابیسی فەرموویەتی واتاکەی ئەوەیە کە لە ڕووالەتدا لەسەر دینی ئێمەن، بەڵام لە ناوەڕۆکدا پێچەوانەی ئەوەن".

ئەوەیە بناغەی پاڵنەری بوونی ئەم پەڕتووکە لەبەردەستتدا، تاکوو سیما و خوخدەکانی دووڕووان بزانیت و لێیان ئەرخەیان نەبیت و بڕوایان پێ نەکەیت. حەقیقەتگەلێکی مەترسیدار لەمەڕ دووڕوویی کە زۆرینەی خەڵک نایزانن. ڕاستیگەلێک هەن بێشک زانینیان پێویستە بۆ ئەوەی موسڵمان بێئاگا نەبێت لە بوونی دووڕوویی لە خۆی یان هەندێک خەڵکانی دەوروبەریدا:

١- **فرەئاستی:** مرۆڤ دەشێت باشییەک وا لە خۆیدا شک ببات، بەهۆیەوە

زۆر بە دووری ببینێت کە دووڕوویی هەبێت، ئەوەش تەنیا لەبەر ئەوەی نازانێت کە یەک مرۆڤ دەشێت نیفاق و ئیمانیش کۆ بکاتەوە، نازانێت دووڕوویی بەشبەشە و ئاستی جیاوازی هەیە، یەک پلە نییە، دەکرێت مرۆڤ شتێک دووڕوویی تێدا بێت، دەکرێت دووڕووی تەواویش بێت.

**٢- گۆڕان لە میانەی کاتە جیاوازەکاندا:** لەوانەیە ڕۆژانێک ئیمانقایمی ببینێت و جا بەهۆی ئەوەوە دووری دەزانێت ئەوەی لە ڕۆژانێکی تردا تێی دەکەوێت، سیفەتەکانی مرۆڤی دووڕوون، ئەوەش چونکە نازانێت کە مرۆڤ دەشێت لەنێوان باوەڕ و دووڕووییدا بێت و بچێت.

**٣- بەخۆنەزانین:** لەوانەیە دڵی بەوە خۆش بێت کە ویست و نییەتی خێری تێدایە، ئیدی وا بزانێت ئەگەر دووڕوو بووایە بەخۆی دەزانی، ئەوەش تەنیا بەهۆی ئەوەوە کە نازانێت مرۆڤ دەکرێت چەشنێک دووڕوو بێت خۆشی پێی نەزانێت، بە جۆرێک تەنانەت هاوەڵانیش لە خۆیان دەترسان دووڕوورییەکیان تێدا بێت کە پێی نەزانن لەبەر زۆر شاراوەبوونی.

زۆرینەی خەڵک وا دەزانن دووڕوویی تەنیا لە کەسێکدا دەبێت، هیچ خێرێکی تێدا نەبێت و ئەندازەی مێروولەیەک ئیمان لە دڵیدا نەبێت و دوژمنایەتی و ڕقێکی بۆ ئیسلام مەڵاس دابێت و ترسی ئاشکرابوونی لەلای خەڵک لەسەری هەبێت.

ڕاستی ئەوەیە کە دووڕووانێک ئەمە حاڵیان بێت، بۆ هەموو ژیرێک دیار و بەرچاون، لە کاتێکدا ئەو دووڕووییەی کەمتر تیژ و ڕوونە بەربڵاوتر و شاراوەترە، تەنانەت هەندێ کجار لە خاوەنەکەی خۆشی، ڕێک ئەمەشە مەترسییەکەی. ئەوانە وا نازانن ئایەتەکانی نیفاق باس لە ئەوان دەکات، وای نابیستن گوتارەکە ڕووە و ئەوانە، کە بەشکوو ئەوە ببێتە هۆکار تەوبە و فریادێک بە خۆیان بگەیەنن و لە ئافاتی دووڕوویی کە تێی کەوتوون دەربازیان بێت.

هەر بۆیە پێمان خۆش بوو حەقیقەتگەلێکی گشتی سەبارەت بە دووڕوویی، بەر لە چوونە ناو سیفەتەکانی دووڕوویی، بەوردی ڕوونکردنەوە پێ بدەین. حەقیقەتەکانیش ئەمانەن:

- دووڕوویی بەشبوونی هەیە و یەک پلە نییە، هەمان کەس دەکرێت باوەڕ و دووڕوویش کۆ بکاتەوە.
- دەشێت مرۆڤ لەنێوان باوەڕ و دووڕوویدا بێت و بچێت.
- دەشێت مرۆڤ بکەوێتە ناو دووڕووییەوە و بەخۆشی نەزانێت.
- دەشێت دووڕوو وا بزانێت خەریکە کارێکی باش دەکات.
- هاوەڵان ترسی دووڕووییان لە خۆیان هەبووە.

## ١) دووڕوویی بەشبوونی هەیە و یەک پلە نییە

دەکرێت مرۆڤ باوەڕ و سیفەتگەلێکی دووڕوویش گل بداتەوە.

أ) هەربۆیە پەروەردگار لە پەسنی دووڕووان لە ڕۆژی ئوحوددا دەفەرموێت: ﴿هُم لِلكُفرِ يَومَئِذٍ أَقرَبُ مِنهُم لِلإِيمانِ﴾ [آل عمران: ١٦٧]، «ئەوان ئەو ڕۆژی لە کوفرەوە نزیکتر بوون وەک لە ئیمان.»

ئیبن کەثیر لە تەفسیرەکەیدا دەفەرموێت: "زانایان بەمە بەڵگەیان هێناوەتەوە لەسەر ئەوەی کە کەسێک دەکرێت حاڵەتگەلی جیاواز وەربگرێت، لە حاڵێکدا نزیکتر بێت لە بێباوەڕییەوە، لە حاڵێکی دیکەدا نزیکتر بێت لە باوەڕەوە".

ب) فەرمایشتەکەی پێغەمبەر (ﷺ):

"چوار هەن لە هەر کەسدا هەبن، دووڕووی پەتییە، هەر کەسیش سیفەتێک

لەوانەی تیابێت، سیفەتێکی دووڕوویی تیایە هەتا وازی لێ دەهێنێت."[١]

بڕوانە چۆن ڕوونی کردووەتەوە کە مرۆڤ دەشێت سیفەتگەلێک خووی تێک بدات، دووڕوویی تێدا بخولقێنن.

شایەنی باسە کە هەندێک لە شرۆڤەکارانی ئەم فەرموودەیە، لێیان ئالۆسکاوە لەو ڕووەوە کە دەکرێت باوەڕدارێکی خاوەن باوەڕی دڵ و زمانیش، ئەم سیفەتانەی تێدا بێت، ئیجماعیش هەیە کە بەهۆی ئەم سیفەتانەوە، حوکمی ئەو نیفاقەی بەسەردا نادرێت وا دەیباتە پلەی هەرەخواری ئاگر، ئەم ئالۆزییەیان بە چەندان لێکدانەوە چارە کردووە، وەک ئەوەی کە دووڕوویی باسکراو لێرەدا، دووڕوویی کردەییە نەک بیروباوەڕی، ئەو دووڕووییە نییە کە لە دین دەریدەکات.

بەڵام، ئێمە لەم پەڕتووکەدا خۆ نادەینە بەر ئەم جیاکارییەی نێوان نیفاقی عەقیدەیی و نیفاقی کردەییدا، چونکە ئەو جیاکارییە وەختێک شایەنی باسە کە بۆ بەرگرتن بێت لە تەکفیرکردنی هەڵەی موسڵمانانێک بە بیانووی بوونی ئەم سیفەتانە تێیاندا. بەڵام ئێمە لەم پەڕتووکەدا دەستمان نەداوەتە یەکلاکردنەوەی حوکمی بابەتی کافربوون، یان موسڵمانمانەوەی خاوەنی ئەم سیفەتانە، ئەمە بابەتێکە کۆڵینەوە و وردەکاری زیاتری دەوێت، بواری ئەم پەڕتووکە نییە. لێرە تەنیا بایەخ دەدەین بە ورياكردنەوە لە سیفەتەکانی دووڕوویی، لەم سۆنگەیەوە وا جوانترە وەکوو چۆن خوا و پێغەمبەر (ﷺ) وشەکەیان بەڕەهایی فەرمووە، ئێمەش وای دەربڕین، تاکوو سڵەمینەوە و هۆشیارییەکە وەک مەبەستە بێتە جێ، هەروەها نەفسەکانیش ئەرخەیان نەبن و بێخەم لە دووڕوویی پاڵی لێ بدەنەوە.

ج) حوذەیفەی کوڕی یەمان خوا لێی ڕازی بێت فەرموویەتی: "چوار دڵ هەیە،

---

(١) (البخاري: ٣٤)

دڵێکی تەخت،[١] ئەوە دڵی مرۆڤی دووڕووە. دڵێکی ناو توێکڵ و داپۆشراو، ئەوە دڵی مرۆڤی بێباوەڕە. دڵێکی پەتی دەڵێی چرایەکی پرشنگداری تیا هەڵواسراوە، ئەوە دڵی مرۆڤی باوەڕدارە. دڵێکیش هەم دووڕوویی و هەم باوەڕیشی تێدایە، وێنەی برینێکە هەم خوێنی بۆ بڕوات هەم کێم و زووخ، وێنەی دارێکە بە ئاوێکی پیس و بە ئاوێکی پاکیش ئاو بدرێت، کام ئاو زۆرتر بوو، زاڵتر دەبێت."[٢]

تەماشای ئەم ئەسەرە چۆن لەنێوان دووڕووی پەتی و خاوەن دڵێکدا کە ئیمان و نیفاقیشی تێدا بێت و کێبەرکێیان بێت؛ جیاوازی کردووە.

هەربۆیە ئیبن کەثیر لە ڕاڤەی سەرەتاکانی سوورەتی بەقەرەدا فەرموویەتی: "دووڕووانێکیش، ئەوانیش دوو بەشن، پەتی، ئەوانەن کە نموونە ئاگرییەکەیان بۆ هێنراوەتەوە. دووڕووانێکی دیکەش ڕاڕا، تاوێک بریسکەکانی باوەڕ دەبینن و تاوێکیش لێیان دیار نامێنێت، ئەمانەش هاوەڵانی نموونە ئاوییەکەن، حاڵیان باشترە لە تاقمی پێش خۆیان."

مەبەست لە نموونە ئاگرییەکە ئەو فەرمایشتەی پەروەردگارە ﴿مَثَلُهُم كَمَثَلِ الَّذِي استَوقَدَ﴾ [البقرة: ١٧]

نموونە ئاوییەکەش ئەو فەرمایشتەیەتی جل جلالە: ﴿أَو كَصَيِّبٍ مِنَ السَّماءِ﴾ [البقرة: ١٩]

مەبەستیشی لەو قسەیەی: "تاوێک بریسکەکانی ئیمان دەبینن"، ئەو فەرمایشتەیە: ﴿كُلَّما أَضاءَ لَهُم مَشَوا فيهِ وَإِذا أَظلَمَ عَلَيهِم قاموا﴾ [البقرة: ٢٠]

ئەم چینە داڕایە وای دەبینین نموونەگەلێکی لە واقیعی ئێمەدا هەیە،

---

(١) کورد ئەڵێ: نیسکی بێ بەر و پشتە، تەخت ئەوەیە.

(٢) (مسند أحمد: ١١١٢٩)

وێنەی ئەوانەی بە شێوازە قسەی خەڵکانی بەگومان دەدوێن لەمەڕ حوکمانێکی شەریعەتی ئیسلامدا، وەک فرەژنی و حەددەکان و جیهاد. بەڵام هەر جار دوژمنانی ئیسلام ستەمێکی تازە لە ئوممەت بکەن، دیسان هەستی بەئامانجگیراوییان بۆ دروست دەبێت و باشتر حەق و باتڵیان بۆ لێک جیا دەبێتەوە، باوەڕیان زیاد دەکات و غیرەیەک لەسەر ئایین دەیانگرێت. بەڵام هێندەشی پێ ناچێت دەچنەوە سەر هەمان تاس و حەمام، گومان و گومانبازی.

### وریابە! دەقە قورئانییەکە لەگەڵ تۆیەتی!

لێرەدا سەرنجێک هەیە، ئەوەی کە مەرج نییە ئەو دەقەی سەبارەت بە دووڕووانە، بە تەواوی وردەکارییەکانییەوە بەسەر یەکێکماندا جێبەجێ بێت ئەوجا هەست بکات لەگەڵ ئەویەتی. دوابەدوای ئەمەش دیسان وەختی یەکێک ئایەتەکان دەخوێنێتەوە کە وەسفی مونافیقان دەکەن و سەرەتا هەست دەکات سیفەتەکانی تێدایە، لە پاشان سیفەتێکی دیکە لە ئایەتەکاندا دێت تێیدا نییە، نابێت ئەوە دڵنیای بکاتەوە لەوەی ئایەتەکان ڕوویان لەو نییە. بەڵکوو هەڕەشە و هاتنەجێی وەسفی دووڕوویی بۆی، بە ئەندازەی جێبەجێبوونی ئایەتەکان بەسەریدا، هەروەها لە لاکەی دیکەشەوە ئیمان بە ئەندازەی دووربوونی حاڵەتەکەی لەوەوە.

ئەم تێگەیشتنە لە مامەڵەکردنی هاوەڵاندا دەبینیتەوە، مامەڵەیان لەگەڵ ئەو ئایەتانەدا کە وەسفی بێباوەڕان دەکات. لە ئەسەری صەحیحدا هاتووە کە سەعد مۆڵەتی وەرگرت بچێتە لای ئیبن عامیر، کە سەرین یان دۆشەکی ئاوریشمی لەژێردا بوو، فرمانی کرد لایببەن و لابرا، ئیدی کە سەعد هاتە ژوورەوە، ئەم سەرینێکی لۆکەی لەلا بوو، ئیبن عامیریش بە سەعدی گوت: "وەختێک تۆ داوای مۆڵەتت کرد، سەرینێکی ئاوریشمم لەلا بوو، فرمانم کرد لایببەن." سەعدیش پێی فەرموو: "ئیبن عامیر پیاوی چاکی تۆ ئەگەر لەوانە نەبوویتایە

کە خوا عز و جل لەبارەیانەوە فەرموویەتی: ﴿أَذهَبتُم طَيِّباتِكُم فى حَياتِكُمُ الدُّنيا﴾ [الأحقاف: ٢٠]، «خۆشی خۆتان لە ژیانی دونیاتاندا بەسەر برد.»، سوێند بێت بە (الله) لەسەر پشکۆ پاڵ بدەمەوە پێم خۆشترە وەک لەوەی لەسەر ئەوە پاڵ بدەمەوە."[1]

سەیرکە ئەم ئایەتە لەسەر بێباوەڕان دابەزیوە ﴿وَيَومَ يُعرَضُ الَّذينَ كَفَروا عَلَى النّارِ أَذهَبتُم طَيِّباتِكُم فى حَياتِكُمُ الدُّنيا وَاستَمتَعتُم بِها فَاليَومَ تُجزَونَ عَذابَ الهونِ بِما كُنتُم تَستَكبِرونَ فِي الأَرضِ بِغَيرِ الحَقِّ وَبِما كُنتُم تَفسُقونَ﴾ [الأحقاف: ٢٠]، «ڕۆژێک کە بێباوەڕان ئاگریان بۆ دەخرێتە ڕوو.»

بەڵام، ئەمە ڕێگری لە سەعدی هاوەڵ نەکرد کە ئیبن عامیری پێ بترسێنێت، چونکە بەشێکی ئایەتەکەی بەسەردا جێبەجێ دەبوو، لە کاتێکدا ئیبن عامیر لەوانەش نییە کە ﴿الذين كفروا﴾ «ئەوانەی کە بێباوەڕن».

بە هەمان شێوە ئەوەی کە ئەهلی سوننە ئەو فەرمایشتەی پەروەردگار لە سووڕەتی (المدثر)دا دەهێننەوە بۆ ترساندنی نوێژنەکەرێک کە خۆی بە موسڵمان دەزانێت: ﴿مَا سَلَكَكُمْ فِي سَقَرَ ۝٤٢ قَالُوا لَمْ نَكُ مِنَ الْمُصَلِّينَ ۝٤٣﴾، «چی خستنیە سەقەرەوە (٤٢) گوتیان لە نوێژخوێنان نەبووین»، لە کاتێکدا باقی سیفەتەکانی دیکەی ناو ئایەتەکان بەسەر زۆرێک لە نوێژنەکەراندا جێبەجێ نابێت: ﴿وَكُنَّا نُكَذِّبُ بِيَوْمِ الدِّينِ ۝٤٦﴾، «هەروا ڕۆژی دوایی و هەژمارمان بەدرۆ دەخستەوە»، بەڵام چونکە سەرکۆنەکردنەکە سەرجەم ئەو کارانە دەگرێتەوە، نەک تەنیا وەختێک پەڕ تا پەڕ کۆ دەبنەوە.

لێرەشدا فەرمایشتێکی ئیبن عاشوور دەهێنینەوە لە تەفسیرەکەیدا سەبارەت بە هەمان واتا، کە مرۆڤ بەشی لەو دەقە قورئانییە، بەپێی جێبەجێبوونی

---

(١) (مصنف ابن أبي شيبة: ٢٤١٣٨)

بەسەریدا، بەردەکەوێت، با دەقەکەش لە بنەڕەتیدا بۆ کافران بێت. دەربڕینەکەی هەندێک سەختی تێدایە، خوێنەری ئەگەر لە بەشی پێشتردا ڕێساکەی بۆ ڕوون بووەتەوە، زیانی نابێت چاوێکیش لەم بکات:

لەوێدا کە ڕاڤەی ئەو فەرمایشتەی پەروەردگار دەکات:

﴿لا تَجِدُ قَومًا يُؤمِنونَ بِاللَّهِ وَاليَومِ الآخِرِ يُوادّونَ مَن حادَّ اللَّهَ وَرَسولَهُ وَلَو كانوا آباءَهُم أَو أَبناءَهُم أَو إِخوانَهُم أَو عَشيرَتَهُم﴾ [المجادلة: ٢٢]، «خەڵکێک نابینیتەوە بڕوایان بە خوا و بە ڕۆژی دوایی هەبێت و دۆستایەتیی یەکێک بکەن دوژمنایەتیی خوا و پێغەمبەرەکەی دەکات، با باوکیشیان بێت، یان کوڕیان، یان برایان، یان هۆزیان.»

ئیبن عاشوور ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: "زانایان لەم ئەوەیان وەرگرتووە کە ئیماندارانی تەواو، دۆستایەتیی کەسانێکیش ناکەن کە واتایەکی دژایەتیی خوا و پێغەمبەریان (ﷺ) تێدایە، وەک شکاندنی بەئەنقەستی پەرژێنی شەریعەتەکەی و بەسووکگرتنی حەرەم و شکۆکانی ئیسلام، ئەوانەش وێنەی ستەمکاران و دەستدرێژکاران لە کار و کردەوەدا، لە هەر ڕەفتارێک کە گوێپێنەدانی خاوەنەکەی و ڕێزنەگرتنی دەنوێنێت بەرانبەر بە ئایین، وەک ئەوانەی تاوانە گەورەکان و خراپە قێزەونەکان بەئاشکرا دەکەن، هەروەها ئەوانەی قەشمەری بە تەمێکاری و ئامۆژگارییەکان دەکەن، هەروەها وێنەی لادەران و گومڕایان لە بیروباوەڕدا لەوانەی کە حاڵیان ئەوەی لێ دەخوێندرێتەوە بایەخ بە بەڵگەکانی بیروباوەڕی ڕاست و حەق نادەن و ئارەزووی نەفسی و دەمارگیری دەخەنە پێش بەڵگەکانی بیروباوەڕی ڕاستی ئیسلامییەوە. لە ئەورییەوە گێڕدراوەتەوە فەرموویەتی: بە ڕەوایان دەبینی ئەم ئایەتە بهێننەوە لەسەر ئەوانەی هاودەمییەتیی کاربەدەستانی ستەمکار دەکەن. لە مالیکیشەوە: هاونشینیی قەدەرییەکان مەکە و لەپێناو خوادا دوژمنایەتییان

بکە چونکە فەرموویەتی ﴿لا تَجِدُ قَومًا يُؤمِنونَ بِاللَّهِ وَاليَومِ الآخِرِ يُوادّونَ مَن حادَّ اللَّهَ وَرَسولَهُ﴾.

فەقیهانی ئێمەش فەرموویانە: دروستە یان واجبە؛ هەجری خاوەن بیدعەی گومڕا و کەسانی گەوزاو لە تاوانە گەورەکان بکرێت، ئەگەر ئامۆژگارییان وەرنەدەگرت. ئەمەش هەمووی سەرچاوەی لەوەوە گرتووە، هەندێک لە ئەحکامی ئەو واتایەی کە حوکمێکی شەرعی یان هەڕەشەیەکی لەسەرە، بۆ واتایەکی دیکە بهێنرێتەوە و بگوێزرێتەوە، کە وەسفێکی لە جۆری هەمان واتای یەکەم تێدایە کە ئەو حوکمانەی بۆ جێگیر بووە. ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ شێوەگەلێک لە لێکچوون لەناو ڕێڕەوەکانی عیللەت-هۆکار بۆ قیاس. چونکە شتەکان لە لێکچووندا جیاوازییان دەبێت."[1]

مەبەستی ئیبن عاشوور لە بڕگەی کۆتاییدا، ئەوەیە کە ئەو نموونانەی باسکران بۆ بەڵگەهێنانەوە بە دەقگەلێک کە لەسەر وێنەیەکی دیاریکراو دابەزیون، بەڵگەیان پێ بهێنرێتەوە بۆ وێنەگەلێکی دیکە کە لێکچوونێکیان بە وێنە بنچینەییەکە تێدایە، با سەرجەم سیفەتەکانی ئەویشیان تیا نەبێت. لەناو ئەم بەڵگەهێنانەوەدا هەڕەشەش بە سزاکان.

## ٢) دەشێت مرۆڤ لەنێوان باوەڕ و دووڕوویيدا بێت و بچێت

وەک چۆن باوەڕ زیاد و کەم دەکات -کە بیروباوەڕی ئەهلی سوننەت و جەماعەتە- دووڕوویيش بە هەمان شێوە زیاد و کەم دەکات.

أ) پەروەردگار لەو فەرمایشتەیدا ئاوا پەسنی لە دووڕووان کردووە:

﴿مُذَبذَبينَ بَينَ ذلِكَ لا إِلى هؤُلاءِ﴾ [النساء: ١٤٣]، «دردۆنگ و ڕاڕان لەو

---

(١) بە هەندێک دەستکاریی ورد و بچووکەوە لە پێناو ئاسانترکردنی گەیشتن لە دەقەکە. [وەرگێڕ]

نێوانەدا نە بۆ لای ئەوانە نە بۆ لای ئەمانە.»

ئیبن کەثیر لە ڕاڤەیدا فەرموویەتی: "هەیانە لە گوماندایە، تاوێک مەیلی لای ئەوانەی هەیە و تاوێک مەیلی لای ئەمانە."

ب) جوبەیری کوڕی نوفەیر لە ئەبوو دەردایەوە بیستووە -کە لە کۆتاییی نوێژەکەیدا و دوای لێبوونەوەی لە تەحیات- پەنای بە خوا دەگرت لە دووڕوویی، توند و زۆر پەنای دەگرت. جوبەیریش گوتی: "چیتە ئەبوو دەردا تۆ لە کوێ و نیفاق لە کوێ؟" فەرمووی: "لەکۆڵمان بەوە، لەکۆڵمان بەوە! سوێند بە خوا مرۆڤ لە یەک دەمێکدا لە ئایین هەڵدەگەڕێتەوە و لەبەری دادەڕنرێت." ئەمەش لە زۆر خەمخۆری و پێداگرییەوە بۆ ئایین و دوارۆژی خۆی و ترسانی لە فیتنە.

### ٣) دەشێت مرۆڤ بکەوێتە دووڕووییەوە و بەخۆشی نەزانێت

بوخاری لە صەحیحەکەیدا بابێکی کردووەتەوە بە ناوونیشانی: «ترسانی باوەڕدار لەوەی کردەوەی هەڵوەشێتەوە و پێشی نەزانێت» لەوێدا ئەسەرێکی ئیبن ئەبی مولەیکەی هێناوە سەبارەت بە ترسانی هاوەڵان لە دووڕوویی، وەک لە دواییدا دێت.

ئیبن قەییم دەفەرموێت: "دووڕووییش ئەو دەردە کوشندە ناوەکییەی کە دەشێت مرۆڤ پڕی پێست و گیانی بێت لێی و پێشی نەزانێت."

### ٤) دەشێت دووڕوو وا بزانێت خەریکە کارێکی باش دەکات

وەک چۆن دەمنەخۆش چەشتنی باش نییە، ئەوەشی کە دڵی نەخۆشە دەکرێت خراپەی بە چاکە بێتە بەرچاو:

﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ لَا تُفْسِدُوا فِي الْأَرْضِ قَالُوا إِنَّمَا نَحْنُ مُصْلِحُونَ ۝١١ أَلَا إِنَّهُمْ هُمُ الْمُفْسِدُونَ وَلَٰكِنْ لَا يَشْعُرُونَ﴾ [البقرة: ١١-١٢]، «وەختێکیش پێیان دەگوترێت

لەسەر زەویدا خراپە مەنێنەوە دەڵێن ئێمە تەنیا چاكسازین (١١) ئەرێ بەڕاستی تەنیا ئەوانن خراپەنێرەوە، بەڵام هەستی پێ ناكەن.»

د) ئەو ئایەتانەشی لە باسی ئەوەدان كە دەكرێت مرۆڤ خراپە بكات و واش بزانێت چاكەكارە؛ گەلێك زۆرن، وەك ئەوەی پەروەردگار دەفەرمووێت:

﴿وَمَن يَعشُ عَن ذِكرِ الرَّحمنِ نُقَيِّض لَهُ شَيطانًا فَهُوَ لَهُ قَرينٌ ۝ وَإِنَّهُم لَيَصُدّونَهُم عَنِ السَّبيلِ وَيَحسَبونَ أَنَّهُم مُهتَدونَ﴾[الزخرف: ٣٦-٣٧]، «هەر كەسیش لە یادی خوای میهرەبان خۆ لابدات شەیتانێكی بۆ ڕام و تایبەت دەكەین سا ئەو هاوەڵیەتی (٣٦) ئەوان لە ڕێگە لایاندەدەن و لە كاتێكدا واش دەزانن ڕێنوێن كراون.»

هەروەها ئەوەی دەفەرمووێت:

﴿أَفَمَن زُيِّنَ لَهُ سوءُ عَمَلِهِ فَرَآهُ حَسَنًا﴾[فاطر: ٨]، «ئەرێ ئەوەی كاری بەدی خۆی لا ڕازێنراوەتەوە ئیتر بە چاكی دەبینێت.»

لێرەشدا پرسیارێك هەیە سەری زۆرێكی پێوە قاڵ دەبێت: مادەم كەسێك هەست بە دووڕوویی خۆی ناكات و خۆی بە ڕێنوێنیكراو دەزانێت و كاری خۆی بە چاك دەزانێت، هەست ناكات خراپەكار و نازانێت كە بێفامە، ئیتر بۆچی خوا لۆمەی بكات و سزای بدات؟ تاوانی چییە؟

پشتیوان بە خوا وەڵام دەدەینەوە و دەڵێین: سەرەتای ملشكان و گومڕابوون لە شوێنكەوتنی ئارەزووەوەیە، بە جۆرێك كە مرۆڤەكە خۆی یەكلا ناكاتەوە بۆ دۆزینەوەی حەق و ناسینی. جا قایلبوونی بە ڕێبازێك، مەرجی ئەوەی لەگەڵدایە ئەو ئایین یان ڕێبازە، ئارەزووەكانی بۆ بهێنێتە دی و هەروەها ئەوەشی كە وەك بەرژەوەندییە دونیاییەكانی خۆی چاوی لەسەریەتی! واتە دەكرێت حەق لە بازنەیەكدا بێت كە ئەم كابرایە پێی وا نەبێت هاوتەریبی

ئارەزووپەتی و بەرژەوەندییەکانی دەهێنێتە دی، ئەوساش گەڕان بە شوێن حەق لەم بازنەیەدا ئەسڵەن بیریشی لێ ناکرێتەوە! بەڵکوو حەق دەبێت لەو بازنەیەدا بێت کە هاوڕێی ئارەزووپەتی. ئەوەشی ئەمە ڕەوتی بێت، بابەتەکانی پێچەوانە کردووەتەوە، کە شوێنکەوتنی بۆ بەڵگە نییە بەرەو هەر کوێی بەرێت، بەڵکوو خۆی ئەو ئەنجامە دیاری دەکات کە دەبێت پێی بگات، ئەوجا ملی بەڵگەکانی بۆ بادەدات لەپێناو یەکگرتن و تەبابوون لەگەڵ ئەم ئەنجامە دیاریکراوە لەپێشینەیە!

نموونەیەکی ئاشکرامان لەمە بینی لە میانەی قسەکردنمان سەبارەت بە خورافەی پەرەسەندنی ڕێککەوتی، کە زۆرێک لە ئەکادیمی و توێژەرانی ڕۆژئاوایی شوێنی کەوتوون، لە ئەڵقەی «کێ پاڵپشتیی مانەوەی بیردۆزی پەرەسەندن دەکات؟» بێنە پێشچاوی خۆت پرۆفیسۆرێک لە زانستی زیندەزانی پەرەسەندنیدا، کە ئەو نامە دکتۆرایەی نازناوی "Ph.D"ی پێ پەیدا کردووە لەسەر ئەمە بووە: "چۆن هەستی بۆنکردنی مرۆڤ پەرەی سەندووە؟" لەپاشان دەیان توێژینەوەی لە وردەکاریی پەرەسەندنی توانا و هەستەوەرەکانی مرۆڤدا لە ڕێگەی بازدانەی تێکەڵ هەڵبژاردنی نابینای سروشتی بڵاو کردووەتەوە، بەرانبەر بەوەش چەندان بەخششی هەزاران، یان ملیۆنان دۆلاری پێ دراوە، چوار بۆ پێنج دکتۆری کوڕ و کچ لەژێر سەرپەرشتیاریی ئەودا کار دەکەن کە لە ئاستی "post-doc"دان، بەناو وڵاتانی جیهاندا گەشت دەکات بۆ نمایشکردنی بەرەنجامی توێژینەوەکانی لە کۆنگرەکاندا، لە زانکۆدا وانە دەڵێتەوە و مووچەیەکی بەرز وەردەگرێت و لە ڤێلایەکی خەیاڵیدا نیشتەجێیە کە تا ئێستەش لە دانەوەی قیستەکانی نەبووەتەوە، لە ئۆتۆمبێلە ڕاقییەکەیدا پیاسە دەکات و لەگەڵ هاوسەر یان هاوڕێژنەکەی دەژی و پێوەندیگەلی ناشەرعی دەبەستێت و ژیانێکی تا قوڕقوڕاگە گەوزاو لە حەرام دەژی.

بهێنە پێش چاوی خۆت ئەگەر پێی بڵێیت: "تەواوی ئەم ژیانەی ئێستەی تۆ

لەسەر بنەمای خورافەیەکە کە پەیوەندی بە زانستی حەقیقییەوە نییە! تەواوی بڕوانامەکانت، توێژینەوەکانت، پلە زانستییەکانت، ڕووالەتی ڕازاوەی ژینت، گەشتەکانت، پێگەکەت ... تەواوی لەسەر وەهمێک وەستاوە کە پێشینانت بە وەسێت بۆ یەکیان گواستووەتەوە تا ئاوا زل و فش بووەتەوە، درۆیەکی گەورەیە دڵتانی داگیر کردووە."

پەرچەکرداری چی دەبێت؟! -بە ئەگەری زۆرەوە- ئەسڵەن خستنە بەر باسی ئەو نیقاشە قبووڵ ناکات، ئەسڵەن بیرلێکردنەوەشی قبووڵ ناکات. بەڵکوو یەک "block"ی زرت و ساف دەخاتە سەر دەلاقەی ئەگەری ڕاستبوونی ئەو قسەیەی تۆ! باسەکە ناخرێتە سەر مێز بۆ پشکنین. چونکە ڕاستگەرانی قسەکەی تۆ -لای ئەو- واتە هەرەسهێنانی ژیانی و لەدەستدانی تەواوی ئیمتیاز و پێگە و ئارەزووەکانی. ڕادەستبوون بە ڕاستگەڕانی قسەی تۆ -لە دیدی ئەودا- واتە لە "کۆمەڵگەی زانستی" وەدەر بنرێت و ڕاوی بنێن.. دیمەنی خۆی دێتە پێشچاو بە لانەوازی "Homeless" لە خەڵک بپاڕێتەوە بۆ تۆزێک پارە قووتوویەک بیرەی پێ بکڕێت!

هەربۆیە، قسەکەی تۆ دەبێت ڕاست نەبێت، ڕاستی دەبێت جگە لەوە بێت تۆ دەیڵێیت! چونکە شوێنهاتەکانی ئەم ڕاستییە بەرگەگرتنی بۆ ئەو ئەستەمە. بەتایبەتتریش کە نازانێت پشتبەستن بە خوا واتە چی و ئەهلی ئامادەگیی قوربانیدان نییە لەپێناو خوا و ڕۆژی دواییدا.

لەوانەیە یەکێک لەوانە ببینیت کە زۆر لە گفتوگۆدا بەئەدەبە، ڕای بەرانبەر وەردەگرێت، دان بە هەندێک هەڵەیدا دەنێت ئەگەر بۆی ڕوون ببێتەوە، بە جۆرێک کە ئیتر وا بزانیت بەگشتی بە شوێن حەقەوەیە و لە هەر جێگەیەکدا ئەم سیفەتەی تێدایە، لات سەیر بێت ئەگەر تووشی سزای دواڕۆژ بێت وەختێک لەسەر ئەو ڕێگەیە دەمرێت. ئەوەت لێ بزر بووە کە ئەم سیفەتانەی کاتێک

تێدایە و پەیڕەوی لێ دەکات کە هەڕەشەی ڕووخاندنی تەواو نەبن بۆ سەر سیستەمی ژیان، یان بەرژەوەندییە کەسییەکانی پاش ئەوەی ئالوودەیان بووە و ناتوانێت دەستیان لێ هەڵبگرێت.

وێنەی ئەم کەسە بووەتە بەندەی ئارەزووی و حەقی ناوێت مادەم لە دەرەوەی ئەو بازنەیەدا بێت کە لەگەڵ ئارەزوویدا گونجاوە.

دەشبینیت نموونەی ئەوانە وەختێک مستی ئارەزوو هێندێک لەسەریان سووک دەبێت و دەکەونە بیرکردنەوە، درەوشانەوەی حەقیان لێوە دیار دەبێت و ڕێگەی فیترەت و خواڕسک دەبینن کە بانگبێژێکی حەق بانگی بۆ دەدات. بەڵام هێندە نابات گوێیان کەڕ دەکەن و چاویان کوێر دەکەن و دڵیان دەپێچن و لەم بانگەی دادەپۆشن، سا بە چەشنی کردەوەی خۆیان پاداشتیان دەدرێتەوە:

﴿أَفَرَأَيتَ مَنِ اتَّخَذَ إِلهَهُ هَواهُ وَأَضَلَّهُ اللَّهُ عَلى عِلمٍ وَخَتَمَ عَلى سَمعِهِ وَقَلبِهِ وَجَعَلَ عَلى بَصَرِهِ غِشاوَةً فَمَن يَهديهِ مِن بَعدِ اللَّهِ أَفَلا تَذَكَّرونَ﴾ [الجاثية: ٢٣]، «ئەرێ ئەوەت دیوە کە بە خوای خۆی کردووە ئارەزووی خۆی و خواش بە زانستەوە گومڕای کردووە و مۆری ناوە لە بیستن و دڵی و پەردەی گێڕاوە بەسەر بینایدا سا لەدوای خوا ئیدی کێ ڕێنوێنیی بکات ئەرێ بیر ناکەنەوە؟!» ئەم مۆرنانە لە بیستن و دڵ و پەردەگێڕانە بەسەر بیناییدا ئەنجامی پشتکردنیەتی لە حەق، ستەمێک نییە لەلایەن خواوە سبحانە وتعالى، بەڵام ئەم مرۆڤە ئارەزووی خۆی پەرستووە و خستوویەتیە پێش ناسینی حەقەوە.

هەتا مرۆڤ زیاتر خۆی کوێر بکات، خواش زیاتر کوێری دەکات و زیاتر دەستی لە بەندایەتی دەبێتەوە و هەڵپەی ئارەزوو دەکات: ﴿وَنُقَلِّبُ أَفئِدَتَهُم وَأَبصارَهُم كَما لَم يُؤمِنوا بِهِ أَوَّلَ مَرَّةٍ وَنَذَرُهُم فى طُغيانِهِم يَعمَهونَ﴾ [الأنعام: ١١٠]، «دڵ و بیناییيان هەڵدەگێڕینەوە وەک چۆن یەکەم جار باوەڕیان پێی نەهێنا و وازیان لێ دەهێنین لە سنوورشکێنی خۆیاندا پتر کوێراییيان دابێت.»

هەر کەسیش دڵی نەخۆش کەوتبێت بە شوێنکەوتنی ئارەزوو و لێی دەرباز نەبووبێت و هەوڵی چارەکردنیشی نەدات، بەڵکوو درۆش بکات بۆ ئەوەی بیشارێتەوە و زیاتر شان بەو کارانەدا بکات کە هێندەی دی زاڵی دەکات بەسەریدا، پاداشتی ئەوە دەبێت پەروەردگار زیاتر نەخۆشی بخات: ﴿فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ فَزَادَهُمُ اللَّهُ مَرَضًا وَلَهُم عَذَابٌ أَلِيمٌ بِمَا كَانُوا يَكْذِبُونَ﴾ [البقرة: ١٠]، «دڵیان نەخۆشی تێدایە سا خواش زیاتر نەخۆشی خستن و سزایەکی بەئێشیشیان هەیە بەرانبەر بەوەی درۆیان دەکرد.»

سا با مرۆڤ لەوە بترسێت خۆی لە ڕاستییەک گێل بکات کە شیرینایییەکەی چەشتبێت، وەگەرنا دوابەدوای ئەوە ئەرکەکە سەختتر دەبێت!

سا دەستپێکی کارەساتەکە، شوێنکەوتنی ئارەزووە:

﴿أَفَمَن كَانَ عَلَى بَيِّنَةٍ مِن رَبِّهِ كَمَن زُيِّنَ لَهُ سُوءُ عَمَلِهِ وَاتَّبَعُوا أَهْوَاءَهُم﴾ [محمد: ١٤]، «ئەریٚ ئەوەی لەسەر [بەڵگە و سەلمێنەر و ڕێگەیەکی] ڕوون بێت لەلایەن پەروەردگارییەوە وەک ئەوانی دی وایە کە کاری خراپی خۆی لەلا ڕازێنراوەتەوە و شوێن ئارەزووی خۆیان کەوتبن.»

تێبینی بدە چۆن شوێنکەوتنی ئارەزوو بەستراوەتەوە بە ڕازاندنەوەی کاری خراپ، ئەمەیە کە ڕوو دەدات لە بێباوەڕ و دووڕوو و هەروەها موسڵمانانی گومڕاشدا. یەکێکیان کاری خراپی خۆی باش دەبینێت و وا دەزانێت ڕێنوێنیکراوە و هەستیش ناکات خراپەنێرەوەیە، بگرە دەیانگوت (إنما نحن مصلحون - ئێمە تەنیا چاکسازین)، نازانێت کە معەقڵە، خۆی دانا و کامڵ و چاوڕۆشن دەبینێت. لەوانەشە هەر بە ڕاست بیەوێت ئەم واتایانە لە خۆیدا بهێنێتە دی: کارباشی، ڕێنوێنی، چاکسازی و بەرچاوڕۆشنی، بەڵام بەو واتایەی کە خۆی بۆ ئەو شتانەی دادەنێت و دەوێت، بەو مەرجەشی کە لەو بازنەیەدا بێت گونجاوی ئارەزووی خۆی بێت و بەرژەوەندییەکانی بهێنێتە دی!

هەوڵدان بۆ بەدیهێنانی لە دەرەوەی ئەم بازنەیەدا ئەسڵەن بەرباس نییە!

زۆرێک لە خەڵکیش هەمان ئەم حاڵەیان هەیە و دەچنەوە سەر ئەم خاڵە، وەک پێگەدارانی ئایینی و هەروەها شوێنکەوتووانی زۆرێک لە حیزبەکان. لەژێر ڕۆشنایی ئەوەدا دەتوانیت لەو پەرچەکردارە توندانەی پێگەدارانی مەککە بگەیت وەختێک پێغەمبەر (ﷺ) شتێکی هێنا هەڕەشە لەو سیستەمە شیرکییە بکات کە قازانجی ئەوانی لەسەرە.

هەر لە ڕۆشناییی ئەمەدا تێ دەگەیت بۆچی زۆرێک لە زانایان لە مشتومڕ و بەربەرەکانێکاندا گومڕا دەبن، کە تەنیا خەمی سەرخستنی سەلماندنی ڕاستییەتیی قسەی خۆیانیان هەیە، چونکە وای دەبینێت ڕاستییەتیی قسەی ڕکابەرەکەی -لە دیدی ئەمدا- دەبێتە هۆی شکاندنی شکۆی و نەمانی سەرداری و چۆڵبوونی دەوری لە شوێنکەوتووان و لەدەستدانی تایبەتمەندییەکانی و بەرزبوونەوەی ڕکابەرەکەی بەسەر شانی ئەمدا. حەق دەبێت لەو قسەیەدا نەبێت کە دژەکەت دەیڵێت! جا دەیبینیت تەئویل دەهێنێتەوە و دەست بە تێگەیشتنەکەی خۆیەوە دەگرێت کە بۆ دەقێکی شەرعی هەیەتی و پشت لە دەق و بەڵگەکانی دیکە دەکات، لە هەموو ئەوەشدا خۆی وا قایل دەکات چاکساز و چاکەکار و ڕێنوێنیکراوە، چونکە بەرژەوەندیی بانگەواز و ئایین -بە بڕوای ئەم- لەوەدایە کە شکۆی ئەم بمێنێتەوە و خەڵک ببینن چۆن بەسەر ڕکابەرەکەیدا سەردەکەوێت لە هەموو دیو و ناکۆکییەکاندا، ڕووشانی هەر بەشێک لەوە، یەکسانە بە ڕووشانی بەرژەوەندیی بانگەواز و ئایین، گوایە!

وەختێک لەمە تێ گەیشتیت، دەزانیت کە بۆچی ئیسلام فرمان بە شوێنکەوتووانی دەکات سەرپێچیی ئارەزوو بکەن و لەگەڵ نەفسییاندا تێ بکۆشن، بۆچی فرمانی کەم دەستبردن بۆ دونیا و بێنیازبوون لێی دەکات، وریایی دەدات لە گەوزان تێیدا و ڕۆچوون لە ئارەزووەکانیدا، چونکە ئەوانە ڕێگەی

کوێرایی داهاتن لە ئاست هیدایەت و بوون بە بەندەی هەوەس و ئیتر یەکلابوونەوە بۆ حەق گەلێک ئەستەم دەبێت، کینە و دووبەرەکی دەکەوێتەوە لەناو خەڵکدا و زۆر دەبێت. ئیدی دەزانیت بۆچی هەر یەکێک لە پێغەمبەران بە ئوممەتەکەی دەگوت: ﴿وَما أَسأَلُكُم عَلَيهِ مِن أَجرٍ إِن أَجرِيَ إِلّا عَلى رَبِّ العالَمينَ﴾ [الشعراء: ١٠٩]، «لەسەر ئەمە داوای کرێیەکتان لێ ناکەم، کرێ و پاداشتی من تەنیا لەسەر پەروەردگاری جیهانییانە. سا دوای ئەمە ئیدی سەیرت لەم ناونیشانە نەیەت "دەشێت دووڕوو وا بزانێت خەریکە کاری باش دەکات."»

سەیرت نەیەت لەو فەرمایشتەی پەروەردگار سەبارەت بە دووڕووان:

﴿وَإِذا قيلَ لَهُم لا تُفسِدوا فِي الأَرضِ قالوا إِنَّما نَحنُ مُصلِحونَ ۝ أَلا إِنَّهُم هُمُ المُفسِدونَ وَلٰكِن لا يَشعُرونَ﴾ [البقرة: ١١ – ١٢]، «وەختێکیش پێیان دەگوترێت لەسەر زەویدا خراپە مەنێنەوە، دەڵێن ئێمە تەنیا چاکسازین (١١) ئەرێ بەڕاستی تەنیا ئەوانن خراپەنێرەوە، بەڵام هەستی پێ ناکەن.»

هەروەها ئەو فەرمایشتەی دیکە:

﴿وَإِذا قيلَ لَهُم آمِنوا كَما آمَنَ النّاسُ قالوا أَنُؤمِنُ كَما آمَنَ السُّفَهاءُ أَلا إِنَّهُم هُمُ السُّفَهاءُ وَلٰكِن لا يَعلَمونَ﴾ [البقرة: ١٣] «وەختێک پێیان بگوترێت باوەڕ بهێنن چۆن ئەو خەڵکە باوەڕیان هێناوە، دەڵێن ئەرێ ئێمە باوەڕ بهێنین چۆن ئەو کەمعەقڵانە باوەڕیان هێناوە، ئەرێ کەمعەقڵ هەر خۆیانن بەڵام پێی نازانن.»ئەوەی دیکەش:

﴿وَمَن يَعشُ عَن ذِكرِ الرَّحمٰنِ نُقَيِّض لَهُ شَيطانًا فَهُوَ لَهُ قَرينٌ ۝ وَإِنَّهُم لَيَصُدّونَهُم عَنِ السَّبيلِ وَيَحسَبونَ أَنَّهُم مُهتَدونَ﴾ [الزخرف: ٣٦ – ٣٧]، «هەر کەسیش لە یادی خوای میهرەبان خۆ لابدات شەیتانێکی بۆ ڕام و تایبەت دەکەین سا ئەو هاوەڵیەتی (٣٦) ئەوان لە ڕێگە لایاندەدەن و لە کاتێکدا واش دەزانن ڕێنوێن کراون.»

هەروەها ئەوەشی کە دەفەرمووێت:

﴿أَفَمَن زُيِّنَ لَهُ سوءُ عَمَلِهِ فَرَآهُ حَسَنًا﴾ [فاطر:٨]، «ئەرێ ئەوەی کاری بەدی خۆی لا ڕازێنراوەتەوە ئیتر بە چاکی دەبینێت.»

لەپاڵ ئەمەشدا هۆکاری دیکەش هەن وا دەکەن مرۆڤ خراپ بکات و وای دانێت چاک دەکات، وەک ئەوەی پشت لەوە بکات ئەسڵەن هەوڵێکی بۆ ناسینی حەق هەبێت.

بە هەر حاڵیش: ﴿إِنَّ اللَّهَ لا يَظلِمُ النّاسَ شَيئًا وَلٰكِنَّ النّاسَ أَنفُسَهُم يَظلِمونَ﴾ [يونس: ٤٤]، «بەڕاستی کە (الله) هیچ ستەمێک لە خەڵک ناکات، بەڵام خەڵک خۆیانن ستەم لە خۆیان دەکەن.»

### ٥) هاوەڵان ترسی دووڕوویییان لە خۆیان هەبووە

جا ئەگەر ئەمە حاڵی هاوەڵان بووبێت ئێمە لە کوێ بین؟!

أ) بوخاری لە بابی (الإيمان)دا لە ئیبن ئەبی مولەیکەی گێڕاوەتەوە، کە لە شوێنکەوتووانە، فەرموویەتی: "بە سی کەس لە هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) گەیشتووم، سەرجەمیان ترسی دووڕوویییان لە خۆیان هەبووە".

ب) حوذەیفەی کوڕی یەمان خوا لێی ڕازی بێت دەفەرمووێت: "عومەر بانگ کرا بۆ جەنازەیەک، جا چوویە ناوییەوە، یان لە ڕێگەدا بوو بۆی بچێت، خۆم پێوە هەڵپەسارد و گوتم دانیشە میری باوەڕداران ، ئەو لەو کۆمەڵەیە. فەرمووی سوێندت دەدەم بە (الله)، من لەوانم؟ حوذەیفەش گوتی نەخێر، پاش تۆش ئیدی ئەستۆپاکی کەسی تر ناکەم".

جا حوذەیفە خوا لێی ڕازی بێت ئەمینداری نهێنیی پێغەمبەر (ﷺ) بوو، پێغەمبەرمان ناوی دووڕووەکانی پێ دابوو. کاتێک بینی عومەر خوا لێی ڕازی

بێت لە ڕێگەی لە جەنازەی پیاوێکدایە کە بە ڕوواڵەت موسڵمان بووە، گرتی و هەواڵی پێ دا کە ئەوە لە خۆیانە. چۆن بڵێیت ئەم هەڵوەستەیە عومەری داچڵەکاند و ترسی خودی خۆی کەوتە دڵ، حوذەیفەی سوێند دا: "سوێندت دەدەم بە (الله)، من لەوانم؟" دەکرێت هەندێک لێیان ئاڵۆز بێت و بڵێن: "چۆن عومەر ئەم پرسیارە دەکات لە کاتێکدا ئەو لە دە مژدەپێدراوەکەیە بە بەهەشت؟" بەڵام خۆ دەشێت مرۆڤ هەندێک جار خەیاڵی لای هەندێک حەقیقەت نەمێنێت، دوور نییە عومەر ئەو ساتە ئەم مژدە نەیەوییەی لە زەیندا نەمابێت، کە ئەو وەخت گەلێکی بەسەردا تێپەڕیبوو، هاوکاتی ئەو ترسەی مردن لەسەر نیفاق کە لە دەروونی زیندوو و پاکی فاڕووقدا هەژا خوا لێی ڕازی بێت.

وەڵامی حوذەیفەش ئەمە بوو: "نەخێر، کەسیش لە دوای تۆ بێبەری ناکەم." واتە ئەم دەرگەیە لە خۆم ناکەمەوە - دەرگەی بێبەریکردنی خەڵک لە دووڕوویی، چونکە وا بۆیان باشترە لەسەر ترسان و وریابوون لە نیفاق، بمێنن.

ئاسایی لە کاتی بیستنی ئەم ئەسەرانەدا تەنیا بە سەرسوڕمانەوە لەلای ئەم ترسانەی هاوەڵان دەوەستین و کە ئەم مەراقەیان لە نیفاق زیاد لە پێویست بووە! بەڵام نا، دەبێت جگە لەمەی لێ هەڵێنجین؛ هاوەڵان فەقیهترینی ئوممەتن، بێگومان ئەوان قەبارەی گونجاو بە هەر شتێک دەدەن و ترسانی شایەنی بۆ دادەنێن.

ئەم ترسە مانای شاراوەیی دووڕوویی دەگەیەنێت، شاراوە هەتا ئەو ئاستەی کە بشێت لە دەرووندا بوونی هەبێت و خاوەنەکەشی هەستی پێ نەکات. کەواتە شایەنی ئەم دڵەڕاوکەیەیە، ئەوە بۆ ئێمە هەر زۆر شایەنتر. جا هەتا باوەڕی مرۆڤ زیاتر بێت و تێگەیشتنی بۆ سروشتی دووڕوویی هەبێت، پتر لێی دەترسێت.

بە هەمان شێوە شوێنکەوتوانیش خوا لێیان ڕازی بێت ترسی دووڕووییان لە خۆیان هەبوو:

ج) لە حەسەنی بەصرییەوە گێڕدراوەتەوە: "سوێند بێت بە (الله) باوەڕدار و لەخواترسێک نەبووە لە نیفاق نەترسابێت، جگە لە مونافیق خۆی، کەس لە نیفاق ئەرخەیان نییە."

د)ئیبن سیرین -لە پێشەوایانی تابیعینە ڕەحمەتی خوایان لێ بێت- فەرموویەتی: "هیچ ئایەتێک لە قورئاندا هێندەی ئەم ئایەتە نامترسێنێت: ﴿وَمِنَ النّاسِ مَن يَقولُ آمَنّا بِاللَّهِ وَبِاليَومِ الآخِرِ وَما هُم بِمُؤمِنينَ﴾[البقرة: ٨]، «هەیە لە خەڵک کە دەڵێت باوەڕمان بە خوا و ڕۆژی دوایی هەیە بەڵام لە ڕاستیدا باوەڕدار نین.»"

هـ) ئەییوبی سەختیانی فەرموویەتی: "هەر ئایەتێک لە قورئاندا باسی دووڕوویی تێدا بێت، ترسیم لە خودی خۆمدا هەبووە".

و) موعاوییەی کوڕی قوڕڕە فەرموویەتی: "عومەر لێی دەترسا و -واتە لە نیفاق دەترسا- ئەمن لێی بێخەم بم؟!"

سا ئەمانە پێنج حەقیقەتی گرنگن سەبارەت بە سروشتی دووڕوویی. ئیتر کە زانیوتە، وەرە با چاوێک بە گرنگترین سیفەتەکانی دووڕوواندا بگێڕین وەک ئەوەی لە قورئان و سوننەتدا هاتووە بۆ ئەوەی لێی وریاتر بین، سیفەتەکانی دووڕووان:

* گومانکردن لە ئایین

* پشتکردن لە داوەریبردنە لای خوای باڵادەست و سوننەتی پێغەمبەرەکەی (ﷺ)

* ڕقبوون لەوەی کە خوا دایبەزاندووە

* بەدۆستگرتن و پشتیوانیکردن لە موشریکان

* گۆڕانی دۆستایەتی و پشتیوانی بەپێی تەرازووی هێزەکان

* درۆکردن

* ڕقبوونەوە لە قوربانیدان لە ڕێگەی پەروەردگاردا

* سەختبوونی پەرستشەکان لەسەریان

* خۆشویستن و حەزکردن بەوەی پیایاندا هەڵبدرێت و ستایش بکرێن لەسەر شتانێک کە ئەسڵەن نەیانکردووە

* ساردکردنەوەی خەڵک لە گوێڕایەڵییە ئایینییەکان و گاڵتەکردن بە کارچاکان

* گومانکردن لەو بەڵێنی سەرخستن و داچەسپاندنەی ئیسلام کە خوا داویەتی

* خۆشویستن و هەڵپە بۆ دونیا و قەڵسبوون و نارازیبوون لە وەختی نارەحەتییەکاندا

* ترسنۆکی و قبوولکردنی ژیانی سەرکزی و نشوستی

* ڕووپامایی و کاسەلێسی بۆ دەسەڵاتداران و داشکاندنی ئایین بۆیان

* کەمئەدەبی بەرانبەر بە خوا و پێغەمبەرەکەی (ﷺ)

* هەبوونی کینە لە باوەڕداران و شکاندنی کەسایەتی و شکۆیان لەناو خەڵکدا

* لەدووی فیتنە گەڕان

* دڵڕەقی لە ئاست قورئان

* بەکەمگرتنی تاوان و بەزۆرگرتنی چاکە

* پشتکردن لە تەوبە

* خۆدانە بەر فیتنە

* ناخۆشکردن لە وەختی دوژمنکاریدا

* شکاندنی پەیمانی خوا

* مۆرکێکی ناسراوە لە قسەدا و گاڵتەکردن بە ئایین

* بێئاگایی لە خوێندنەوەی حیکمەتەکانی پەروەردگار لە قەدەرەکانیدا

* لەبیرکردنی (الله)

# ١- گومانکردن لە ئایین

دووڕوو دەکرێت گومان لە بوونی خوا بکات، یان لە پێغەمبەرایەتیی موحەممەد (ﷺ) یاخود گونجان و بەکەڵکبوونی ئیسلام بۆ ژیان. سیفەتی گومانکاری گرنگترینی ناو سیفەتەکانی دووڕووییە، هۆکاری سیفەتگەلی نیفاقیی دیکەشە وەک بەم زووانە دەبینیت.

### بەڵگە لەسەر ئەوەی کە دووڕوو گومان لە ئایین دەکات:

پەروەردگار لە پەسنی دووڕوواندا فەرموویەتی: ﴿فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ فَزَادَهُمُ اللَّهُ مَرَضًا﴾ [البقرة: ١٠]. «دڵیان نەخۆشی تێدایە، خواش زیاتر نەخۆشی خستن.»

ئیبن کەثیر لە ژمارەیەک هاوەڵی گێڕاوەتەوە کە واتای وشەی «نەخۆشی» گومانە.

پەروەردگاریش لە ئایەتی شووراکەدا کە لەنێوان دووڕووان و باوەڕداراندا لێ دەدرێت فەرموویەتی: ﴿قَالُوا بَلَىٰ وَلَٰكِنَّكُمْ فَتَنتُمْ أَنفُسَكُمْ وَتَرَبَّصْتُمْ وَارْتَبْتُمْ﴾ [الحديد: ١٤]، «گوتیان بەڵێ، بەڵام خۆتانتان تووشی فیتنە کرد و لە مەڵاسدا بوون و بەشک کەوتن.» ﴿وَارْتَبْتُمْ﴾ ئەوەتا شک و گومان.

پێغەمبەری خواش (ﷺ) لە بەیانکردنی مەترسیی ئەم گومانەدا فەرموویەتی: "سیان هەن لە حاڵیان مەپرسە: کابرایەک بەربەرەکانێی پەروەردگار بکات لە ڕیدائیدا، کە ڕیدائی ئەو خۆبەگەورەزانینییەتی و ئیزارەکەیشی

**بڵندی و عیززەتیەتی،[1] کابرایەکیش گومانی لە کاری خوا هەبێت، هەروەها بێئومێدبوونیش لە میهری خوا."[2] "لە حاڵیان مەپرسە!" واتە فەوتاون.**

**ئەم گومان و شککردنە هۆی سیفەتگەلێکی دیکەی دووڕوییە:**

**سا دووڕووان لەبەر بەگومانبوونیان:**

- **حوکم بردنە لای خوا و پێغەمبەریان ڕەتکردەوە:** ﴿وَإِذا دُعوا إِلَى اللَّهِ وَرَسولِهِ لِيَحكُمَ بَينَهُم إِذا فَريقٌ مِنهُم مُعرِضونَ﴾ **[النور: ٤٨]، «وەختێکیش بانگ بکرێن بۆ لای خوا و پێغەمبەرەکەی (دەبینیت) گرۆیەک لەوان پشت هەڵدەکەن»، هەتا ئەو جێگەیەی دەفەرمووێت:** ﴿أَفي قُلوبِهِم مَرَضٌ أَمِ ارتابوا﴾ **[النور: ٥٠]، «ئەرێ دڵیان نەخۆشی تێدایە، یان بەشک کەوتوون.» جا ئەوان ڕەتیان کردەوە داوەری بەرنە لای خوا و پێغەمبەرەکەی (ﷺ) بەهۆی بەشککەوتنیانەوە.**

- **پەکیان کەوت لە چوون بۆ جیهاد:** ﴿إِنَّما يَستَأذِنُكَ الَّذينَ لا يُؤمِنونَ بِاللَّهِ وَاليَومِ الآخِرِ وَارتابَت قُلوبُهُم فَهُم في رَيبِهِم يَتَرَدَّدونَ﴾ **[التوبه: ٤٥]، «تەنیا ئەوانە داوای مۆڵەتت لێ دەکەن (تا نەیەن بۆ جیهاد) کە بڕوایان بە خوا و بە ڕۆژی دوایی نییە و دڵیان بەشک کەوتووە و سا هەر لە گومانی خۆیاندا دەتلێنەوە.»**

- **دۆستایەتی و پشتیوانیی بێباوەڕانیان کرد:** ﴿وَلَو كانوا يُؤمِنونَ بِاللَّهِ وَالنَّبِيِّ وَما أُنزِلَ إِلَيهِ مَا اتَّخَذوهُم أَولِياءَ وَلٰكِنَّ كَثيرًا مِنهُم فاسِقونَ﴾ **[المائده: ٨١]، «خۆ ئەگەر بڕوایان بە خوا و پێغەمبەر و ئەوە هەبوایە کە دابەزێنراوەتە سەری، ئەوانیان (بێباوەڕانیان) بە دۆستی خۆیان نەدەگرت، بەڵام زۆرێکیان سنووربەزێن و لەتاعەتدەرچوون.»**

---

**(١) ڕداء بەشی سەرەوەی پۆشاکە و إزار بەشی خوارەوەیەتی، لێرەدا بۆ مەبەستێکی تایبەت و ناوازەی بەلاغی هێنراوە.**

**(٢) المعجم الكبير: ٧٨٩**

❁ تەمەڵییان لە ئاست گوێڕایەڵییەکاندا نواند: پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێت: "خۆ ئەگەر دەیانزانی چ پاداشتێکیان تێدایە، -واتە دوو نوێژی بەیانی و عیشا لە مزگەوتدا- بە گاڵکێش بووایە بۆی دەهاتن."[1] بەڵام، چونکە گومانیان لە حەقیقەتی ئەم پاداشتە هەیە سستی و تەمبەڵییان لێی کەوتووەتە کار. خراپیی کردەوەی کەسی دووڕووش، گرنگترین چاوگەکانی بە گشتی هەر گومانکردنە لە ئایین. حەسەنی بەصری لەبارەی ئەو فەرمایشتەوە: ﴿إِنِّي ظَنَنتُ أَنِّي مُلَاقٍ حِسَابِيَهْ﴾[الحاقة: ٢٠]، «من هەر وام دەزانی کە دەگەمەوە بە هەژمار و پاداشتی خۆم.» دەفەرمووێت: "باوەڕدار گومانی بە پەروەردگاری باش بووە بۆیە کاری باشیشی کردووە، دووڕووش گومانی خراپی کردووە بۆیە کاری خراپیشی وەپێش خۆ داوە".

( ظننت - وام دەزانی ) لە وتەی باوەڕداردا کە لەو ئایەتە هاتووە بە واتای یەقین و دڵنیایی دێت، وەک لە زۆر جێگەی دیکەی قورئاندا هەر بەو جۆرە هاتووە. سا ئیماندار یەقینی بە لێپرسینەوە هەبووە بۆیە کاری باشی کردووە، دووڕووش گومانی هەبووە بۆیە کاری خراپی بەکۆڵدا داوە.

### گومان وا دەکات بڕیار و لێکدانەوەکانی دووڕوو زەمینی بن:

جا گومانەکەی، پشتبەستن بە خوا لەلای کاڵ و کز دەکاتەوە، هەروەها چاوەڕێبوونی پاداشت و سزای دوارۆژی. ئیدی گزی و ستەم دەکات و پارەی حەرام دەخوات و دۆستایەتیی بەهێزەکان دەکات ئەگەر لەسەر باتڵیش بن و هەردەم ئەوە دەکات کە بەدیهێنانی ئارەزووەکانی و ئاسایشی ژیانی تێدا بێت، ئیدی حەڵاڵ، یان حەرام.

---

(١) [البخاري: ٦١٥]

یەکێک دەڵێت: "تاوانی دووڕوو چییە کەواتە؟"

خەڵک سەختییەک لەوەدا نابینن کە قایل بن بەوەی کەسی نکۆڵیکار و ڕەتکەرەوەی ئیسلام بە لووتبەرزی، شایەنی سزایە. بەڵام لای زۆرێک دەبێتە پرسیار: "وەختی مرۆڤێک دەڕوانێت لە بەڵگەکانی ئیسلام و بیریان لێ دەکاتەوە و قایل نابێت بە بوونی خوا، یان تاکوتەنیابوونی، یان پێغەمبەرایەتیی موحەممەد (ﷺ)، یاخود گومانی لە ڕاستییەتیی ئیسلام هەیە، وێڕای ئەوەش کە هەوڵی داوە یەکلا و بەویژدان بێت، ئیدی گوناهی چییە؟"

لێرەدا وەڵامێکی زۆر گرنگ هەیە، ئەویش ئەوەی کە ئەم پرسیارە هەڵەیەکی تێدایە پێچەوانەی عەقڵ و بەڵگەکان، مەبەست ئەو گریمانەیە کە مرۆڤ لە بەڵگەکانی ئیسلام بڕوانێت و پەرۆشی حەقیش بێت، بەڵام هێشتا قایل نەبێت بە ڕاستبوونی.

پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿وَلَقَد أَنزَلنا إِلَيكَ آياتٍ بَيِّناتٍ وَما يَكفُرُ بِها إِلَّا الفاسِقونَ﴾ [البقرة: ٩٩]، «بەڕاستی کە ئایەتگەلێکی ڕوونی تەواومان دابەزاندووەتە سەر تۆ، جگە لەوانەشی لە ڕێ دەرچوون، کەس پێی بێباوەڕ نابێت.»

جا کەسێک کە بێباوەڕ دەبێت بە ئایەتەکانی پەروەردگار، لەبەر کەموکوڕییەک نییە لە بەڵگەی ئەو ئایەتانەدا، بەڵکوو چونکە بێباوەڕ خووی بە فیسقەوە گرتووە، واتە دەرچوون لە ڕێگەی هیدایەت و ڕاستی، یان بەوەی کە ئەسڵەن ئاوڕی لێ ناداتەوە، یاخود چونکە بە ڕووانینێکی شایەن و ویژدانپەروەرانە و پەرۆشانە بۆ حەق ڕوویان تێ ناکات.

سا (الله) بە هەر مرۆڤێکی ڕاسپێردراو، دڵێکی ساغ و عەقڵێکی سازی داوە، بێشک دەبێت بە فیترەتی خۆی ئیسلامی لەلا پەسەند و قەشەنگ بێت و بە عەقڵی خۆی بەڵگەکانی بۆ دەربکەوێت. جا کوا کام ڕووانینی بێلایەن

و پاکە کە ئەو قورئانە قایلی نەکات، ئەو قورئانەی کە ئەمە سیفەتی بێت: ﴿إِنَّ اللَّهَ يَأمُرُ بِالعَدلِ وَالإِحسانِ وَإِيتاءِ ذِي القُربى وَيَنهى عَنِ الفَحشاءِ وَالمُنكَرِ وَالبَغيِ يَعِظُكُم لَعَلَّكُم تَذَكَّرونَ﴾ [النحل: ٩٠] «بەدڵنیاییەوە کە (الله) فرمان بە دادپەروەری و چاککاری و بەخشین بە خزمان دەکات و نەهی لە تاوانی هەرە ناشیرین و بێزراوەکان و سنوورشکێنی دەکات، وا ئامۆژگاریتان دەکات تاکوو بیر بکەنەوە.»

کامە ڕووانینی بێلایەنە قورئانێک قایلی ناکات کە فەرموویەتی: ﴿إِنَّ اللَّهَ يَأمُرُكُم أَن تُؤَدُّوا الأَماناتِ إِلى أَهلِها وَإِذا حَكَمتُم بَينَ النّاسِ أَن تَحكُموا بِالعَدلِ إِنَّ اللَّهَ نِعِمّا يَعِظُكُم بِهِ إِنَّ اللَّهَ كانَ سَميعًا بَصيرًا﴾ [النساء: ٥٨]، «(الله) فرمانتان پێ دەکات ڕاسپاردەکان بگەڕێننەوە بۆ خاوەنیان و وەختێکیش لەنێوان خەڵکدا داوەریتان کرد بە دادپەروەری داوەری بکەن، بەڕاستی باشترینێکە ئەوە خوا ئامۆژگاری ئێوەی پێ دەکات.»

لەوانەیە بڵێیت: "بەڵێ، بەڵام لە بەرانبەریشدا و هەر لەو قورئانەدا ئەوە و ئەوە هەن لە ئایەتەکانی جەنگ و فرەژنی و هی دیش."

دەڵێین: ئەم ئایەتانە تەنیا پێچەوانەی ئارەزوو و درکپێکردنێکی مرۆڤن کە دەستێوەردانی ڕاگەیاندن و وێنە ڕۆتینییەکان شێواندوویانە. لەگەڵ ئەوەشدا کەسێک هەرچی وتووێژکردنی قورئان هەیە لەگەڵ عەقڵ و فیترەتی مرۆڤدا، وازی لێ بهێنێت و بیگرێت بەو نموونانەی دیکەوە، بێشک شوێنکەوتووی ئارەزووی خۆیەتی و دەیەوێت دەست بە شتێکەوە بگرێت، ئەو پشتهەڵکردنەی خۆی لە ڕامان و گەیشتن لە قورئان و بەڵگەکانی ئیسلام و ملهوڕییەکەی، پێ پاساو و پەردەپۆش بکات.

بەهەرحاڵ ئەو مرۆڤەی گومانی لە ئیسلام هەیە، بەهانەی نادرێتێ و بەهانەشی نییە. بەڵکوو گرفتی ئەو شوێنکەوتنی ئارەزووە وەک درێژەشمان

پێ دا لەژێر ئەو ناوونیشانەی پێشوودا: "دەشێت دووڕوو وا بزانێت خەریکە کاری باش دەکات" جا شوێنکەوتنی ئارەزوو ڕێگری ئەوە لە خاوەنەکەی دەکات بە ڕووانینێکی ڕاستاڵانە و بێلایەنانە و دروست، لە بەڵگەکانی ئیسلام بڕوانێت. سا بەگومانبوون یان قایلنەبوونی، بەرەنجامی ئەوەیە کە مەرجەکانی ڕووانینی تەندروستی نەهێناوەتە جێ، چاک نەکۆڵیوەتەوە. کەواتە تەنانەت ئەگەر بە کوفری نکۆڵیکردنیش کافر نەبوویێت، بە کوفری پشتهەڵکردن و خۆلێکەڕکردن کافر بووە، پشتکردنێک لە بەڵگەکان کە سەرەنجامی بووەتە ئەو تلانەوەیە لەناو گوماندا.

پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿فَإِن لَم يَستَجيبوا لَكَ فَاعلَم أَنَّما يَتَّبِعونَ أَهواءَهُم وَمَن أَضَلُّ مِمَّنِ اتَّبَعَ هَواهُ بِغَيرِ هُدًى مِنَ اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ لا يَهدِي القَومَ الظّالِمينَ﴾ [القصص: ٥٠]، «جا ئەگەر وەڵامیان بۆت نەبوو و بڕوایان پێ نەهێنای، بزانە کە شوێن ئارەزووی خۆیان کەوتوون کێش لەوە گومڕاترە کە بەبێ ڕێنوێنییەک لەلای (الله)وە شوێن ئارەزووی خۆی بکەوێت، بەدڵنیاییەوە کە خوا هیدایەتی خەڵکی ستەمکار نادات.» سا ئەوەی مل بۆ ئیسلام نادات، یان بەربەستی ئارەزووپەرستی ڕێگری لێ کردووە، دڵنیا بێت لە بڕواهێنان بە ئیسلام، یاخود دیسان بەربەستی ئارەزووپەرستی ڕێگریی ملکەچکردنی بۆ ئیسلام لێ کردووە تەنانەت پاش ئەوەش دڵنیابووەتەوە لە ڕاست و حەق بوونی، لە هەردوو حاڵیشدا ستەمکارە و شایەنی سزایە.

بە هەموو ئەمەدا تێپەڕی دەزانیت کە پرسیاری: "گوناهی دووڕوو چییە کە گومانی لە ئیسلام هەیە پاش ئەوەی بێلایەنانە لە بەڵگەکانی ڕووانیوە؟" پرسیارێکی بەتاڵە، ئیبن تەیمییە لە (العقيدة الواسطية)دا دەفەرموێت: "هەر کەس بە پەرۆشی هیدایەتەوە لە قورئان ڕابمێنێت و سەری بەسەرییەوە بێت، ئیللا ڕێگەی ڕاستی بۆ ڕوون دەبێتەوە".

لە بەرانبەردا هەر کەس بە پەرۆشیی ئارەزوویەوە لە قورئان ڕابمێنێت و خەریکی بێت، ڕێگەی ڕاستی لێ وێڵ دەبێت.

ئیبن قەییم لە (مدارج السالکین)دا دەفەرمووێت: "کوفری گومانیش ئەوەیە کە دڵنیا نییە نە لە ڕاستبوونی و نە لە درۆبوونی، بەڵکوو لێی بەگومانە، ئەمەش ناکرێت ئەم گومانەی بەردەوام بێت، مەگەر لەسەر خۆی بسەپێنێت کە پشت بکات لە ڕووانین و تەماشاکردنی بەڵگەکانی ڕاستییەتیی موحەممەد (ﷺ) بەگشتی، نە گوێبیستی بێت نە ئاوڕی لێ بداتەوە، بەڵام هەر ئەوەندەی ئاوڕێکی لێ بداتەوە و چاوێکی لێ بکات، بەدڵنیاییەوە گومانێکی نامێنێت، چونکە بەتەواوی چەسپاندنی ڕاستییەتیی خۆیانیان تێدایە، بەتایبەت وەختێک پێکڕا کۆ دەبنەوە، ئەو کات بەڵگەبوونیان لەسەر ڕاستگەڕان وێنەی بەڵگەبوونی خۆرە لەسەر ڕۆژ".

سا ئیمکانی نییە مرۆڤێک بەڵگە یەکلاکەرەوەکانی ئیسلام بۆ خۆی بخاتە ڕوو بە خستنەڕوویەکی بێگەرد و ڕاستاڵانە و لە پاشان قایلیش نەبێت پێی، بگرە دانپێدانەنانی بێگومان لێکەوتەی بێلایەن نەبوون و شوێنکەوتنی ئارەزووە، نەک هی بەهێزنەبوون و بەکەڵکنەهاتنی بەڵگەکان.

جا نەنگی نە لە ئایینەکەی خوادایە و نە لە بەڵگەیەکیشی کەمە:

﴿قُل فَلِلَّهِ الحُجَّةُ البالِغَةُ فَلَو شاءَ لَهَداكُم أَجمَعينَ﴾ [الأنعام: ١٤٩]، «بڵێ دەی بەڵگەی هەرە تەواو بۆ خوایە، سا ئەگەر بیویستایە هەمووتانی ڕێنوێنی دەکرد.»

پەروەردگاریش تەواوی خەڵکی لەسەر بزووان و مەیلکردن بۆ لای ئایینەکەی خۆی ڕسکاندووە:

﴿وَإِذ أَخَذَ رَبُّكَ مِن بَنى آدَمَ مِن ظُهورِهِم ذُرِّيَّتَهُم وَأَشهَدَهُم عَلى أَنفُسِهِم أَلَستُ

بِرَبِّكُم قالوا بَلى شَهِدنا أَن تَقولوا يَومَ القِيامَةِ إِنّا كُنّا عَن هذا غافِلينَ ﴿١٧٢﴾ أَو تَقولوا إِنَّما أَشرَكَ آباؤُنا مِن قَبلُ وَكُنّا ذُرِّيَّةً مِن بَعدِهِم أَفَتُهلِكُنا بِما فَعَلَ المُبطِلونَ﴾ [الأعراف: ١٧٢ – ١٧٣] «وەختێک پەروەردگارت لە نەوەکانی ئادەم لە پشتیانەوە وەچەکانیانی دەرهێنا و کردنیە شاهێد بەسەر خۆیانەوە، ئەرێ من پەروەردگاری ئێوە نیم گوتیان با ئێمە شاهێدی ئەمەین، بۆ ئەوەی ڕۆژی دوایی نەڵێن ئێمە لەمە بێئاگا بووین (١٧٢) یاخود بڵێن خۆ باب و باپیرانمان بوون بەر لە ئێمە شیرکیان کردووە و ئێمەش وەچەی ئەوان بووین پاش وان، ئەرێ [خوایە] تۆ بە تاوانی باتڵکاران ئێمەش دەفەوتێنی.»

پێغەمبەری خواش (ﷺ) فەرموویەتی: "هیچ لەدایکبوویەک نییە لەسەر فیترەتی پاک لەدایک نەبێت، جا باوکودایکین دەیکەنە جوولەکە، یان گاور، یان ئاگرپەرەست."[1]

نەنگی لەو دڵەیە مل بۆ ئایینی خوا کەچ ناکات، باسەکەی ئێمەش لێرەدا سەبارەت بە ملنەدانێکی گشتگیرە بۆ ئیسلام، پشتکردنێکی تەواو. بەڵام، ئەوەی مرۆڤ شتێک لە دڵیدا بێت لەسەر هەندێک لە وردەکارییەکانی شەریعەت، ئەوەیان لەپێر سیفەتی "ڕقبوونەوە لەوەی خوا دایبەزاندووە" باسی دەکەین.

ئەی چۆن ئەگەر مرۆڤ باوەڕ بهێنێت و پاشان ئارەزووی بێت و لەم باوەڕەی دابڕنێت؟! سەیرت لێ نەیەت دڵی مۆری پێوە بنرێت و ئیتر شکی لە حەقیقەتە هەرە گەورەکانیش بۆ پەیدا ببێت. پەروەردگار لەبارەی دووڕووانەوە فەرموویەتی: ﴿ذلِكَ بِأَنَّهُم آمَنوا ثُمَّ كَفَروا فَطُبِعَ عَلى قُلوبِهِم فَهُم لا يَفقَهونَ﴾ [المنافقون: ٣]

«ئەوەش بەرانبەر بەوەی باوەڕیان هێنا و لە پاشان بێباوەڕ بوونەوە، ئیدی دڵیان مۆری لێ نرا و لەوەولاش ئەوان تێگەیشتنێکیان نەماوە.»

---

(١) [البخاري: ١٣٥٩]

فەرمووشیەتی: ﴿كَيفَ يَهدِي اللَّهُ قَومًا كَفَروا بَعدَ إيمانِهِم وَشَهِدوا أَنَّ الرَّسولَ حَقٌّ وَجاءَهُمُ البَيِّناتُ وَاللَّهُ لا يَهدِي القَومَ الظّالِمينَ﴾ [آل عمران: ٨٦]، «چۆن خوا خەڵكێک ڕێنوێنی دەكات كە پاش ئیمانهێنانیان كافر بوونەتەوە و شاهێدییان دابوو كە پێغەمبەر ڕاستە و بەڵگە هەرە ڕوونەكانیان بۆ هاتبوو، خواش هیدایەتی خەڵكی ستەمكار نادات.».

سا پەنا بە خوا لە شوێنكەوتنی ئارەزوو، چۆن خاوەنەكەی خلۆری هەڵدێرە سامناكەكان دەكاتەوە! تاوانەكان دڵ نەخۆش دەخەن و ئارەزوو زاڵتر دەكەن بەسەریدا، ئارەزووش ڕێگە بەرەو گومان لێدەدات:

ئەمە بەو موسڵمانانەی دەڵێین كە سكاڵای بەگومانبوونیان دەكەن لە ئایین و كەم دڵنیاییان و توانانەشكان بەسەر ناسینەوەی حەق لە سەردەمی ناكۆكییەكاندا. وریای تاوانەكان بە دڵ نەخۆش دەخەن، ئەوجا ئارەزووی بەسەردا زاڵ دەكەن، تا ئەوەی ئیتر ڕێگری دەكەن لە ناسینەوەی ڕاستی و وەرگرتنی هیدایەت بە بەڵگەكانی ئیسلام و گومانبارانت دەكەن لەمەڕ ئایینی خوا و دووڕوویی سەرەنجامت دەبێت.

دڵ خراپ دەبێت بە سەرپێچییەكان وێنەی هەستەوەرەكان كە خراپ دەبن بە بەركەوتنی زیان و ئازارەكان:

**ومن يك ذا فم مر مريض**

**يجد مرا به المـــــاء الزلالا**

**✿✿✿✿✿**

**هەر كێ دەمێكی تاڵ و ناساغی هەبێت**

**ئاوی زوڵاڵیشـــی لـــــــــە زاردا تاڵە**

کەواتە نەخۆشیی دڵ بە سەرپێچییەکان پەیدا دەبێت، بەڵگەش لەسەر ئەمە لە قورئان و سوننەتدا گەلێک زۆرن، لەوانە ئەو فەرمایشتەی پەروەردگار: ﴿فَما لَكُم فِي المُنافِقينَ فِئَتَينِ وَاللَّهُ أَركَسَهُم بِما كَسَبوا﴾ [النساء: ٨٨]، «جا ئێوە چیتانە وا سەبارەت بە دووڕووان بوونەتە دوو گرۆوە کە خوا بە بەری دەست و کاری خۆیان، پەکی خستوون.»

واتە هەڵیگەڕاندوونەتەوە و خستوونیەتە.کوفرەوە بە هۆی تاوانەکانیانەوە.

لەبارەی بەنی ئیسرائیلیشەوە فەرموویەتی: ﴿فَلَمّا زاغوا أَزاغَ اللَّهُ قُلوبَهُم وَاللَّهُ لا يَهدِي القَومَ الفاسِقينَ﴾ [الصف: ٥]، «وەختێک لایاندا، خواش دڵیانی لادا و هەڵدێرا کە خوا هیدایەتی خەڵکی لەتاعەتدەرچوو ناکات.»

حەق خۆی لە زانستەوە دێت، مرۆڤیش زانستی بە تاوان بیر دەچێتەوە، لە ئیبن مەسعوودەوە هێنراوە کە فەرموویەتی: "من وا دەزانم مرۆڤ زانستێکی بیر دەچێتەوە بەهۆی تاوانێکەوە کە دەیکات."

ئیبن تەیمییەش ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: "تاوانەکان تێیاندایە دەبنە هۆکاری شارانەوەی تەواوی زانستی بەسوود یان بەشێکی، بگرە دەبنە هۆی لەبیرچوونەوەی ئەوەشی کە زانراوە و گلدراوەتەوە".

لەو بەڵگانەشی دەیخەنە ڕوو نەخۆشکەوتنی دڵ بەهۆی سەرپێچییەکانەوەیە ئەو فەرمایشتەی (الله): ﴿لا يَزالُ بُنيانُهُمُ الَّذي بَنَوا ريبَةً في قُلوبِهِم إِلّا أَن تَقَطَّعَ قُلوبُهُم﴾ [التوبە: ١١٠]، «هێشتا ئەو بینایەی بنیاتیان ناوە خوتخوتە و گومانە لە دڵیاندا هەتا ئەو کاتی دڵیان دەتەقێت و دەپچڕێت.»

واتە بنیاتنانی دووڕووان بۆ مزگەوتی ضیراڕ، شک و دووڕوویی خستە دڵیانەوە. سا مرۆڤ دەبێت وریا بێت لە کردنی تاوانێک کە دەشێت زیاتر نەخۆشی و گومانی دڵی پەرە پێ بدات مادام شوێنەوارەکانی ماون و سەرپێن،

لەگەڵ ئەوەشدا کە خاوەنەکەی دەشێت ئەسڵەن لە خەیاڵیشیدا نەمێنێت و هۆشی لای ئەم سەرچاوەیەی نەخۆشی و ناساغییەکانی دڵی نەبێت، یان بەکەم لێی بڕوانێت و وا بزانێت تەنیا وازهێنانی لێی بەسە بۆ نەمانی شوێنهاتەکانی با ئەوەشی کە خراپی کردووە پێشتر ئێستە چاکی نەکاتەوە، وەک ئەوەی پۆستێک لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکاندا بڵاو بکاتەوە کە سەرخستنی باتڵێک و ناشیرینکردنی حەقێکی تێدایە، یان گرتە و وێنەی بەدڕەوشتانە بگوێزێتەوە و گەنجانی موسڵمانی پێ تووشی ئاشووب بکات، جا کەسێک ئەوە بکات زۆر نزیکە تاوانەکەی کارتێکەری خراپ بکاتە سەر دڵی لە شک و دووڕوویی مادەم شوێنەوارەکانی هێشتا مابێتن، هەتا ئەگەر خاوەنەکەشی بیری چووبێتەوە کە ئەم خراپە لەبەرڕۆشتووەی کردووە، دە با ژیران ئاگادار بن!

هەربۆیە پێغەمبەرمان (ﷺ) فێری کردووین هەستیار بین بەرانبەر بە گوناهەکان و ڕاستاڵانە داوای لێخۆشبوونیان بۆ بکەین. موسلیم لە ئەبوو هورەیرەوە خوا لێی ڕازی بێت گێڕاوێتییەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە کڕنووشیدا دەیفەرموو: " اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي ذَنْبِي كُلَّهُ، دِقَّهُ وَجِلَّهُ، وَأَوَّلَهُ وَآخِرَهُ، وَعَلَانِيَتَهُ وَسِرَّهُ " "پەروەردگارم لە گوناهم هەمووی خۆش بە، گچکە و گەورەی، سەرەتا و کۆتایی، ئاشکرا و نهێنی."[١] هەروەها لە بەڵگەکانی سوننەتی نەبەوی لەسەر ئەوەی تاوانەکان دووڕوویی دەچێنن ئەو فەرمایشتەی پێغەمبەر (ﷺ): "هەر کەس گوێی لە بانگ بێت ڕۆژی هەینی و نەیەت، پاشان گوێی لێ بێت و نەیەت، پاشان گوێی لێ بێت و نەیەت، خوا مۆر لە دڵی دەدات و دەیکاتە دڵی مرۆیەکی دووڕوو." .

هەمان شێوە ئەو فەرمایشتەی دیکەشی (ﷺ): "فیتنەکان بۆ دڵەکان دەخرێنە ڕوو، وەک حەسیر چیلکە چیلکە، جا هەر دڵێک خواردییەوە،

---

(١) [مسلم: ٤٨٣]

خاڵێکی ڕەشی لێ دەکوترێت، هەر دڵێکیش نکوڵی بکات، خاڵێکی سپی لێ دەکوترێت، تا ئەوەی دەبنە دوو دڵ: یەکێکی سپی وێنەی بەردی صەفا ئیدی تا ئاسمانەکان و زەوی مابن فیتنەیەک زیانی پێ ناگەیەنێت، یەکێکی دیش ڕەشی قەترانی و وێنەی گۆزەی سەرەوخوار، نە چاک دەناسێت نە خراپ، جگە لەو ئارەزووەی خۆی هەیەتی."[1]

کە فەرموودەیەکی واتا گەورە و جێی تێڕامانە:

- "فیتنەکان بۆ دڵەکان دەخرێنە ڕوو، وەک حەسیر چیلکە چیلکە." ئاشووبی لێکئاڵۆسکاو و زۆروزەبەن بە شوێن یەکدا وێنەی لێکئالانی چیلکەی حەسیر.

- "جا هەر دڵێک خواردییەوە، خاڵێکی ڕەشی لێ دەکوترێت." واتە ئەو دڵەی قبووڵی دەکات و ڕەتی ناکاتەوە، خاڵێکی ڕەشی لێ دەدرێت.

- "هەر دڵێکیش نکوڵی بکات، خاڵێکی سپی لێ دەکوترێت." ئەوەی بەرهەڵستکاری دەکات و ئارامی لەسەر دەگرێت، خاڵێکی سپی لێ دەدرێت.

- "تا ئەوەی دەبنە دوو دڵ: یەکێکی سپی وێنەی بەردی صەفا ئیدی تا ئاسمانەکان و زەوی مابن فیتنەیەک زیانی پێ ناگەیەنێت." دڵی مرۆی خۆگر لە ئاشووبەکان وردە وردە سپی دەبێت و بە سپییەتیی صەفا، واتە ئەو بەردە سپییەی هیچی پێوە نالکێ، بەرگرییەک لە ئاست فیتنەکان پەیدا دەکات کە دێنە ڕێگەی تەنانەت با هەر یەکێکی تازەیان لە کۆنەکان گەورەتریش بێت.

"یەکێکی دیش ڕەشی قەترانی و وێنەی گۆزەی سەرەوخوار." ڕەنگ ڕەش و وەکوو ئەو گۆزەی هەڵگەڕاوەیەی چەندێکیش ئاوی بەسەردا بکەیت، ئاوێک گل ناداتەوە. ئەمیش ئاوا ئایەت و فەرموودە و پەند و ئامۆژگاری کاری تێ ناکات.

---

(١) [مسلم: ١٤٤]

● "نە چاک دەناسێت نە خراپ، جگە لەو ئارەزووەی خۆی هەیەتی." بزوێنەری ژیانی و پاڵنەری کردن و کردن و پێوەری بڕیاردان لە شتەکان: تەنیا و تەنیا ئارەزووە!

سەرنج بدە چۆن گلان لە فیتنەکان، ئارەزوو دەرخواردی دڵ دەدات، ئەمەش دەمانگێڕێتەوە سەر ناونیشانەکە: "تاوانەکان دڵ نەخۆش دەخەن و ئارەزووی بەسەردا زاڵ دەکەن، ئارەزووش ڕێگەی بەرەو گومان دەگرێت".

تۆ کاتێک تاوانەکانت بۆ نمایش دەکرێت، لەبیرت بێت کە هەڵوێستت بەرانبەری دیاری دەکات: خاڵێکی سپی کە دڵت دەپارێزێت لە ئاشووبەکان یان ڕەش کە نەخۆشی دەخات و وردە وردە دەیکاتە لەوەرگەی دوودڵی و دووڕوویی!

هەروەها لە بەڵگەکان لەسەر نەخۆشخستنی تاوان بۆ دڵ، فەرمایشتەکەی پێغەمبەرمان (ﷺ): "بەندە وەختێک تاوانێک دەکات، خاڵێکی ڕەش لە دڵی دەدرێت، جا ئەگەر دەست هەڵبگرێت و داوای لێخۆشبوون بکات و بگەڕێتەوە، دڵی ساف دەکرێتەوە و ئەگەریش بچێتەوە سەری زیاد دەکرێت، تا ئەوەی تەواوی دڵی دادەگرێت، ئەوەیە ئەو پەردەیەی پەروەردگار باسی کردووە: ﴿كَلَّا بَلْ رَانَ عَلَىٰ قُلُوبِهِم مَّا كَانُوا يَكْسِبُونَ﴾ «نەخێر بەڵکوو ئەوەی کە دەیانکرد باڵی کێشا بەسەر دڵیاندا و دایپۆشی.»"[1]

ئەم ئایەت و فەرمووودانە بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە ئاشووبی ئارەزوو و حەزەکان، ڕێگەن بەرەو ئاشووبی گومانەکان، تاوانەکان بیروباوەڕ دەڕووشێنن. مرۆیەک بەوە فریو نەخوات کە ئەو هەر چەندە لەسەر تاوانیش بێت بەڵام ئیمانی دڵی قایم و تەواوە. ئەوەی وا بزانێت توانای زێدەڕۆییکردنی لە گوناهدا هەیە بەبێ کاریگەربوونی باوەڕی بە شوێنەوارەکانی، هەر تەنیا بەم بیرکردنەوەیەی کەوتووەتە یەک لە تاوانە گەورەکانەوە، تاوانی ئەرخەیان بوون لە پیلانی خوا

---

(١) [الترمذي: ٣٣٣٤]

کە فەرموویەتی: ﴿فَلْيَحذَرِ الَّذينَ يُخالِفونَ عَن أَمرِهِ أَن تُصيبَهُم فِتنَةٌ أَو يُصيبَهُم عَذابٌ أَليمٌ﴾[النور: ٦٣]، «با وریا بن ئەوانەی سەرپێچی فرمانی ئەو دەکەن کە ئاشووبێکیان تووش بێت، یان سزایەکی بەئێش.»

خراپترین ئاشووبیش نەخۆشکەوتنی دڵەکانە بەهۆی سەرپێچیکردنیان لە فرمانی خوا و پێغەمبەرەکەی، ئیدی کوفر یان نیفاق، ڕێگە بەرەو دڵیان شک دەبات.

جا ئەرخەیانبوون لە پیلانی خوا ئەوەیە خراپەکان بکەیت و ترسی سزای خوات نەبێت لە دونیا و دوارۆژدا، یان ئەوەی دڵت نابووت بکرێت بە شوومی ئەم تاوانە، وەک ئەو کەسی چاوی بەرەڵلا کردووە بەناو حەرامەکانی خوادا و دەشڵێت: "ئەمە کار لە ئیمانی ناو دڵم ناکات." نموونەی ئەمە وتەکەی ئیبن مەسعوود دەیگرێتەوە خوا لێی ڕازی بێت: "گەورەترینی تاوانە گەورەکان: هاوەڵدانان بۆ خوا و نائومێدبوون لە میهری خوا و ئەرخەیانبوونە لە پیلان و سزای خوا." مرۆڤی سەرپێچیکار سێ جار بانگی ئاوەڕ لە دڵیدا سەرکوت دەکات: بەر لە کردنی سەرپێچییەکە بۆ ئەوەی دەست نەترسێنێت، پاشان لە میانەی کردنیدا بۆ ئەوەی چێژی تەواو وەربگرێت، پاشانیش دوای لێبوونەوە بۆ ئەوەی لە پەشیمانی کردنی کارەکە هەڵبێت. ئەم کرداری سەرکوتکردنە وەختێک زۆر ڕوویدا، تەواو ڕەگی ئیمان لە دڵ دەردەهێنێت و ناخۆشی و دوودڵی تێ دەهاوێت.

دەبینیت تاوانکار کاتێک سزای دوادەکەوێت لەوانەیە سەرەتا سوپاسی خوا بکات کە چاوپۆشی لێ کردووە، بەڵام ئیدی کە چەندبارەی کردەوە و سزای نەبینی، دەشێت ئەرخەیان بێت لە پیلانی خوا و ئەسڵەن گومان لە بوونی پاداشت و سزاش بکات! ئیتر بێئاگا لەوەی دونیاماڵی تاقیکردنەوەیە نەک لێپرسینەوە و سزا. وێڕای ئەوە دەکرێت ئەسڵەن سزاش درابێت و پێ نەزانێت. چ

سزایەک سەختتر لە نەخۆشیی دڵ و بێبەشبوون لە گوێڕایەڵیی خوا بە گەوزان لە سەرپێچیکردنی.

کاتێک جوولەکە بوێری و ڕووقایمی ئەوەیان کرد نزا لە پێغەمبەر (ﷺ) بکەن و گوتیان (السام علیك - مەرگ بۆ تۆ)، کە سزایەکی بەپەلەیان بۆ نەهات، ئەرخەیان بوون لە پیلانی خوا و سزادانی بۆیان: ﴿وَإِذا جاءوكَ حَيَّوكَ بِما لَم يُحَيِّكَ بِهِ اللَّهُ وَيَقولونَ فى أَنفُسِهِم لَولا يُعَذِّبُنَا اللَّهُ بِما نَقولُ حَسبُهُم جَهَنَّمُ يَصلَونَها فَبِئسَ المَصيرُ﴾[المجادلة: ٨] «وەختێکیش دێنە لات بە شێوەیەک سڵاوت لێ دەکەن خوا وا سڵاوی لێ نەکردوویت، لە دەروونی خۆشیاندا دەڵێن با خوا سزای بداینایە لەسەر ئەوەی کە دەیڵێین، بەسیانە دۆزەخ کە بچنە ناوی سا خراپترین سەرەنجامە.»

پوختەی بابەت ئەوەیە سەرپێچی بەرەو نەخۆشکەوتنی دڵ دەچێت و ئەویش بە ڕۆڵی خۆی ئارەزوو بەسەر دڵدا زاڵ دەکات. جا کاتێک ئارەزوو بەسەر دڵدا زاڵ بوو، دەشێت خاوەنەکەی بەرەو گومانکردن لە ئایینی خوا ببات، گومانیش بە ڕۆڵی خۆی بەرەو سیفەتە نیفاقییەکانی دیکە دەچێت.

لە جێگەی دیکەشدا دیسان بەڵگەسازی بۆ ئەم زنجیرە و هەنگاوانە دەکەین بە ویستی خوای بەرزی باڵادەست لە بەرانبەردا گوێڕایەڵی بەرەو دڵنیایی دەتبات:

خاوەن گوێڕایەڵیش باوەڕی خۆی گلێر دەکاتەوە و گوڕی پێ دەدات تاکوو پاڵی پێوە بنێت بۆ تاعەتەکان و پاشان بەردەوامبوونیش لەسەری وەختی کردنی، ئەوجا شادبوونیش پێی دوای تەواوبوونی.

پەروەردگار دەفەرمووێت: ﴿وَمَثَلُ الَّذينَ يُنفِقونَ أَموالَهُمُ ابتِغاءَ مَرضاتِ اللَّهِ وَتَثبيتًا مِن أَنفُسِهِم كَمَثَلِ جَنَّةٍ بِرَبوَةٍ﴾[البقرة: ٢٦٥]، «نموونەی ئەوانەشی ماڵیان دەبەخشن لەپێناو ڕەزامەندیی خوادا و بە دڵچەسپاویی دەروونیانەوە، نموونەی

باخێکە بە تەپۆڵکە و بەرزاییەکەوە.»

جا ئەوان لەپێناو خوادا و بە ئومێدی ئەوەوە دەروونیان لەسەر باوەڕ بچەسپێنێت، دەبەخشن.

هەروەها پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿وَلَو أَنَّهُم فَعَلوا ما يوعَظونَ بِهِ لَكانَ خَيرًا لَهُم وَأَشَدَّ تَثبيتًا﴾ [النساء: ٦٦]، «خۆ ئەگەر ئەوان ئەوەیان بکردایە کە ئامۆژگارییان پێی کرابوو، بۆ خۆیان باشتر و توند چەسپێنتر دەبوو.»

زیادبوونی ئیمان و یەقینیش لە پاداشتی زووی خوایە بۆ باوەڕدار لەسەر گوێڕایەڵییەکانی: ﴿وَيَزيدُ اللَّهُ الَّذينَ اهتَدَوا هُدًى﴾ [مریم: ٧٦]، «ئەوانەشی ڕێنوێنییان وەرگرتووە، خوا زیاتر ڕێنوێنییان دەداتێ.»

## ئامڕازەکانی ڕاونانی گومان:

ئەوەی لە دڵیدا گومانێک لەمەڕ ئایین هەست پێ دەکات، یەکەم نزاکردنی لەسەرە. پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: "دڵی تەواوی ئادەمیزادەکان لەنێوان دوو پەنجە لە پەنجەکانی خوای میهرەباندایە، وەک یەک دڵ، هەر چۆنی بوێ دەیبا و دەیهێنێت." لەپاشان پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: "پەروەردگارا هەڵسووڕێنەری دڵەکان، دڵەکانمان بخەرە سەر گوێڕایەڵی خۆت."[1]

لە فەرموودە قودسییەکەشدا هاتووە: "ئەی بەندەکانم، سەرجەمتان گومڕان مەگەر ئەوەی من ڕێنوێنیم کردبێت، جا داوای ڕێنوێنیم لێ بکەن تا ڕێنوێنیتان بکەم."[2]

---

(١) [مسلم: ٢٦٥٤]

(٢) [مسلم: ٢٥٧٧]

لەسەریشیەتی ئاگای لە پەیوەندیی نێوان سەرپێچی و لاوازبوونی یەقین هەبێت، هەروەها پەیوەندیی نێوان ئارەزووەکان و گومانەکان. ئەوجا لەسەریەتی بە شوێن زانستی بەسووددا بڕوات. لە ئیبن دەیلەمییەوە هاتووە فەرموویەتی: "لەبارەی قەدەرەوە شتێک لە دڵمدا پەیدا بوو کە ترسام ئایین و ماڵ و حاڵم پێی کاول بێت. جا چوومە لای ئوبەی کوڕی کەعب و گوتم ئەرێ ئەبا مونذیر شتێک سەبارەت بەم قەدەرە کەوتووەتە دڵمەوە و ترساوم ئایین و حاڵم لێ وێران بکات. سا شتێکم لەسەر ئەوە بۆ باس بکە بەشکوو خوا بیکاتە مایەی سوودم." جا ئیبن دەیلەمی نەیهێشت ئەم خوتخوتەیە لە دڵیدا سەرگەمی کار بێت، بەڵکوو غاریدا بۆ لای یەک لە هاوەڵان تا ئەو گومانەی بۆ بسڕێتەوە بە ڕووناکیی وەحییەک کە لە پێغەمبەری خوای (ﷺ) بیستووە.

هەروا ئامۆژگاریمانە زنجیرەی (رحلة اليقين - گەشتی دڵنیایی) تەماشا بکەن کە هی بەندەی بچووک ئیاد قونەیبییە، جێگیرکردنی دڵنیایی و ڕێبازێکی زانستی تێدایە بۆ ڕزگاربوون لە گومانەکان و هەڵکەندنی ڕەگیان، زۆرێکیش لە برایان و خوشکان ڕاشکاوانە ڕایانگەیاندووە کە دوای ڕوانینیان لەم زنجیرەیە، گەڕاونەتەوە بۆ ئیسلام، پاش دەورانێک لە باوبۆران و گێژەڵووکەی شک و گومانەکان. سا سوپاس و ستایش هەر بۆ خوایە لە سەرەتا و لە کۆتاییدا.

هەروەها بینینی (سلسلة المرأة - زنجیرەی ئافرەت)یش بە هەمان شێوە، دیسان لەلایەن بەندەی بچووکەوە، چارەی زۆرێک لە گومانەکانی تێدایە تایبەت بە ئافرەت لە ئیسلامدا، شوێنەواری باشیشی هەبوو سوپاس بۆ خوا.

وەسوەسەکان بەو گومانە هەژمار ناکرێن کە باوەڕ لەق دەکات، ئەم قسانەی پێشوو تەنیا سەبارەت بەو گومانە بوو لە دڵدا دەمێنێتەوە و گیرساوەیە، نەک ئەو خوتخوتە شەیتانییانەی خاوەنەکەی پەنا بە خوا دەگرێت و پاڵی دەنێت.

پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿إِنَّ الَّذِينَ اتَّقَوا إِذا مَسَّهُم طائِفٌ مِنَ الشَّيطانِ تَذَكَّروا فَإِذا هُم مُبصِرونَ﴾[الأعراف: ٢٠١]، «بەڕاستی ئەوانەی کە لەخواترسن وەختێک گوژم و خوتخوتەیەکیان لە شەیتانەوە پێ بکەوێت، دەکەونە یاد و ئیدی دەبینی بەرچاوڕۆشن و دامەزراون.»

خەڵکێک لە هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) هاتنە خزمەتی و لێیان پرسی: "ئێمە شتی وا دێ بە دڵ و دەروونمانا ناوێرین بێت بە دەممانا." فەرمووی: "بەڕاست بەوە گەشتوون؟" گوتیان: "بەڵێ"، فەرمووی: "ئەوە ئیمانی سوور و سافە."[1]

پیاوێکیش هاتە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) و گوتی: "من شتی وا دەڵێم لە دڵمدا، ببم بە خەڵووز پێم خۆشترە لەوەی بە زار بیڵێم." واتە ئەم هاوەڵە پێی باشترە بسووتێت وەک لەوەی ئەو خوتخوتەیەی ناو دڵی بێ بە دەمیدا. پێغەمبەری خواش (ﷺ) فەرمووی: "سوپاس بۆ ئەو خوایە کە هەرچی ماویەتی و نەیماوە (یانی شەیتان) تەنیا هەر وەسوەسەیە."[2]

واتە ئەوسەری هەوڵ و توانستی شەیتان لەگەڵ ئەم بەندەیەدا تەنیا ئەوەیە خەیاڵ و خوتخوتەی بۆ ببزوێنێت دڵنیاییش پلەی هەیە:

یەقین چەند دانە پلەیە نەک تەنیا پلەیەک. ئەمە بۆیە دەڵێین کە کەس نە خۆی و نە خەڵکیش بە دووڕوویی تۆمەتبار نەکات تەنیا لەبەر ئەوەی لە پلەی کەماڵ و ترۆپکی دڵنیاییدا نییە.

بەڵام چۆن دەڵێین دڵنیایی فرەپلەیە؟ ئەرێ مرۆڤ هەر ئەوە نییە، یان باوەڕهێن بێت، یان بەگومان، یان بەدرۆخەرەوە؟ ئەرێ دڵنیایی ئەوە نییە

---

(١) [مسلم: ١٣٢]

(٢) [أبو داود: ٥١١٢]

باوەڕێکی تەواوی یەکلای بێ شک و دوودڵی بێت؟

بەڵێ، بەڵام ئەم -باوەڕهێنانەش- لە خودی خۆیدا چەندئاستە؛ تۆ وەختێک بە باوەڕێکی پێداگرانە و تەواو باوەڕ بە بوونی خوا دەهێنیت، ئیدی هێڵی داخوازت تێ پەڕاندووە، یانی لە هێزی کێشکردنی گومان و دوودڵییەکان دەربازت بووە. بەڵام، پاش لەوەش هێشتا خەڵک جیاوازییان هەیە لە هەڵفڕین و بەرزبوونەوەدا.

بچۆ ناو باخێک و دارەکانی تەماشا بکە، سەرجەمیان داری زیندوو و سەوز و لەسەر پێ وەستاون، بەڵام ئایا یەکسانن؟ نا، دارێک دەبینی ڕەگی باریکی هەیە کە لەسەر ڕووکاری زەوییەکە دیارن، ئاسانە هەڵکەندنی، دارێکی دیکەش هەر ئەو کات، قووڵڕەگ، لە بن نایەت، یەکێکی ڕەگ چڕ و داچەسپاوتریش هەر دەبینی کە هەرگیز تەمای دەرهێنانی نادەیتە بەر خۆت، دەشێت ببڕدرێتەوە، بکوژرێت، بسووتێنرێت، بەڵام دەرناهێنرێت و نالەقێت، وێنەی یەقینیش لە دڵەکاندا ئاوەهایە.

کۆمەڵە موسڵمانێک سەرجەمیان دڵنیاییەکی زیندوویان هەیە، وێنەی ئەم دارانە، بەڵام ئای وەختێک ئاشووب یەخەیان دەگرێت، چەندە جیاوازن.

دیسان هەر ئەو دارانە لە بەخشینی بەریشدا یەکسان نین؛ هەیانە تەنیا سوودی بۆ خۆی هەیە، هەیانە بەری بەسەر خەڵکدا دەبارێت و سێبەرداریشە. یەقینیش ئاوها، هەربۆیە تەنانەت خاوەن یەقین خۆشی پێویستی بە ئاودانی داری یەقینی هەیە؛ نەکا وشکی لێی بدات و بمرێت، بگرە نەشونماش بکات و بەریش بدات، سوود بگەیەنێت و ڕەگ لە سکی زەویدا بهاوێت.

# ٢- پشتکردن لە بەداوەرکردنی پەڕتووکەکەی خوا و سوننەتی پێغەمبەرەکەی (ﷺ)

**هۆکارە ڕاستییەکانی:**

لێرەشدا ئەو پەیوەستییە دەردەکەوێت کە لە سیفەتی گومانکردن لە ئایین ڕیشەسازیمان بۆ کرد. ئەم پشتکردنە لە گومانەوە سەری دەرهێناوە، گومانیش لە شوێنکەوتنی ئارەزووەوە سەرچاوەی گرتووە، ئارەزووش لەو دڵە نەخۆشانەدا فەرمانڕەوایە کە تاوان نەخۆشی خستوون.

(الله) فەرموویەتی: ﴿أَفَحُكمَ الجاهِلِيَّةِ يَبغونَ وَمَن أَحسَنُ مِنَ اللَّهِ حُكمًا لِقَومٍ يوقِنونَ﴾ [المائدە: ٥٠]، «ئەرێ حوکمی نەفامییان دەوێت؟ جا حوکمی کێ لە حوکمی (الله) باشترە، لای خەڵکێک کە دڵنیاییان هەبێت.»

جا نەبوونی یەقین -یانی گومان- وا لە هاوەڵانی دەکات بە شوێن حوکمی نەفامییەوە بن.

هەروەها پەروەردگار لە پەسنی دووڕوواندا فەرموویەتی: ﴿وَإِذا دُعوا إِلَى اللَّهِ وَرَسولِهِ لِيَحكُمَ بَينَهُم إِذا فَريقٌ مِنهُم مُعرِضونَ ۝٤٨ وَإِن يَكُن لَهُمُ الحَقُّ يَأتوا إِلَيهِ مُذعِنينَ ۝٤٩ أَفي قُلوبِهِم مَرَضٌ أَمِ ارتابوا أَم يَخافونَ أَن يَحيفَ اللَّهُ عَلَيهِم وَرَسولُهُ بَل أُولئِكَ هُمُ الظّالِمونَ﴾ [النور: ٤٨ - ٥٠]

«وەختێکیش بانگ بکرێن بۆ لای خوا و پێغەمبەرەکەی، تا داوەری بکات لە نێوانیاندا، دەبینیت گرۆیەک لەوان پشت هەڵدەکەن (٤٨) خۆ ئەگەریش حەق بە ئەوان بێت بە ملکەچییەوە بۆی دێن (٤٩) ئەرێ دڵیان نەخۆشی تێدایە،

یان بەشک کەوتوون، یان دەترسن خوا و پێغەمبەرەکەی ستەمیان لێ بکەن، بەڵکوو ئەوانەن ستەمکار.»

جا پشتکردنیان لە داوەریبردنە لای خوا و پێغەمبەرەکەی لە بەشککەوتن (گومان)ـەوە سەرچاوەی گرتووە، کە ئەویش پەیوەندی بە نەخۆشیی دڵەوە هەیە.

هەروەها پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿وَأَنِ احكُم بَينَهُم بِما أَنزَلَ اللَّهُ وَلا تَتَّبِع أَهواءَهُم وَاحذَرهُم أَن يَفتِنوكَ عَن بَعضِ ما أَنزَلَ اللَّهُ إِلَيكَ فَإِن تَوَلَّوا فَاعلَم أَنَّما يُريدُ اللَّهُ أَن يُصيبَهُم بِبَعضِ ذُنوبِهِم﴾ [المائده: ٤٩]، «هەروەها بەوەی خوا دایبەزاندووە داوەری بکە لە نێوانیاندا و شوێن ئارەزووی ئەوان مەکەوە و وریایان بە بە ئاشووبتدا نەبەن و نەتترازێنن لەوەی خوا دایبەزاندووەتە سەرت خۆ ئەگەر پشتیان هەڵکرد ئیتر بزانە ئەوە خوا دەیەوێت بەهۆی هەندێک لە تاوانیانەوە گیرۆدەیان بکات.»

جا بەو تاوانانەی کردبوویان و بە شوێنکەوتنیان بۆ ئارەزوویان، خوا دڵیانی نەخۆش خستووە بۆیە ئاوا لە بەحاکمکردنی قورئانی خوا و سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ) لایانداوە.

**بەهانەی دەستیان بۆ ئەم پشتلێکردنە:**

پەروەردگار لە سوورەتی نیساءدا دەفەرمووێت: ﴿أَلَم تَرَ إِلَى الَّذينَ يَزعُمونَ أَنَّهُم آمَنوا بِما أُنزِلَ إِلَيكَ وَما أُنزِلَ مِن قَبلِكَ يُريدونَ أَن يَتَحاكَموا إِلَى الطّاغوتِ وَقَد أُمِروا أَن يَكفُروا بِهِ وَيُريدُ الشَّيطانُ أَن يُضِلَّهُم ضَلالًا بَعيدًا ۝٦٠ وَإِذا قيلَ لَهُم تَعالَوا إِلى ما أَنزَلَ اللَّهُ وَإِلَى الرَّسولِ رَأَيتَ المُنافِقينَ يَصُدّونَ عَنكَ صُدودًا ۝٦١ فَكَيفَ إِذا أَصابَتهُم مُصيبَةٌ بِما قَدَّمَت أَيديهِم ثُمَّ جاءوكَ يَحلِفونَ بِاللَّهِ إِن أَرَدنا إِلّا إِحسانًا وَتَوفيقًا﴾ [النساء: ٦٠ - ٦٢]

«ئەرێ نابینی ئەوانەی بانگەشەیان دەکرد باوەڕیان بەوە هێناوە دابەزیوەتە

سەر تۆ و ئەوەشی بەر لە تۆ دابەزیوە، (کەچی) دەیانەوێت حوکم بەرنە لای طاغووت لە کاتێکدا فرمانیان پێ کرابوو کافر بن پێی، شەیتانیش دەیەوێت بە گومڕاییەکی .دوور و قووڵ گومڕایان بکات (٦٠) وەختێکیش پێیان بگوترێت وەرن بۆ لای ئەوەی خوا دایبەزاندووە و بۆ لای پێغەمبەر؛ دەبینیت دووڕووان گەلێک سوور و خراپ پشت هەڵدەکەن (٦١) جا چۆن ئەگەر بەهۆی بەری دەستیانەوە تووشی کارەساتێک هاتن و پاشان هاتنە لات و سوێندیان بە خوا خوارد کە ئێمە تەنها چاککاری و گونجان و پێکانمان ویستووە.»

ئیبن کەثیر دەفەرمووێت: "واتە بەهانەت بۆ دەهێننەوە و سوێند دەخۆن کە چوونمان بۆ لای جگە لە تۆ لە دوژمنانت بۆ حوکمکردن، تەنیا چاکە و گونجاندن بووە، یانی خۆگونجاندن و موجامەلەکردن لەگەڵیان، نەک باوەڕمان هەبوویێت بە دروستییەتیی ئەو حوکم و داوەریکردنە."

ئەوان لەوانەیە بانگەشەی ڕێزنان لە شەریعەتی خواش بکەن، بڵێن بۆیە کار بە دەستووری دانراو و بێگانە دەکەین تەنیا بۆ خۆلادان لە شەڕی گەلان (موجامەلە و هەڵکردن لەگەڵیان) و بۆ بەدیهێنانی بەرژەوەندیی خەڵکیش (چاککاری).

ئیبن تەیمییە دەفەرمووێت: "جا ئەگەر دووڕوویی بێتە جێ و باوەڕ نەمێنێت، تەنیا بەوەی پشت لە حوکمی پێغەمبەر (ﷺ) بکرێت و ببردرێتە لای جگە لەو، لە کاتێکدا ئەمە تەنیا وازهێنانێکی (نەکردن) پەتییە و دەشێت هۆکارەکەی ئارەزوو و حەزێکی کاتیی بەهێز بێت، ئیدی شکۆشکاندنی و جنێوپێدانی و نموونەی ئەوانە بە چی بنووسرێت." شێخ بەمە ڕوونکردنەوە دەدات کە نیفاق تەنیا بە وازهێنانێک لە حوکمی خوا و پێغەمبەر (ﷺ)، بۆ خاوەنەکەی دێتە جێ و دەچەسپێت، تەنانەت ئەگەر کارپێکەرەکەشی قایل بێت بە ڕاستییەتیی ئایین، تەنانەت ئەگەر پاڵنەرەکە حەز و شوێنکەوتنی ئارەزوو بێت، نەک

بەدرۆخستنەوە و نکۆڵیکردن لە ئایین.

پەروەردگار لەپاش ئەم ئایەتانە دەفەرمووێت: ﴿أُولئِكَ الَّذينَ يَعلَمُ اللَّهُ ما في قُلوبِهِم فَأَعرِض عَنهُم وَعِظهُم وَقُل لَهُم في أَنفُسِهِم قَولًا بَليغًا ۝ وَما أَرسَلنا مِن رَسولٍ إِلّا لِيُطاعَ بِإِذنِ اللَّهِ وَلَو أَنَّهُم إِذ ظَلَموا أَنفُسَهُم جاءوكَ فَاستَغفَرُوا اللَّهَ وَاستَغفَرَ لَهُمُ الرَّسولُ لَوَجَدُوا اللَّهَ تَوّابًا رَحيمًا﴾ [النساء: ٦٣ - ٦٤]

«ئەوانە خوا بۆ خۆی دەزانێت چی لەناو دڵیاندایە سا تۆ پشتیان لێ بکە و ئامۆژگارییان بکە و قسەی سەختیان پێ بڵێ کە لە دڵیان بچەقێت (٦٣) هیچ پێغەمبەرێکیشمان نەناردووە مەگەر بۆ ئەوەی کە بە فرمان و مۆڵەتی خوا گوێڕایەڵی لێ بکرێت (لەلایەن خەڵکەوە)، خۆ ئەوان وەختێک ستەمیان لە خۆیان کرد ئەگەر بهاتنایە بۆ لات و داوای لێخۆشبوونیان لە خوا بکردایە و پێغەمبەر داوای لێخۆشبوونی بۆ بکردنایە دەیانبینی کە خوا تەوبەوەرگر و میهرەبانە.»

سا سەیرە خەڵکێک وای پیشان دەدەن مەزنییەتیی پێغەمبەر (ﷺ) لە دڵیاندایە پاشانیش پشت لە حوکمە وردەکار و نازدارەکانی دەکەن لە هەرچی گۆشەی ژیاندا هەیە، کە ئەو (ﷺ) بۆ ئەوە نێردراوە گوێڕایەڵی لێ بکرێت، سوودی چییە واتە کە بانگەشەی مەزنڕاگرتنی بکەین و لەگەڵ ئەوەشدا پشت لە شەریعەتەکەی بکەین؟!

خوای گەورە دوای ئەوە دەفەرمووێت: ﴿فَلا وَرَبِّكَ لا يُؤمِنونَ حَتّى يُحَكِّموكَ فيما شَجَرَ بَينَهُم ثُمَّ لا يَجِدوا في أَنفُسِهِم حَرَجًا مِمّا قَضَيتَ وَيُسَلِّموا تَسليمًا﴾ [النساء: ٦٥]

«دەی نا سوێند بە پەروەردگاری تۆ ئیمانیان نییە هەتا نەتکەنە داوەر لە هەرچی گێرە و کێشەی نێوانیاندا هەیە و لە پاشانیش لە دەروونیاندا هیچ تەنگی و چورتمێک نەبێت سەبارەت بەو داوەرییەی تۆ و بە تەواوی ملکەچیش

ملکەچی ببن.» جا باوەڕدار دڵی پاکە لە حوکمی خوا و پێغەمبەرەکەی (ﷺ). بەڵام دووڕوو ڕقی لە هەموو حوکمەکانی خوا و پێغەمبەرە (ﷺ) یان هەندێکی، ئەمەش سیفەتی دواترە کە دێینە سەری لە سیفەتەکانی دووڕووان.

## دووڕوو ئەو حوکمەی شەرعی قبووڵە کە تەبایە لەگەڵ ئارەزووی خۆیدا:

دەیەوێت فێڵ لە خوا و لە موسڵمانان بکات، بگرە لەوانەیە فێڵ لە خۆشی بکات، کە گوایە ئەو هەندێک لە شەریعەت کار پێ دەکات و دەبات بە ڕێوە. (الله) فەرموویەتی: ﴿يا أَيُّهَا الرَّسولُ لا يَحزُنكَ الَّذينَ يُسارِعونَ فِي الكُفرِ مِنَ الَّذينَ قالوا آمَنّا بِأَفواهِهِم وَلَم تُؤمِن قُلوبُهُم﴾ [المائدە: ٤١]، «ئەی پێغەمبەر سەغڵەتت نەکەن ئەوانەی پەلەیانە بەناو بێباوەڕیدا لەوانەی بە دەم گوتیان باوەڕمان هێنا و دڵیان باوەڕی نەهێناوە.»

هەتا ئەو جێگەیەی کە دەفەرمووێت: ﴿يَقولونَ إِن أوتيتُم هذا فَخُذوهُ وَإِن لَم تُؤتَوهُ فَاحذَروا﴾ [المائدە: ٤١]، «دەڵێن ئەگەر ئەمەتان پێ درا وەریبگرن وەگەر ئەمە نەبوو وریا بن.»

ئیبن کەثیر دەفەرمووێت: "لەناو خۆیاندا دەیانگوت وەرن با داوەری بەرینە لای -لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) سەبارەت بە دووان کە زینایان کردبوو- جا ئەگەر گوتی داریان لێ دەن و لووتیان ڕەش بکەن بەگێی دەکەین، دەتوانن لای خواش بیکەن بە بەڵگە بۆ خۆتان، کە ئەو کات یەکێک لە پێغەمبەران ئەو حوکمەی پێ داون. ئەگەریش گوتی بەردەبارانیان بکەن بە گوێی مەکەن."

ئەوان بەوە ﴿يُخادِعونَ اللَّهَ وَالَّذينَ آمَنوا وَما يَخدَعونَ إِلّا أَنفُسَهُم وَما يَشعُرونَ﴾ [البقرة: ٩]، «فێڵ دەنوێنن لە خوا و لە باوەڕداران، تەنیاش فێڵ لە خۆیان دەکەن و هەستیشی پێ ناکەن.»

پاشان دەفەرموویت پەروەردگار: ﴿سَمَّاعونَ لِلكَذِبِ أَكَّالونَ لِلسُّحتِ﴾ [المائدە: ٤٢]، «گوێگرن بۆ درۆ و بخۆرن بۆ حەرام.» کەواتە نەخۆشیی دڵیان لە گوناهەکانیانەوە سەرچاوەی گرتووە، لە گوێبیستبوونێکی زۆر بۆ ناهەقی و وەرگرتنی و خواردنی بەرتیل و پارەی حەرام و جگە لەوانەش.

هەر لە وەسفی ئەم بژارکردنەی دووڕووان پەروەردگار دەفەرموویت: ﴿وَإِذا دُعوا إِلَى اللَّهِ وَرَسولِهِ لِيَحكُمَ بَينَهُم إِذا فَريقٌ مِنهُم مُعرِضونَ ۝ وَإِن يَكُن لَهُمُ الحَقُّ يَأتوا إِلَيهِ مُذعِنينَ﴾ [النور: ٤٨ - ٤٩]، «وەختێکیش بانگ بکرێن بۆ لای خوا و پێغەمبەرەکەی تا داوەری بکات لە نێوانیاندا، دەبینیت گرۆیەک لەوان پشت هەڵدەکەن (٤٨) خۆ ئەگەریش حەق بە ئەوان بێت بە ملکەچییەوە بۆی دێن.»

هەشیانە بەشێک لە دەقە ئایینییەکان بژارە دەکەن بۆ ئەوەی لە بەرژەوەندیی خۆیاندا بەکاری بهێنن و خەڵکی پێ ڕام و ڕازی بکەن، بەڵام بەشی دیکەی پێچەوانەی ئارەزووی خۆیان واز لێ دەهێنن. ئەوان بەمە تەنانەت بە شێوەیەکی بەشەکی و جوزئیش، ئایینیان لە ژیاندا بەرپا و پێقایم نەکردووە، چونکە ئەو بەشەشی کاریان پێ کردووە تەنیا بە مۆڵەتدانی ئارەزوویان بووە، نەک لە ملکەچی و سەردانەواندنیان بێت بۆ (الله)، بەمە سەرلەبەری نییەت و نیازیان پووچ و بەتاڵ بووەتەوە.

سەیید قوطب ڕەحمەتی خوا لێ بێت دەفەرموویت: "دڵنیا بە ئایینی خوا بۆ ئەوە ناشێت بە خزمەتکار بیگرن و پشتێنی خزمەتگوزارانی لە ناوقەد گیردەن، لەبەر دەستی گەورەکانیدا بوەستێت و هەر چۆن و هەر کوێیان ویست، ڕووە و ئەوێ ئاڕاستەی بکەن! جار نا جارێک لە خزمەت وەدەری نێن و بەدەم ماچکردنی زەوی بەرپێیانەوە ئەوێ جێ بهێڵێت، پاشان لەپشت دەرگە -و لەناو ژێڕی نۆکەراندا- لە چاوەڕوانیی ئاماژەیەکدا بوەستێت! دیسان بانگی بکەنەوە، هەمدیس لێو بە زەوی و لێستنەوەیەوە بێتەوە، بنووشتێتەوە و بڵێت

فەرمانبەردارتم گەورەم! وێنەی ئەوانەی ناویان لێ ناون پیاوانی ئایینی نا! ئایینی خوا بە غەیری سەرداریەتی و هەژموونداری و بەهێزی و فەرمانڕەوایی و عیززەت و ڕێزی هەرە بەرز، ڕازی نابێت، داوەر نەک تۆمەتبار، پێشڕەو نەک شوێنکەوتە."

ئەوەشم بیر ناچێتەوە کە پیاوێکی ئەمەریکی پێی گوتم وەختێک بەرگریی لە دیموکراتییەکەی خۆیان دەکرد: "پێم وایە دەبێت تەنیا بەو ئەندازەیە ڕێگە بە خوا بدەین دەستوەردان لە ژیانماندا بکات کە خۆمان دەمانەوێت و دیاری دەکەین."

﴿وَما قَدَرُوا اللَّهَ حَقَّ قَدرِهِ﴾ [الزمر: ٦٧]، «ئەوانە ڕێز و پێگەی شایەنی خوایان بەجێ نەگەیاند.»

لەوانەشە هەندێک لەوانەی ئایین بژار دەکەن و بەش بەشی دەکەن ئێستە کە قسەی ئەم ئەمەریکییەیان خوێندەوە لایان ناشیرین بووبێت، لە کاتێکدا ئەوە تەنیا دەربڕینێکی گوتەیی حاڵی ئەوانە.

لە بەرامبەردا: ﴿إِنَّما كانَ قَولَ المُؤمِنينَ إِذا دُعوا إِلَى اللَّهِ وَرَسولِهِ لِيَحكُمَ بَينَهُم أَن يَقولوا سَمِعنا وَأَطَعنا وَأُولٰئِكَ هُمُ المُفلِحونَ﴾ [النور: ٥١]، «بەدڵنیاییەوە قسەی خاوەن باوەڕان وەختێک بانگ بکرێن بۆ لای خوا و پێغەمبەر کە داوەرییان بکات، تەنیا ئەوەیە کە بڵێن بیستمان و گوێڕایەڵ بووین، هەر ئەوانەشن سەرفراز». بیستمان و گوێڕایەڵ بووین بەبێ گەڕانەوە بۆ لای سەرچاوەیەکی دیکە، مەرجەعییەتی دیکە، ئەوەش لە هەر هەڵوەستەیەک و لە خزمەت هەر ئایەت و حوکم و تەشریعێکدا.

ئەمە بەو نەخۆشیی ڕەگە فێمینیزمییە بەراورد بکە کە ئایین و حوکمەکانی لەسەر بنەما و پێوەری بەها ڕۆژاواییە لادەرە گۆڕاوەکان هەڵدەسەنگێنێت. بۆ چارەی ئەم دەردەش بگەڕێرەوە سەر زنجیرە بینراوەکەمان بە ناوونیشانی (سلسلج المرأة - زنجیرەی ئافرەت).

## شێوەگەلێکی نەناسراو و سەرنجنەدراو لە پشتکردنە داوەریی شەرع:

کاتێک ناکۆکی لەنێو تاکەکانی خێزاندا دەکەوێتەوە، هەندێکیان پەنا دەبەنە دامەزراوەگەلێکی ناوخۆیی لە وڵاتانی موسڵماناندا کە ئەجێندای ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکان پەیڕەو دەکەن و شوێن پێناسەکردنی ئەوان دەکەون بۆ هەر تاکێک و ئەرکەکانی. ئەم ڕێکخراوانە هەوڵی ماندوونەناس و نەپساویان بۆ ئەوەیە قەوارەی خێزان درز تێ بخەن و خوارِسکی ڕۆڵەکانی بسڕنەوە وەک لە زنجیرەی جەنگ لە دژی فیترەتدا ئاماژەمان پێ کردووە، پێناسەگەلێکیان بۆ ماف و ئەرکەکان هەیە پێکدادەر لەگەڵ پێناسەکردنی ئیسلامدا، پەیماننامەکانی وان بە مانای وشە بریتییە لە ئایینێکی جێگرەوەی ئیسلام، ئایینێک کە ڕێگە بە زینا و هاوڕەگەزبازی دەدات، کە حەڵاڵی خوا حەرام دەکات، وەک هاوسەرگیریی خوار تەمەنی هەژدە ساڵەوە، تەنانەت گەر کوڕ و کچەکە پێگەیشتوو و گونجاویش بن بۆ پرۆسەکە. بە هەمان شێوە تەشریعەکانیان پەیوەست بە ئافرەت و سەرپەرشتیاریی پیاو و کاربەدەستبوونی و چەمکانی دیکەش.

جا وەختێک ناکۆکیی لەنێوان تاکەکانی خێزاندا هەڵدەگیرسێت و یەکێکیان پەنا دەباتە بەر ئەم ڕێکخراوانە، ئیتر کوڕ بێ کچ بێ هاوسەر بێ یان خوشک، بۆ ئەوەی دەستێوەردان لە خێزاندا بکەن و ئەو تاکەی پەنای بۆ بردوون، مافێکی بدەنێ کە شەرع نەیداوەتێ، ئەوسا ئەم تاکە پشتی لە شەریعەتی خوا کردووە و داوەریی داوەتە دژەکانی. جا با وریای ئەوە بن و دەماریان لەسەر هەڵە و تاوان گەرم و گیر نەبێت و پێچەقی نەکەن.

لەسەر هەموو موسڵمانێکە بڕوانێت: ئایا ئەمەی ئەو دەیەوێت چنگی بخات لە ناکۆکییەکاندا، مافێکە بەڕاست شەرع پێی دابێت؟ یان نا لە شەرعی خوادا مافی ئەو نییە بەڵکوو لە شەرعی ئەوانەدایە کە دوژمنی خوان و حەڵاڵی

حەرام دەکەن و حەرامی حەڵاڵ دەکەن؟! جا ئەگەر وایە، چۆن داوای دەکات و بگرە دەستی ئەم ڕێکخراوانەش دەهێنێتە ناو کەیسەکەوە و دەیەوێت مافی تاکێکی دیکەی خێزانی بۆ پێشێل بکەن؟ ئەگەریش ئەمەی کە دەیەوێت، مافێکی شەرعیی خۆیەتی کە یەکێک لە تاکەکانی خێزان لێی زەوت کردووە، دڵیشی بەرایی نادات دەستی لێ هەڵبگرێت، ئەو کات لەسەریەتی پەنا بەرێتە بەر ڕێگە شەرعییەکان بۆ بەدەستهێنانی، وەک ئاگادارکردنەوە و بەقسەهێنانی دەمسپییان و پیاوماقووڵان. نەک پەنابردنە بەر ئەم ڕێکخراوانەی کە هیچ بایەخێک بە ئاشتەوایی و چاکسازیی ناو خێزان و سەرچاوەیەتیی شەریعەت نادەن، کاریان تەنیا ئەوەیە بە چەپک و گورزە ئەو ڕاپۆرتانە پێشکەشی ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکان بکەن کە حاڵەتە سەرکەوتووەکانی جێبەجێکردنی پەیماننامە پێچەوانەکانی شەریعەتی تێدا تۆمار کراوە و ئەجێنداکانی هەڵوەشاندنەوەی خێزانی موسڵمانی تێدا پەیڕەو کراوە و گیانی تاکگەرایی و خۆپەرستی لە کۆمەڵگەدا بڵاو دەکاتەوە.

ئەمەش دەرگەیەکی گەورەی خراپەیە لەسەر پشتی لادەدەن لە وڵاتی موسڵمانانندا، هاوڕێ لەگەڵ زیادبوونی چالاکیی ئەم ڕێکخراوانە و سنووردارکردنی چەند بەندێک لە یاسای باری کەسی کە گونجاوی هەندێک لە ئەحکامی شەریعەتی ئیسلامی بوو.

هەمان باس بابەتیش دووبارە دەبێتەوە لە کێشەکانی نێوان مێرد و بنەماڵەی ژندا و بە پێچەوانەشەوە.

با موسڵمانان لەمەدا لە خوا بترسن، پیاو و ژنیان، کیژ و کوڕیان، گچکە و گەورەیان. منداڵانی موسڵمان و تازەپێگەیشتووان لە نێر و لە مێ ئەمەیان لە یاد بێت، خۆیان وەرنەدەنە ئەم بازنە مەترسیدارەوە کە تایبەتترین سیفەتەکانی دووڕوویی تێدا ڕەنگ دەداتەوە بەبێ هەستکردنیش.

## ٣- ڕقبوونەوە لەوەی خوا دایبەزاندووە

نەخۆشبوونی دڵی مرۆڤی دووڕوو وای لێ دەکات ڕقی لەوە ببێتەوە خوا دایبەزاندووە، دڵی نەخۆش جوان بە ناشیرین دەبینێت و ناشیرینیش بە جوان.

پەروەردگار لەبارەی بێباوەڕانەوە فەرمووویەتی: ﴿ذلِكَ بِأَنَّهُم كَرِهوا ما أَنزَلَ اللَّهُ فَأَحبَطَ أَعمالَهُم﴾ [محمد: ٩]، «ئەوەش بەرانبەر بەوەی ئەوان ڕقیان لەوە بوویەوە کە خوا دایبەزاندووە و ئەوەش سەرلەبەری کردەوەکانیانی هەڵوەشاندەوە.»

لەبارەی دووڕووانیشەوە فەرمووویەتی: ﴿إِنَّ الَّذينَ ارتَدّوا عَلى أَدبارِهِم مِن بَعدِ ما تَبَيَّنَ لَهُمُ الهُدَى الشَّيطانُ سَوَّلَ لَهُم وَأَملى لَهُم ﴿٢٥﴾ ذلِكَ بِأَنَّهُم قالوا لِلَّذينَ كَرِهوا ما نَزَّلَ اللَّهُ سَنُطيعُكُم فى بَعضِ الأَمرِ وَاللَّهُ يَعلَمُ إِسرارَهُم﴾ [محمد: ٢٥ - ٢٦]

«بەڕاستی ئەوانەی هەڵگەڕانەوە و پشتیان کرد لەدوای ئەوەشی کە هیدایەتیان بۆ ڕوون بوویەوە، شەیتان بۆی ڕازاوە و ئاسان و نزیک خستنەوە (٢٥) ئەوەش چونکە ئەوان بەوانەیان گوت کە ڕقیان بوویەوە لەوەی خوا دایبەزاندووە: لە هەندێک لەوەدا (ئەوەتان کە پێچەوانەی فەرمایشتی خوایە) گوێڕایەڵتان دەبین خواش بە شاردنەوەکانیان دەزانێت.»

قورطوبی لە ئیبن عەبباس و ضەححاک و سوددییەوە گواستوویەتییەوە کە ئەم ئایەتانە سەبارەت بە دووڕووانن. جا دووڕووان وەختێک تێکەڵی ئەو بێباوەڕانەیان کرد کە ڕقیان دەبوویەوە لەوەی خوا دایبەزاندووە، هەروەها بەڵێنیشیان پێ دان گوێڕایەڵیان بن لە بەشێک لەوەدا، نەخۆشیی ڕقبوونەوە لە وەحی گوازرایەوە بۆ دڵە نەخۆشەکانی ئەمانیش.

پەروەردگار دوابەدوای ئەوە دەفەرمووێت: ﴿فَكَيفَ إِذا تَوَفَّتهُمُ المَلائِكَةُ

یَضرِبونَ وُجوهَهُم وَأَدبارَهُم ﴿٢٧﴾ ذٰلِكَ بِأَنَّهُمُ اتَّبَعوا ما أَسخَطَ اللَّهَ وَكَرِهوا رِضوانَهُ فَأَحبَطَ أَعمالَهُم﴾ [محمد: ٢٧ - ٢٨]، «جا چۆن وەختێک کە فریشتەکان گیانیان دەستێنن لە دەموچاو و لە پشتیان دەدەن (٢٧) ئەوەش چونکە ئەوان شوێن ئەوە کەوتن کە خوا تووڕە دەکات و ڕقیان لە ڕەزامەندی ئەو بوویەوە جا کردەوەیانی هەموو هەڵوەشاندەوە.»

سەرنج بدە چۆن ئەوان ﴿قالوا لِلَّذينَ كَرِهوا ما نَزَّلَ اللَّهُ سَنُطيعُكُم في بَعضِ الأَمرِ﴾ «بەوانەیان گوت کە ڕقیان بوویەوە لەوەی خوا دایبەزاندووە: لە هەندێک لەوەدا گوێڕایەڵتان دەبین» ئیتر ئەم پەتای ڕقبوونەوەیان بۆ گوازرایەوە ﴿وَكَرِهوا رِضوانَهُ﴾ «ڕقیان لە ڕەزامەندیی ئەو بوویەوە»، واتە ڕقیان لەوە بوویەوە وا لە ڕەزامەندیی خوا نزیکیان دەکاتەوە، لەوەش شەریعەتی خوا و ئەوەی دایبەزاندووە، سا شایەن بوو کە وەختی مەرگیان، فریشتەکان لەو دەموچاوانەیان بدەن کە ڕوویان پێ کردە دوژمنانی وەحی و لە پشتیان بدەن کە پشتیان کردە وەحی خوا.

﴿فَأَحبَطَ أَعمالَهُم﴾ «ئەویش کردەوەیان هەموو هەڵوەشاندەوە» چەند ترسناکە ئەم فەرمایشتە! چەند مەترسیدارە سینەی یەکێکمان نەخۆشییەکی تێدا بێت کە ڕوونیی ژیانی لێ تەڵخ بکات و پاشانیش ڕۆژی دوایی چاکەکانی ببات بە ئاسماندا و تۆزەکەشی بۆ نەمێنێتەوە! وا مەزانە ئەم نەخۆشییە دەگمەنە، بڕیاری لەپێشینەی ئەوە مەدە کە تۆ بەتەواوی لێی سەلامەت و پاکی. لەگەڵمان وەرە برام لەگەڵمان وەرە خوشکم خوا چاوی لێتان بێت، با بزانین:

یەکەم: ڕووالەت و نیشانەکانی ئەم نەخۆشییە تاکوو پشکنینی خۆمانی پێ بکەین، پاشان:

دووەم: سەرەنجام و ئەنجامە تۆقێنەرەکانی بزانین با وریای بین، پاشان:

سێیەم: هۆکارەکانی بزانین کە لە ژیانی خۆماندا ڕیشەکێشیان بکەین، پاشان

چوارەم: چارەسەر و ڤاکسینەکەی بناسین و کەڵکی لێ وەربگرین کە ژیانمان ساف و دڵمان بۆ دوارۆژ سەلامەت بێت بە ویستی خوا سبحانە و تعالی. ئەم بەشەش دەخەینە کۆتاییی پەڕتووکەکەوە، لەوێدا کە باس لە پاراستنی نەفس و چارسەرکردنی لە دووڕوویی دەکەین.

## یەکەم: ڕوواڵەتگەلێکی ڕقبوونەوە لەوەی خوا تعالی دایبەزاندووە:

نموونەگەلێک لە واقیعەوە:

✿ مامۆستایەکی زانکۆ لە بواری فیزیادا بۆم دەگێڕێتەوە کە ١٣ ساڵە هاوسەرگیریی کردووە و منداڵی پێ نەبەخشراوە، هاوسەرەکەشی هانی داوە ئافرەتێکی دیکە بهێنێت. ئەویش کە لەگەڵ هەندێک کچدا دوواوە بۆ ئەم بابەتە، یەکێکیان پێی گوتووە: "من ئەگەر گومان بکەم ئایەتێک دزەی کردبێتە ناو قورئان، ئەوە ئایەتی دوو ژنە و سێ ژنە و چوار ژنەیە".

✿ یەکێکی دیکە دەڵێت: "من هەموو قورئانم خۆش دەوێت ئەو ئایەتە نەبێت کە ﴿وَاضْرِبُوهُنَّ﴾ «لێیان بدەن»ی تێدایە، کاتێک بەوە دەگەم ئیتر لەوەودوای ناڕۆم و نایخوێنمەوە"!

✿ سەیر نییە ئافرەتێک پێی ناخۆش بێت مێردەکەی ژنی بەسەر بهێنێت، یان لێی بدات، ئەمە هەستێکی ئاساییە و تاوانی تێدا نییە. بەڵام تاوان و کارەسات ئەوەیە ڕقی لە حوکمی فرەژنی، یاخود خودی حوکمی لێدان ببێتەوە، گومانی لە دانایی و دادپەروەریی خوا هەبێت لەوەدا، لەبری ئەوەی خۆی لە واتای ئەو لێدانە و ڕێساکانی تێ بگەیەنێت و لە حیکمەتی خواییی ئەم تەشریعە بکۆڵێتەوە.

**هۆشیاریدانێکی گرنگ:**

لێرەدا ئاگاداریدانێکی پێویست هەیە، مەرج نییە هەر کەس بکەوێتە سەرپێچیکردنی ئایەتێک لە ئایەتەکانی خوا، بە کینەدار و ڕقەبەر لەو ئایەتە دابنرێت، یان هەر کەسێک کە بانگەشەی ئەوەی کرد ڕەخنە لە تاک تاکی جێبەجێکردنەکان بۆ حوکمێک لە حوکمەکانی خوا دەگرێت، ئیدی ئەوە وا دابنرێت ڕقی لەو حوکمەی خوایە.

ئافرەتێک لەوانەیە بەهۆی لاوازیی خۆی، یان شوێنکەوتنی ئارەزوویەوە، ڕووتی و خۆڕازاندنەوەی لێ بووەشێتەوە، یان ئافرەتێکی دیکە قسەیەک بکات کە ڕووالەتی وا دیار بێت ڕقی لەو فەرمانەی خوایە بۆ لێدان لە ئافرەتی لاسار، لە کاتێکدا ئەگەر بێت و مشتومڕی ئەو قسەیەی کردوویەتی لەگەڵ بکرێت، ڕوون دەبێتەوە کە دان بە دانایی خودادا دەنێت و بگرە دان بە پێویستبوونی ئەو ڕەفتارەدا دەنێت لە زۆر بار و دۆخدا، بەڵام ڕقی لە جێبەجێکردنی ستەمکارانە و لادەرانەی هەندێک لە پیاوانە لەم لێدانەدا. جا لەسەرمانە کە خێرا بڕیاری ئەوە نەدەین فلانە پیاو یان ئافرەت ڕقبوونەوەی هەیە لە وەحی و دابەزێنراوی خوا، تەنیا بە کردنی تاوانەکە یان هاویشتنی هەندێک دەربڕین کە ئاگای لە مەترسی و لێکەوتەکانی نەبووە. بەڵکوو بە نەرمی بۆی ڕوون دەکەینەوە و بە شێوازی "لەوانەیە مەبەستت ئەوە بووبێت" بە جۆرێک بیرۆکەکانی بۆ ڕێک بخەینەوە و ئاڵۆسکاویی هەست و بڕواکانی بۆ لێک جوێ بکەینەوە و چەپۆکی کاریگەربوونی بە وێنە شێوێنراوە ڕۆتینییەکان و جێبەجێکارییە هەڵەکان و کارتێکەریی ڕاگەیاندنەکان، لەسەر سووک بکەین.

بەڵام، موسڵمانی ژیر لە هەمان کاتیشدا، ئەم بەهانانەی کە باسکران، نابێت بۆ خۆی بهێنێتەوە، بەڵکوو خۆی تۆمەتبار دەکات و لە دڵیدا پشکنین بۆ دەنکە خەرتالەیەکیش لەم نەخۆشییە دەکات. زرنگ و وریا ئەوەیە جڵەوی نەفسی توند بگرێت و کار بۆ پاش مردنی خۆی بکات. بۆ تۆ باش نییە

برام کە ئەم حوکمانەی ئیسلامت بەسەردا تێپەڕ بێت و واش بزانیت کارێکی باش دەکەیت و خۆت بە پاک بزانی لە تۆمەتی ڕقبوونەوە لە فەرمایشتی دابەزێنراوی خوا، لە پاشان و لە ڕۆژی ئەفسووسی دوارۆژدا پێ بزانیت کە ئەم دەردەت هەبووە، ئیدی پەشیمانیش دادی کەس نادات ئەو ڕۆژی!

جا سەرگەرمی ئەوە مەبە خەڵک بە ڕقبوونەوە لە وەحی خوا تۆمەتبار بکەیت، بڕۆ پشکنین بۆ دڵ خۆت بکە و بەر لە هەمووان چارەی دەروونی خۆت بکە، ئەوجا یاریدەری وانیش بە دڵیان پاک بکەنەوە لەمەڕ ئەوەی پەروەردگار دایبەزاندووە.

## دووەم: سەرەنجام و ئەنجامەکانی ڕقبوونەوە لەوەی (الله) دایبەزاندووە:

❁ لەدەستدانی ئیمان: چونکە پەروەردگار دەفەرموویێت: ﴿فَلا وَرَبِّكَ لا يُؤمِنونَ حَتّى يُحَكِّموكَ فيما شَجَرَ بَينَهُم ثُمَّ لا يَجِدوا في أَنفُسِهِم حَرَجًا مِمّا قَضَيتَ وَيُسَلِّموا تَسليمًا﴾ [النساء: ٦٥]، «دەی نا سوێند بە پەروەردگارت ئیمانیان نییە هەتا نەتکەنە داوەر لە هەرچی دەبێتە گێرە و کێشە لە نێوانیاندا و پاشانیش لە دەروونیاندا تەنگی و چورتمێک نەبێت لەمەڕ ئەو داوەرییەی تۆ و بە تەواوی ملکەچی ملکەچی نەبن.»

سەرنجی ئەو فەرمایشتەی بدە: ﴿ثُمَّ لا يَجِدوا في أَنفُسِهِم حَرَجًا مِمّا قَضَيتَ﴾ «پاشانیش لە دەروونیاندا تەنگی و چورتمێک نەبێت لەمەڕ ئەو داوەرییەی تۆ» جا وەختێک باوەڕ لە دڵدا نەما و زایە بوو، بێباوەڕی و دووڕوویی جێگەی دەگرنەوە.

❁ لەدەستدانی شیرینایی ئیمان: هەر کەس ڕقی لە دابەزێنراوی خوا ببێتەوە، هەرگیز شیرینیی ئیمان ناچەشێت. تەنیا ئەوەمان لەسەر نییە دابەزێنراوی

خوامان خۆش بوێت و بەس، بەڵکوو دەبێت فەرمایشتی خوا ئەو تەرازووەش بێت لەلامان کە کەس و بیر و پرەنسیپەکانیشی پێ دەپێوین و هەندێکمان بەوە خۆش دەوێت و هەر لەسەر ئەو بنەمایەش رقمان لە هەندەکەی تر دەبێتەوە. پێغەمبەرمان (ﷺ) فەرموویەتی: "سیان هەن لە هەر کەسدا هەبن شیرینایی ئیمان دەچەشێت: خوا و پێغەمبەری لە هەرچی جگە لەوانە خۆشتر بوێت، یەکێکی کە خۆشویست تەنیا لەبەر خوا خۆشی بوێت، پێی ناخۆش بێت بگەرێتەوە ناو بێباوەری وەک چۆن پێی ناخۆشە فرێ بدرێتە ناو ئاگرەوە."[1]

سەرنج بدە: "خۆش بوێت... خۆشی بوێت... پێی ناخۆش بێت" خۆشویستنێک و خۆسویستنێک و رقلێبوونەوەیەک هەر لەسەر بنەمای خۆشویستنی ئەوەی کە (الله) دایبەزاندووە. سا کەسێک کە ئەسڵەن رقی لەوە ببێتەوە خوا دایبەزاندووە، تەرازووی تێک دەچێت و شیرینیی ئیمانیش تا ماوە بە زاری دڵی ناکەوێت.

✿ هەڵوەشانەوەی کردەوەکان لە ئەنجامەکانی رقبوونەوەیە لەوەی خوا دایبەزاندووە: (الله) فەرموویەتی: ﴿وَالَّذِينَ كَفَرُوا فَتَعْسًا لَهُمْ وَأَضَلَّ أَعْمَالَهُمْ ۝ ذَلِكَ بِأَنَّهُمْ كَرِهُوا مَا أَنْزَلَ اللَّهُ فَأَحْبَطَ أَعْمَالَهُمْ﴾ [محمد: ٨ - ٩]، «ئەوانەشی کە بێباوەر بوون داوەشین و ماڵکاولی بەشیانە و کردەوەشیانی بە وێڵیدا برد (٨) ئەوەش چونکە ئەوان رقیان لەوە بووەیەوە خوا دایبەزاندووە و خواش کردەوەیانی هەڵوەشاندەوە.»

پەروەردگار خراپترین سیفەتی بێباوەرانی هەڵبژارد کە بووەتە هۆی هەڵوەشانەوەی کردەوەیانەوە، ئەوان رقیان لەوە بووەیەوە خوا دایبەزاندووە.

چەند ئایەت پاش ئەوەش هەمان سوورەت پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ذَلِكَ

---

(١) [البخاري: ١٦]

بِأَنَّهُمُ اتَّبَعوا ما أَسخَطَ اللَّهَ وَكَرِهوا رِضوانَهُ فَأَحبَطَ أَعمالَهُم﴾ [محمد: ٢٨]، «ئەوەش چونکە ئەوان شوێن ئەوە کەوتن کە خوا تووڕە دەکات و ڕقیان لە ڕەزامەندیی ئەو بوویەوە، ئەویش کردەوەیانی هەموو هەڵوەشاندەوە.». ڕقیان لە ڕەزامەندیی ئەو بوویەوە چونکە ڕقیان لەوە بووەتەوە کە دەبێتە مایەی ڕەزامەندیی ئەو، بەشێک لەوەشی ڕقیان لێی بووەتەوە ئەحکامی ئیسلام و دروشمەکانی ئیسلام و فەرمانەکانی پەروەردگار و نەهییەکانی.

هەڵوەشانەوەی کردەوەکان گەورەترین لێقۆمانە. وێنای بکەن کەسێک بینایەک پێکەوە بنێت بە ماندووبوونی چەند ساڵ و پاشانیش وێرانی بکات! وێنای بکەن ئافرەتێک جلێک چەندین شەو و ڕۆژ بەشوێن یەکدا خەریک بێ بچنێت، هەتا وەختێک کە لێبوویەوە شیتەڵی بکاتەوە و بیکاتەوە بە هەر ئەو دەزوولانەی سەرەتا! ئەمەیە نموونەی کەسێک کردەوەی چاکەی زۆر وەرێ دەخات، بەڵام بە ڕقبوونەوەی دڵی لەوەی خوا دایبەزاندووە، دەیکات بە تۆز و شوێنەوار و هیچی تر!

(الله) فەرموویەتی: ﴿وَلا تَكونوا كَالَّتي نَقَضَت غَزلَها مِن بَعدِ قُوَّةٍ أَنكاثًا﴾ [النحل: ٩٢]، «وەک ئەو ئافرەتە مەبن کە چنینی قایم و تۆکمەی وزەی خۆی تێدا بەخەرج بردبوو، شیتەڵ کردەوە.» فەرموویەتی: ﴿يا أَيُّهَا الَّذينَ آمَنوا أَطيعُوا اللَّهَ وَأَطيعُوا الرَّسولَ وَلا تُبطِلوا أَعمالَكُم﴾ [محمد: ٣٣]، «ئەی ئەوانەی باوەڕیان هێناوە، گوێڕایەڵی خوا بن و گوێڕایەڵی پێغەمبەر بن و کردەوەکانتان بەتاڵ مەکەنەوە.» هۆشیاریدان و ئاگادارییەک لەلایەن پەروەردگارەوە بۆ ژیران. وریا بە لەوانە نەبیت کە خوا لەبارەیانەوە فەرموویەتی: ﴿وَقَدِمنا إِلى ما عَمِلوا مِن عَمَلٍ فَجَعَلناهُ هَباءً مَنثورًا﴾ [الفرقان: ٢٣]، «هاتینە سەر هەرچی کردەوەیەکیش کە کردبوویان، جا هەموویمان کردە تۆزی بابردە و پەرشوبڵاو.»

✿ ڕسوایی و بەدبەختی ئەنجامی چوارەمە لە ئەنجام و بەرەکانی ڕقبوونەوە

لەوەی خوا دایبەزاندووە: پاداشتێکی پڕ بە پێست بۆ ئەم ڕقبوونەوەیە، جا هەر کێ ئەم نەخۆشییەی لە دڵیدا هەڵگرتبێت، هەرگیز شایەنی ڕێز و سەربەرزی نییە، (الله) دەفەرمووێت: ﴿يا أَيُّهَا الَّذينَ آمَنوا إِن تَنصُرُوا اللَّهَ يَنصُركُم وَيُثَبِّت أَقدامَكُم﴾ [محمد: ٧]، «ئەی ئەوانەی باوەڕیان هێناوە ئەگەر ئێوە خوا سەر بخەن ئەویش ئێوە سەر دەخات و پێتان چەسپاو دەکات.»، ئەم قسەیە بۆ ئەو باوەڕدارانەیە وا خوا و فەرمایشتی خوا و شەریعەت و دروشمی ئەویان خۆش دەوێت. پاشان لە ئایەتی ڕاستەوخۆ دوای ئەو بڕوانە: ﴿وَالَّذينَ كَفَروا فَتَعسًا لَهُم وَأَضَلَّ أَعمالَهُم﴾ [محمد: ٨ - ٩]، «ئەوانەشی کە بێباوەڕ بوون داوەشین و ماڵوێرانی بەشیانە و کردەوەشیانی بە وێڵیدا برد.» جا ئیماندار بە سەرخستنی بۆ خوا و خۆشویستنی بۆ ئایینەکەی و گرتنەبەری هۆکارەکان، سەردەکەوێت، بێباوەڕیش دەبەزێت و دادەوەشێت و ماڵی وێران دەبێت بە ڕقبوونی لەوەی خوا دایبەزاندووە. جا چۆن ئەگەر باوەڕدار هەنگاو بۆ ئەم ڕقبوونەوەیە لە وەحی خوا بنێت.

هەمان شێوە لەو فەرمایشتەی پەروەردگار بڕوانە: ﴿لَقَد رَضِيَ اللَّهُ عَنِ المُؤمِنينَ إِذ يُبايِعونَكَ تَحتَ الشَّجَرَةِ فَعَلِمَ ما في قُلوبِهِم فَأَنزَلَ السَّكينَةَ عَلَيهِم وَأَثابَهُم فَتحًا قَريبًا﴾ [الفتح: ١٨]، «بەڕاستی خوا لە باوەڕداران ڕازی بوو وەختێک پەیمانیان بە تۆ دەدا لە ژێر درەختەکەدا جا زانی چی لەناو دڵیاندایە سا ئۆقرە و ئارامی دابەزاندە سەریان و بە فەتح و سەرخستنێکی نزیکیش پاداشتی دانەوە.»

لەوەشی کە لە دڵیاندایە: خۆشویستنی ئەوەی خوا دایبەزاندووە.

زانیتان باس لە چی دەکەین؟! سەبارەت بە نەخۆشییەک کردەوە هەڵدەوەشێنێتەوە و ئیمان دەسووتێنێت و شیرینابییەکەی لەبار دەبات و دەشبێتە مایەی داهاتنی ڕسوایی و بەدبەختی. سا جێی خۆیەتی ڕیشەکانی ئەم گرفتە مەترسیدارە لە خۆماندا بزانین و چۆنیش نەشونمای کردووە، تا لە بینەقاقای بگیرێنین و ئاوێک بەو ئاگرەدا بکەین بەر لەوەی بمانسووتێنێت.

## هۆشیاریدانێکی گرنگ:

دەشێت بەندە لە دەروونی خۆیدا هەست بە بەرهەڵستییەک بکات لەمەڕ هەندێک ئایەت، کە ڕەنگدانەوەی کەڵەکەبوونی پەروەردە و ڕاگەیاندن و ژینگەی دەوروبەرە، بەڵام درک بەوە دەکات گرفت لە دڵی ئەمدایە نەک لە فەرمایشتی پیرۆز و بەرزی (الله)دا، پەناش دەباتە بەر خوا کە شیفای بدات لەم بەرهەڵستی و پێنامۆبوونە، بە شوێن زانستی بەسوودیشدا دەچێت ملکەچ بۆ حەق و پێداگر لەسەر ئەوەی دانی پێدا بنێت هەر چەند پێچەوانە ئارەزوویشی بێت، لە دەرگەی پیاوچاکان دەدات بەشکوو هاوکاری بن بەسەر نەفسیدا. جا ئەوەی ئەمە هەوڵ و هیممەتی بێت، ستایشکراو و خاوەن پاداشتە.

بەڵام، مەترسی ئەوەیە بەرهەڵستییەکە لە دڵدا بگیرسێتەوە و جێ خۆش بکات و خاوەنەکەشی کار نەکات بۆ دەربازبوون لێی، خۆ لەوانەیە هەوڵێکی دەربازبوون بدات، بەوەی ملی ئیسلام بۆ ئارەزووەکانی خۆی با بدات! بە شوێن بەناو زانا و دیندارانێکدا بگەڕێت لە بانگخوازانی گومڕایی کە دووبارە لێکدانەوەی ئایینی بۆ دامەزرێنن هاوتەریبی هەوەسی خۆی. حەقیقەتی پڕۆسەکەش ئەوەیە کە دەقەکان لە جێگەی خۆیان بترازێنن و نکۆڵی لەو واتایانەی ئایەتەکان بکەن کە ئوممەت بەدرێژاییی چەندان سەدە لەسەری کۆک و کۆڕا بووە، نکۆڵی لە ئەحکامە ئاشکرا و بێ پێچوپەناکانی ئیسلام بکەن. وێنەی ئەم کابرای دوایی، هەر بەڕاستی ڕقی بووەتەوە لەوەی خوا دایبەزاندووە و دڵی لکاوە بە نموونەیەکی شێواو و گونجاوی ئارەزووی خۆیەوە، ئیتر خۆی سازاندبێتی یان بەتاڵکاران بۆیان سازاندبێت.

سا وەرن هۆکارەکانی ئەم دەردە ببینینەوە و پەنجەی لەسەر دابنێین، تاکوو بیخەینە ژێر ئابلۆوقە و دەربازمان بێت لێی.

## سێیەم: هۆکارەکانی ڕقبوونەوە لەوەی خوا دایبەزاندووە:

ئەم نەخۆشییە ئەنجامی کۆمەڵێک کارتێکەرە کە ساڵانێک کاریان لەسەر نەفسی مرۆڤەکە کردووە هەتا گەیاندوویانەتە ئەم حاڵەتەی هەستکردن بە ڕقبوون لەوەی خوا دایبەزاندووە، گرنگترینی ئەم کارتێکەرانەش:

١. لاڕێچوونی تەوەر و پێوەرەکان:

تەوەر لە ئیسلامدا تەنیا خوا و ڕۆژی دواییە. لە کاتێکدا کە تەوەر لە کولتووری شارستانییەتی زاڵی جیهانیدا بریتییە لە مرۆڤ و ئارەزووەکانی. پێوەرە فەرمانڕەوا و ڕەهاکانیش لە ئیسلامدا بریتین لە گوێڕایەڵی خوا و پێغەمبەر کە لە هەمان کاتدا بەرپاکردنی ڕاستی و دادگەریش دەنوێنن، بەڵام لە ڕۆشنبیریی شارستانییەتی زاڵدا: ئازادی و یەکسانین.

زۆرێک لە ڕۆڵەکانی موسڵمانان لە میانەی پەروەردە و پەیڕەوە فێرکارییەکان و ڕاگەیاندنەوە، ڕاستە و پێوەری تەوەربوونی مرۆڤ و پێوەربوونی ئازادی و یەکسانی لە دڵیدا پێک دێت، ئیدی بەوە بڕیار بەسەر هەر شتێکدا دەدات، لەو شتانەشی کە دەیباتە ژێر هەژموون و چەپۆک و بڕیاردانی ئەو پێوەرانەوە: ئایینەکەی خۆی. ئەنجام ئەگەر شتێکی بینی لەوەی خوا دایبەزاندووە و لە ئەحکامی خوا، کە گونجاوی ئەم ڕاستەیە نەبوو؛ گومانی لێ دەکات و ڕقی لێی دەبێتەوە، ئەسڵەن بە خەیاڵیشیدا نایەت کە لە پێشدا دادگایی ئەم ڕاستەیە خۆی بکات و بکۆڵێتەوە لە ڕاستودروستبوونی بەر لەوەی بەکاری بهێنێت بۆ دادگاییکردنی شتەکانی دیکە.

لە زنجیرەی ئافرەت و زنجیرەی سەربەرز بە بە ئیسلامەکەتدا، بەتایبەتیی تەوەربوونی مرۆڤ و پێوەربوونی ئازادی و یەکسانیمان لە ڕووی عەقڵ و شەرع و واقیعیشەوە خستە ڕوو، ڕوونیشمان کردەوە چۆن شارستانییەتە زاڵەکان سەرەنجامی ئەم ڕێگەیەیان نەگبەتی و سەرگەردانی مرۆڤ و زایەکردنی

بەندایەتیش بووە بۆ پەروەردگار، نە حەقیان بەرپا کرد نە دادگەری و نە ئازادی و نە یەکسانیش.

﴿وَمَن أَعرَضَ عَن ذِكري فَإِنَّ لَهُ مَعيشَةً ضَنكًا وَنَحشُرُهُ يَومَ القِيامَةِ أَعمى﴾ [طه: ١٢٤]، «هەر کەسیش پشت لە یادی من بکات، گوزەرانێکی تەنگ و توند و تاڵاوی بەشیەتی.»

٢. نەزانین لە ئایین و شێوانی وێنەی زەینی سەبارەت بە ئەحکامی:

زۆرینەی موسڵمانان تەنیا کەمێک دەزانن لەبارەی جوانییەکانی ئیسلام و دانایی و میهر و دادگەری لەو حوکمانەیدا کە وێنەیان لەلای خەڵک شێوێنراوە، وەک ئەحکامە وردەکارییەکانی شەریعەت و جیهاد و ئەحکامی خێزانی موسڵمان و دەمسپییەتیی پیاو بەسەر ژنەوە. ئەوەشی دەیزانن لەبارەیەوە دەشێت وێنە زەینییەکەیان لەسەری شێوا بێت، لە ئەنجامی دەستتێخستنی بەرنامەدارێژراوی ڕاگەیاندن و ئەو پەیڕەوکارییە لادەرانەی بەناحەق دەدرێنە پاڵ ئیسلام، ئیدی لە دزەکردووانەوە بێت، یان ئەوانەی بە دیندار وەسف دەکرێن، یاخود ئەوانەی خۆ لە گوتاری ئایینی دەخزێنن بەبێ بوونی دانایی و زانست لەسەر ئەو پێگەیەی داگیری دەکەن.

سەرجەم ئەمە لە کاتێکیشدا کە نموونەیەکی ئیسلامی تەواوی دروستیان لەسەر زەوی واقیع نەدیوە.

باشە گریمان تۆ زانیت حەقیقەتی فەرمانەکەی خوا و پێغەمبەر چییە و هێشتا پێچەوانەشی بوویت، ئەمە دەمانباتە سەر هۆکاری سێیەمی ڕقبوونەوە لەوەی خوا دایبەزاندووە ئەویش:

٣. سەرپێچیکردنی فەرمانی خوا و پێغەمبەرەکەی:

پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿فَليَحذَرِ الَّذينَ يُخالِفونَ عَن أَمرِهِ أَن تُصيبَهُم فِتنَةٌ

أَو يُصيبَهُم عَذابٌ أَليمٌ﴾ [النور: ٦٣]، «با ئاگادار بن ئەوانەی سەرپێچی لە فەرمانی ئەو دەکەن کە ئاشووبێکیان تووش بێت یان سزایەکی بەئێش.» ترساندنێک لەلایەن خواوە بۆ هەر کەس سەرپێچیی پێغەمبەرەکەی (ﷺ) بکات کە تووشی فیتنە دەبێت. خراپترین فیتنەش فیتنەی دڵە بە جۆرێک کە تەرازووی تێک بچێت و ڕقی لەوە بێتەوە خوا دایبەزاندووە. ئیبن کەثیر دەفەرمووێت: "واتە با وریا بێت و بترسێت ئەوەی سەرپێچیی شەریعەتی پێغەمبەر دەکات دەرەکی یان ناوەکی (کە تووشی ئاشووبێک بێت) واتە لە دڵیدا، بە بێباوەڕی، یان دووڕوویی، یان بیدعە."

﴿فَلَمّا زاغوا أَزاغَ اللَّهُ قُلوبَهُم وَاللَّهُ لا يَهدِي القَومَ الفاسِقينَ﴾ [الصف: ٥]، «جا وەختێک ئەوان لایاندا خواش دڵیانی لادا و هەڵدێرا کە خوا ڕێنوێنی لەڕێدەرچووان ناکات.»

با ئەمەی لەبیر بێت کەسێک کە تەماشای ئەو فیلمانە دەکات بڵاوکردنەوەی پەیوەندیی دڵداریی دەرەوەی هاوەسەرگیرییان تێدایە، هاوسەرگیرییەک خوا حەڵاڵ و پاکی گەڕاندووە و مۆڵەتی پێ داوە، فیلمانێک کە کوشتنی غیرە و شەرمیان تێدایە و ڕووقایمی بە ڕووی سنوورەکانی خوادا دەکەن: ﴿وَمَن يَتَعَدَّ حُدودَ اللَّهِ فَأُولئِكَ هُمُ الظّالِمونَ﴾ [البقرة: ٢٢٩]، «هەر کەسانێکیش سنوورەکانی خوا تێپەڕێنن ئەوانەن ستەمکار.» جا دەرگەی دڵ ئاوەڵا دەبێت و دەرهێنەرانی ئەم فیلمانە چییان بوێت لە ڕازاندنەوەی تاوان و سەرپێچی و لەڕێدەرچوون و ناشیرینکردنی ئەحکامی خوا، هاوردەی ناوی دەکەن.

با ئەمەی لەبیر بێت ئافرەتێکیش کە فەرمانی خوا ڕەچاو ناکات لە داپۆشراوی و شەرم و سنووردارکردنی پەیوەندی و مامەڵەکردنەکانی لەگەڵ ئەوانی دیکەدا، لەوانەیە خۆی ببینێت لە سەرەتای ڕێگەدا کە دان بە تاوانی خۆیدا دەنێت و داوای دوعای هیدایەت لە خەڵک دەکات. کەچی پاش

دەمێک دەبینیت گرنگیی سنوورەکانی خوای لەلا کەم بووەتەوە لە تەواوی ڕووالەت و مامەڵەیدا و ئیدی دەستیشی داوەتە ڕەخنەگرتن لە ئافرەتانی دینداری بەڕووالەت و زەقکردنەوەی کەموکووڕی و هەڵەکانیان. لە دواییشدا کاری ئەوە دەگات کە ئیدی ڕقی لە سنوورەکانی خوا ببێتەوە و بە بەردی سەر ڕێگەی ئافرەت و کەمکردنەوەی بەهای تەماشایان بکات، گاڵتەش بە بانگخوازانی دەکات و پاڵپشتی هەیە بۆ ئەوانەی ئایین دەگۆڕن و نکۆڵی لەم سنوور و ڕێسایانە دەکەن و قسە و گوتاریان پۆست و شەیر دەکات. تەواو ئیتر ئەو دڵانە بە دەردی تاوانی خۆیان چوون و هەڵدێران و هەر بەڕاستی تووشی ئەو فیتنەیە بوون کە لە ئایەتەکەدا هاتووە.

دەی تۆ کابرا کە لەسەر تاوانێک بەردەوامیت و پەنا نابەیتە بەر تەوبەکردن: بەو حاڵەتەوە خۆت دەدەیتە بەر ڕەشبوونی دڵ و تووشبوونی بە نەخۆشیی ڕقبوونەوە لەوەی خوا دایبەزاندووە. ئەمەش گەلێک لە تاوانی سەرپێچییەکە خۆی مەترسیدارترە. هەرگیز تاوان و گومان لێک دوور مەبینە، بەو قسانەدا بچۆرەوە کە لەژێر سیفەتی گومانکردن لە ئاییندا تۆمارمان کردن.

٤. ڕاگەیاندنی ئاڕاستەکراو:

ڕاگەیاندنیش بەوەی تێیدایە لە هەواڵ، زنجیرە دراما و فیلمەکان، زۆرجار دروشمەکانی ئیسلام بە نەفامی و هەژاری و خوێنڕێژی و ڕەوشت ناشیرینی دەبەستێتەوە، لە هەمان کاتدا کە پێشکەوتنی زانستی و جوانی و دەوڵەمەندی و بەختەوەری، بە ڕۆژاواگەرایی و دابڕان لە وەحی دەبەستێتەوە، کۆمەڵێک وێنە دەخاتە بەشی نائاگا و پشتەوەی زەینەوە، کە لە دواییدا هەست و پەرچەکردار و خوێندنەوەت لەمەڕ شتەکان پێک دەهێنن، کە ڕاستەوڕاست پێچەوانەی بڕوا ڕاستەقینەکانی خۆتن و کاریگەرییان لەسەر ڕەفتارت لاواز دەکەن.

ڕاگەیاندن خەریکی ڕازاندنەوەی ئەوەن کە خوا حەرام و نابووتی کردووە، بە

یادی ئەو قسەیەی شەیتانەوە کە گوتی: ﴿لَأُزَيِّنَنَّ لَهُمْ﴾«بۆیان دەڕازێنمەوە».
سا ئەو دەروونانەی کە خۆشەویستیی حەرامیان قووتداوە ئیتر هەست بە ئێسک قورسی و ناچیزەیی دەکەن سەبارەت بەوەی خوا دایبەزاندووە و دەبینن جیاوازە لەوەی ئەمان حەزیان پێیەتی و لێی ڕاهاتوون.

توێژینەوەکانی ناوەندە ڕۆژاواییەکانی پلاندانانی ستراتیجی، بە چڕوپڕی و بە دەق باس لە شکاندنی شکۆ و متمانەداریی شەریعەت و بانگخوازانی دەکەن.

٥.نەزانین بە واقیعی ئەو کۆمەڵگەیانەی دابڕاون لەوەی خوا دایبەزاندووە:

بەشێک لە ڕازاندنەوەی ڕاگەیاندن بۆ ژیانی بێئاگابوون لە وەحی، ئەوەیە کە گیرۆدەبوونەکانی ئەو کۆمەڵگە بێئاگایانە ناخاتە ڕوو. زۆرێک لە موسڵمانانیش دیدگە و ڕووانینی سەبارەت بەم کۆمەڵگەیانە لە ڕێگەی فیلمەکانی هۆلیوود و نێتفلێکسەوە پێک دێت. جا کاتێک موسڵمان نەزان بێت بە ئایینەکەی خۆی و وێنەی زەینیشی بۆ ئەحکامی بشێوێت، لە بەرانبەریشدا حاڵی کۆمەڵگە غافڵەکان لە دابەزێنراوی خوا، لەلای بڕازێنرێتەوە و تەوەر و پێوەرەکانی گرفتار ببن و فیترەتی لابدات و بەوەش ئەو تەرازووەی تێک دەچێت کە لە ڕێگەیەوە هەڵسەنگاندن دەکات لەنێوان ئەوەی خوا دایبەزاندووە و لە بەرانبەریشیدا بێئاگابوون لەوەی خوا دایبەزاندووە؛ هەموو ئەمە مایەی دروستبوونی ڕقبوونەوەیە لە دڵیدا لەمەڕ ئەوەی خوا دایبەزاندووە.

٦.گوێڕایەڵیکردنی ئەوانەی ڕقیان لەوە دەبێتەوە کە خوا دایبەزاندووە:

ئەم ڕقبوونەوەیە لە لایەنی گوێڕایەڵکراوەوە دەگوێزرێتەوە بۆ لایەنی گوێڕایەڵیکەر، لەوانەوە کە گوێڕایەڵییان کراوە بۆ ئەوانەی کە گوتیان: (ستطيعكم في بعض الأمر - لە هەندێک لەوەدا گوێڕایەڵتان دەبین) وەک لە

سەرەتای سیفەتی "ڕقبوونەوە لەوەی خوا دایبەزاندووە"دا ڕوونمان کردەوە.

شێخ موحەممەد ئەمین شەنقیطی ڕەحمەتی خوای لێ بێت لە ڕاڤەی ئەم ئایەتانە ٢٥-٢٨ سووڕەتی موحەممەددا دەفەرمووێت: "بزانە کە هەموو موسڵمانێک لەم ڕۆژگارەدا لەسەریەتی لەم ئایەتانەی سووڕەتی موحەممەد تێ بفکرێت و ورد ببێتەوە و وریایی تەواو لەو هەڕەشەیەی ناوی وەربگرێت؛ چونکە زۆرێک لەوانەی خۆیان دەدەنە پاڵ موسڵمانان بێشک کە کەوتوونەتە ناو ئەو هەڕەشە سەختەی ناوی؛ چونکە زۆرینەی بێباوەڕان لە ڕۆژهەڵاتییان و ڕۆژئاواییيان ڕقیان دەبێتەوە لەوەی خوا دایبەزاندووەتە سەر موحەممەدی پێغەمبەر (ﷺ)، وا ئەمەش قورئان و ئەمەش سوننەتانەی کە پێغەمبەر (ﷺ) قورئانی پێ ڕوون کردووەتەوە؛ جا هەر کەس بەو بێباوەڕانە کە ڕقیان لەوەیە خوا دایبەزاندووە بڵێت: ﴿سَنُطِيعُكُم فِى بَعضِ الأَمرِ﴾ «گوێڕایەڵتان دەبین لە هەندێک لەوەدا» ئەوا دووچاری هەڕەشەی ئەم ئایەتە بووەتەوە، لەویش قوڕبەسەرتر ئەوەیە پێیان بڵێت: (سنطيعكم في كل الأمر - لە هەموو ئەوەدا گوێڕایەڵتان دەبین) وێنەی ئەوانەی شوێن دەستووره دانراوەکان دەکەون و بەوە گوێڕایەڵی خۆیان دەسەلمێنن بۆ ئەوانەی ڕقیانە لەوەی (الله) دایبەزاندووە؛ سا بێشک ئەوانەن کە فریشتەکان وەختێک گیانیان دەسپێرن ﴿يَضرِبونَ وُجوهَهُم وَأَدبارَهُم﴾ «لە دەموچاو و لە پشتیان دەدەن»."

# ٤- بەدۆستگرتن و پشتیوانیکردن لە موشریکان

"تولي" بریتییە لە سەرخستن و نزیکخستنەوە و خۆشویستنی ئایینی. ئەوەی پشتیوانی موشریکان دەکات و سەریان دەخات بەسەر موسڵماناندا و بایەخ بە بێباوەڕییەکەیان نادات و بگرە لەوانەیە خۆشیشی بوێت و قبووڵیشی بکات و پێشی ڕازی بێت.

پەروەردگار گەلێک ئایەتی بەم سیفەتەی موناfیقان تایبەت کردووە.

هۆکارە ڕاستییەکانی:

ئەم سیفەتەش بە هەمان شێوە بەچکەی بەگومانبوونە لە ئایین. پەروەردگار تبارك و تعالى فەرموویەتی: ﴿تَرى كَثيرًا مِنهُم يَتَوَلَّونَ الَّذينَ كَفَروا لَبِئسَ ما قَدَّمَت لَهُم أَنفُسُهُم أَن سَخِطَ اللَّهُ عَلَيهِم وَفِي العَذابِ هُم خالِدونَ ﴿٨٠﴾ وَلَو كانوا يُؤمِنونَ بِاللَّهِ وَالنَّبِيِّ وَما أُنزِلَ إِلَيهِ مَا اتَّخَذوهُم أَولِياءَ وَلٰكِنَّ كَثيرًا مِنهُم فاسِقونَ﴾ [المائدة: ٨٠ – ٨١]، «زۆرێکیان دەبینیت دۆستایەتی و پشتیوانی لە بێباوەڕان دەکەن، خراپترین کارێکە هەنگاوی بۆ دەنێن کە خوا (بەوە) خەشمی لێ گرتوون و بە نەمریش لە سزادان (٨٠) خۆ ئەگەر بڕوایان بە خوا و بە پێغەمبەر و ئەوەی دابەزیوەتە سەری هەبوایە ئەوانەیان بە دۆست و پشتیوان نەدەگرت، بەڵام زۆرێکیان لەڕێدەرچوو و فەرمانشکێنن.»

ئەم ئایەتە هەرچەندە لەسەر بێباوەڕانی بەنی ئیسرائیل دابەزیوە، بەڵام بنچینەیەکی گشتی داناوە کە جوولەکە و جگە لەوانیش دەگرێتەوە، کە هەر کەس دۆستایەتی و پشتیوانی لە بێباوەڕان بکات ئیمانی نییە. وێڕای ئەوەشی موجاهید ڕەحمەتی خوای لێ بێت -کە لە هاوەڵانی تەفسیرە- سەبارەت بەم

فەرمایشتەی پەروەردگار ﴿تَرى كَثيرًا مِنهُم يَتَوَلَّونَ الَّذينَ كَفَروا﴾ «زۆرێکیان دەبینیت دۆستایەتی و پشتیوانی لە بێباوەڕان دەکەن» فەرموویەتی: "مەبەست بەوە دووڕووانن."

هەروەها بڕوانە لەو فەرمایشتەی دیکەی پەروەردگار: ﴿لا تَجِدُ قَومًا يُؤمِنونَ بِاللَّهِ وَاليَومِ الآخِرِ يُوادّونَ مَن حادَّ اللَّهَ وَرَسولَهُ﴾ [المجادلة: ٢٢]، «خەڵکێک نابینیتەوە بڕوایان بە خوا و ڕۆژی دوایی هەبێت، دۆستایەتی و پشتیوانی لەوانە بکەن کە بەربەرەکانێی خوا و پێغەمبەرەکەی دەکەن.»

جا مرۆڤی دووڕوو چونکە بڕوایەکی دروستی بە خوا و بە ڕۆژی دوایی نییە، سەرجەم پێوەر و لێکدانەوەکانی زەمینین، وەختێک کە دەبینێت هێزی ماددی لەدەست بێباوەڕاندایە، دۆستایەتی و هاوپەیمانییان دەکات بەشکوو لەو بڵندی و بەرزییەی واندا بەشدار بێت: ﴿بَشِّرِ المُنافِقينَ بِأَنَّ لَهُم عَذابًا أَليمًا ۝١٣٨ الَّذينَ يَتَّخِذونَ الكافِرينَ أَولِياءَ مِن دونِ المُؤمِنينَ أَيَبتَغونَ عِندَهُمُ العِزَّةَ فَإِنَّ العِزَّةَ لِلَّهِ جَميعًا﴾ [النساء: ١٣٨ - ١٣٩]، «مژدە بە دووڕووان بدە کە سزایەکی بەئێشیان بۆ هەیە (١٣٨) ئەوانەی دوور لە باوەڕداران دۆستایەتی و پشتیوانی لەگەڵ بێباوەڕان دادەمەزرێنن، ئەرێ بەتەمای بڵندی و عیززەتن لەلای ئەوان، سا بەدڵنیاییەوە عیززەت و هێز هەموو بۆ خوایە و بەدەست ئەوە.»

وەک چۆنیش بینیمان سیفەتە دووڕووییەکانی پێشووتر پێوەستییان بە نەخۆشیی دڵەوە هەبوو، بە هەمان شێوە غاردان و هەڵپەی موونافیق بۆ دامەزراندنی دۆستایەتی و کەینەوبەینە لەگەڵ بێباوەڕان، لە نەخۆشبوونی دڵییەوە سەرچاوەی گرتووە. پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿فَتَرَى الَّذينَ في قُلوبِهِم مَرَضٌ يُسارِعونَ فيهِم﴾ [المائدە: ٥٢]، «جا دەبینیت ئەوانەی دڵیان نەخۆشی تێدایە پەلە و هەڵپەی ناو ئەوانیانە (ناو بێباوەڕان کە پەیوەندییەکیان لەگەڵیان هەبێت).»

## بیانووە ڕووالەتی و ئاشکراکراوەکانیان:

١) ئەوەی کە وازهێنان لەم پەیوەندی و پاڵپشتییەی بێباوەڕان تووشی لێقەومان و کارەساتیان دەکات و ڕاپێچی ڕووبەڕووبوونەوەیان دەکات لەگەڵ هێزێکدا کە چاری ناکرێت: ﴿فَتَرَى الَّذينَ في قُلوبِهِم مَرَضٌ يُسارِعونَ فيهِم يَقولونَ نَخشى أَن تُصيبَنا دائِرَةٌ﴾ [المائدە: ٥٢]، «جا دەبینیت ئەوانەی نەخۆشی لە دڵیاندایە پەلە و هەڵپەی لای ئەوانیانە، دەڵێن دەترسین تووشی گێچەڵ و ئاشووبێک بێین.»

ئایەتەکە لە باسی حاڵی عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلوول و بەرگریکردنی لە جوولەکەی بەنی قەینوقاع دابەزیوە و ئەوەشی کە گوتی: "من پیاوێکم لە گێچەڵ زۆر دەترێسم."

٢) ئەوەی کە بەم کەینوبەینە و کارەیان هەوڵیان بۆ چاکسازیی نێوانی خەڵکی و ژیانێکی ئاشتییانەیە، کەچی لە هەمان کاتیشدا دوژمنایەتی و پیلانگێڕی لە باوەڕداران تاو دەدەن.

پەروەردگار دەفەرمووێت: ﴿وَإِذا قيلَ لَهُم لا تُفسِدوا فِي الأَرضِ قالوا إِنَّما نَحنُ مُصلِحونَ﴾ [البقرة: ١١]، «وەختێکیش پێیان بگوترێت خراپە مەنێنەوە لەسەر زەویدا، دەڵێن ئێمە تەنیا چاکسازین.»

موحەممەدی کوڕی ئیسحاق لە ئیبن عەبباسەوە گێڕاوێتییەوە لە ڕاڤەی ئەم ئایەتەدا: "واتە ئێمە تەنیا دەمانەوێت نێوانی هەر دوو گرۆ باوەڕداران و ئەهلی کیتاب خۆش بکەین." پەروەردگاریش وەڵامی ئەم بانگەشەیان دەداتەوە و ئەم دۆستایەتییەیان بە خراپەنانەوە لەقەڵەم دەدات کە دەفەرمووێت: ﴿أَلا إِنَّهُم هُمُ المُفسِدونَ وَلٰكِن لا يَشعُرونَ﴾ [البقرة: ١٢]، «بەڕاستی هەر ئەوانن خراپەنێرەوە، بەڵام هەستی پێ ناکەن.»

بە هەمان شێوە لە ئایەتەکەی دیکەدا لەپاش ئەوەی پەروەردگار لەسەر

باوەڕدارانی فەرز کرد دۆستایەتی و پشتیوانی یەکدی بکەن و ڕوونیشی کردەوە کە بێباوەڕانیش دۆست و پشتوپەنای یەکترین، فەرمووی سبحانە: ﴿إِلَّا تَفعَلوهُ تَكُن فِتنَةٌ فِي الأَرضِ وَفَسادٌ كَبيرٌ﴾ [الأنفال: ٧٣]، «ئەگەر وا نەکەن ئاشووب و خراپەیەکی گەورە لەسەر زەویدا بەرپا دەبێت». جا خراپە و فیتنە لەوەدایە دۆستایەتی و پشتیوانی بۆ موشریکان بێت و لە باوەڕداران بپچڕێنرێت.

## هاوکاریکردنی دووڕووان بۆ بێباوەڕان لەدژی موسڵمانان:

پەروەردگار لە وەسفی دووڕوواندا دەفەرمووێت: ﴿وَإِذا لَقُوا الَّذينَ آمَنوا قالوا آمَنّا وَإِذا خَلَوا إِلى شَياطينِهِم قالوا إِنّا مَعَكُم إِنَّما نَحنُ مُستَهزِئونَ﴾ [البقرة: ١٤]، «وەختێک دەگەن بە باوەڕداران دەڵێن ئێمەش باوەڕدارین، وەختێکیش دەچنەوە لای شەیتانەکانی خۆیان دەڵێن ئێمە لەگەڵ ئێوەین ئێمە تەنیا گاڵتە (بەوانە) دەکەین.»

هەروەها دەفەرمووێت: ﴿يا أَيُّهَا الرَّسولُ لا يَحزُنكَ الَّذينَ يُسارِعونَ فِي الكُفرِ مِنَ الَّذينَ قالوا آمَنّا بِأَفواهِهِم وَلَم تُؤمِن قُلوبُهُم وَمِنَ الَّذينَ هادوا سَمّاعونَ لِلكَذِبِ سَمّاعونَ لِقَومٍ آخَرينَ لَم يَأتوكَ﴾ [المائدە: ٤١]، «ئەی پێغەمبەر سەغڵەتت نەکەن ئەوانەی پەلە و هەڵپەی ناو کوفریانە لەوانەی کە بەدەم گوتیان باوەڕمان هێناوە و دڵیان باوەڕی نەهێنا و لەوانەشی جوولەکەن کە زۆر گوێگرن بۆ درۆ و زۆر گوێگرن بۆ خەڵکێکی دیکە کە نەهاتوونەتە لای تۆ.»

ئەوەی دەفەرمووێت: ﴿سَمّاعونَ لِقَومٍ آخَرينَ لَم يَأتوكَ﴾ «زۆر گوێگرن بۆ خەڵکێکی دیکە کە نەهاتوونەتە لای تۆ.»

لەسەری گوتراوە: "واتە گوێگر و گوێڕایەڵ و گوێلەمستی گەورەکانی خۆیانن، کە کاریان لەسەر درۆ و ستەم و گومڕایی ڕاوەستاوە". بەم پێیە واتای (سماعون - زۆر گوێگرن) یانی گوێگریی گوێڕایەڵبوون و لاساییکردنەوە و

جاشایەتیکردن بۆ ئەو خەڵکە گومڕاکەرەی دیکە.

ئیبن کەثیر دەفەرمووێت: "گوتراویشە مەبەست ئەوەیە گوێ لە قسە دەگرن و دەیگەیەننە خەڵکانێکی دیکە لە دوژمنانت کە ئامادەی لای تۆ نابن و لەوێ نین." واتە گوێ لە پێغەمبەر (ﷺ) دەگرن بۆ ئەوەی قسەکان بگوێزنەوە بۆ گەورە گومڕاکانیان.

جا دووڕووان کاتێک بە دۆست و گەورەکانیان بگەن لە موشریکان، شانازی بەوەوە دەکەن باوەڕدارانیان فریو داوە و فەرمانیش لەو ئاغانەیان وەردەگرن و سەریان بەسەری یەکەوەیە بۆ پیلانگێڕان لە ئیسلام و ئەهلەکەی.

پەروەردگار لە باس و خستنەڕووی نیازی دووڕووان لە بنیاتنانی مزگەوتی ضیراردا دەفەرمووێت: ﴿وَإِرصادًا لِمَن حارَبَ اللَّهَ وَرَسولَهُ مِن قَبلُ﴾[التوبە:١٠٧]، «لە چاوەڕوانیی ئەوانەشدا کە پێشتر جەنگیان دژی خوا و پێغەمبەرەکەی کردووە.»

واتە لە ئامادەکاریی پێشوازیکردن لە ئەبوو عامری فاسقی بێقیمەت کە بەڵێنی دابوونێ بە لەشکرێک ڕۆمییەوە بێت و بچێت بە گژ باوەڕداراندا.

بگرە زۆرجار دووڕوو سوور و پێداگرترە لە ئاغا کافرە ملهوڕەکانی بۆ خزمەتکردنی باتڵ و جەنگان لەدژی باوەڕداران! چونکە نەفسنزمی و بێنرخی ئەو زۆر لە هی ئەوان پێشکەوتووترە.

شێخ عەلی قەرەنی دەفەرمووێت: "بێباوەڕان تەنیا ئەوەیان لە دووڕووان دەویست وەک پەتا و تایەک بێت بۆ باوەڕداران و هەندێک ماندوویان بکات، کەچی ئەوان بوون بە تاعوون و دەردی هەرە کوشندە و فەوتێنەر! ئەوان تەنیا دەیانویست زمانێک بێت، کەچی ئەو بوو بە زمان و چاو و دەست و پێ و پاچی هەڵکەندن و تەوری بڕینەوە و پیکی پشتشکێن."

لە دونیادا کۆک و کۆ بوون ئیتر خوای گەورە لە قیامەتیشدا هەروا پێکەوە کۆیان دەکاتەوە:

(الله) فەرموویەتی: ﴿إِنَّ اللَّهَ جامِعُ المُنافِقينَ وَالكافِرينَ في جَهَنَّمَ جَميعًا﴾[النساء: ١٤٠]، «بەدڵنیاییەوە خوا دووڕووان و بێباوەڕان هەموو پێکەوە کۆ دەکاتەوە.»

وەک چۆن لە دژایەتیکردنی ئیسلام و گاڵتەکردن بە ئەهلەکەی لە دونیادا کۆ بووبوونەوە، پەروەردگاریش هەر ئاوا لە دۆزەخدا یەکیان دەخات لەوێدا بۆ خۆیان تف و نەفرەت بگۆڕنەوە.

پەروەردگار هۆشیاری دەداتە باوەڕداران لە بەدۆستگرتن و پشتیوانیکردنی خەڵکانێک کە سەر بە ئایین و ئوممەتی خۆیان نین:

پەروەردگار دەفەرمووێت: ﴿يا أَيُّهَا الَّذينَ آمَنوا لا تَتَّخِذُوا اليَهودَ وَالنَّصارى أَولِياءَ بَعضُهُم أَولِياءُ بَعضٍ وَمَن يَتَوَلَّهُم مِنكُم فَإِنَّهُ مِنهُم إِنَّ اللَّهَ لا يَهدِي القَومَ الظّالِمينَ﴾[المائدە: ٥١]

«ئەی ئەوانەی باوەڕیان هێناوە جوولەکە و گاور بەدۆست و پشتیوان مەگرن ئەوان خۆیان دۆست و پشتیوانی یەکترین، هەر کەسیش لە ئێوە دۆستایەتی و پشتیوانی ئەوان بکات ئەوا بەڕاستی ئەویش لەوانە، بەدڵنیاییەوە خوا ڕێنوێنی خەڵکی ستەمکار ناکات.»

هەروەها فەرموویەتی: ﴿لا يَتَّخِذِ المُؤمِنونَ الكافِرينَ أَولِياءَ مِن دونِ المُؤمِنينَ وَمَن يَفعَل ذلِكَ فَلَيسَ مِنَ اللَّهِ في شَيءٍ إِلّا أَن تَتَّقوا مِنهُم تُقاةً﴾[آل عمران: ٢٨]، «باوەڕداران نەکەن بێباوەڕان بە دۆست بگرن لەبری باوەڕداران و دوور لەوان هەر کەسیش ئەوە بکات بەشی بە خواوە نییە مەگەر ترس و توقیەیەکیان لێ بکەن.»

جا یەکێک دۆستایەتیی ئەوان بکات پەروەردگار بێبەری دەکات و دەفەرمووێت کە ئیتر هیچی بە خواوە نەماوە. واتا لە خوا دابڕاوە، فڕی بە

دینی خواوە نەماوە، ئەمەش یانی ڕەتکردنەوەی پەیوەندیی هەبوونی ئەم کەسە بە خواوە لە هەر حاڵێکدا، پەیوەندییەک لەنێوان ئەو و (الله)دا نییە. خوای مەزن لەدوای ئەوەش دەفەرمووێت: ﴿وَيُحَذِّرُكُمُ اللَّهُ نَفسَهُ وَإِلَى اللَّهِ المَصيرُ﴾ [آل عمران: ٢٨]، «خوا وریاتان دەکاتەوە و دەتانترسێنێت لە خۆی هەر بۆ لای خواشە گەڕانەوە و سەرەنجامتان.»

خوای گەورە جارێکی دیکەش هەستی خۆشویستنی ئایین لە باوەڕداراندا دەبزوێنێت بۆ ئەوەی تێیان بگەیەنێت کە ئیسلامدۆستی لەگەڵ دۆستایەتیکردنی ئەوانەی گاڵتە و توانج دەگرنە.ئیسلام، لە دڵێکدا کۆ نابنەوە: ﴿يا أَيُّهَا الَّذينَ آمَنوا لا تَتَّخِذُوا الَّذينَ اتَّخَذوا دينَكُم هُزُوًا وَلَعِبًا مِنَ الَّذينَ أوتُوا الكِتابَ مِن قَبلِكُم وَالكُفّارَ أَولِياءَ وَاتَّقُوا اللَّهَ إِن كُنتُم مُؤمِنينَ ﴿٥٧﴾ وَإِذا نادَيتُم إِلَى الصَّلاةِ اتَّخَذوها هُزُوًا وَلَعِبًا ذلِكَ بِأَنَّهُم قَومٌ لا يَعقِلونَ﴾ [المائدە: ٥٧ – ٥٨]

«ئەی ئەوانەی باوەڕیان هێناوە، ئەوانەی کە ئایینەکەی ئێوەیان کردووەتە مەسخەرە و گاڵتە و گەمەی خۆیان لە ئەهلی کیتابی پێشووتر و لە بێباوەڕان (موشریکانی جگە لە ئەهلی کیتاب) مەگرن بە دۆست و پشتیوان، لە خواش بترسن ئەگەر خاوەنی ئیمانن (٥٧) کاتێکیش ئێوە بانگ بۆ نوێژ دەدەن ئەوان گاڵتە و گەمە بەوەش دەکەن، ئەوە بۆیە کار و حاڵیانە چونکە بێئاوەز و ناژیرن.»

هەروەها چۆن نەهی لە بەدۆستگرتنی بێباوەڕان کردووە، نەهی لە بەدۆستگرتنی دووڕووانیش گرتووە دەفەرمووێت: ﴿يا أَيُّهَا الَّذينَ آمَنوا لا تَتَّخِذوا بِطانَةً مِن دونِكُم لا يَألونَكُم خَبالًا﴾ [آل عمران: ١١٨]، «ئەی ئەوانەی باوەڕیان هێناوە هاودەم و هاوڕاز لە غەیری خۆتان (غەیری باوەڕدارانتان) نەبێت کە دەست ناگێڕنەوە لە هەر گێرە و کێشە سازاندنێک بۆ ئێوە.» ئەوانیش دووڕووانن وەک لە تەفسیری ئیبن کەثیر و سیعدیدا هاتووە.

هەندێکیش لەوانەی دەدرێنە پاڵ زانست و فیقهـ کاریان بەوە گەیشتووە کە فەتوا بۆ هاووڵاتیی موسڵمانی نیشتەجێی وڵاتە ڕۆژئاواییەکان بدەن کە ببێتە

سەرباز و شەڕی موسڵمانان بکات لەو پێناوەدا کە ڕەگەزنامەی لێ نەسەندرێتەوە و تانە لە نیشتمانپەروەرییەکەی نەدرێت! کە ئەمە پشتکردنە لەو ئایەتانەی خرانە ڕوو هەروەها ئەو فەرموودەیەشی بوخاری گێڕاویتیەوە کە هەندێک لە موسڵمانان لەگەڵ موشریکاندا دەهاتن و ڕەشایی ئەوانیان زیاد دەکرد دژ بە پێغەمبەری خوا (ﷺ) جا لە جەنگدا لێیان کوژرا، پەروەردگاریش ئەوەی دابەزاند:

﴿إِنَّ الَّذِينَ تَوَفَّاهُمُ المَلائِكَةُ ظالِمِي أَنفُسِهِم قالوا فيمَ كُنتُم قالوا كُنّا مُستَضعَفينَ فِي الأَرضِ قالوا أَلَم تَكُن أَرضُ اللَّهِ واسِعَةً فَتُهاجِروا فيها فَأُولئِكَ مَأواهُم جَهَنَّمُ وَساءَت مَصيرًا﴾ [النساء: ٩٧]

«بەڕاستی ئەوانەی فریشتەکان گیانیان کێشان لە وەختێکدا کە ستەمیان لە خۆیان دەکرد، (فریشتەکان) پێیان گوتن ئێوە لە کوێ بوون خەریکی چی بوون گوتیان ئێمە لاواز و ژێردەستە بووین لەسەر زەویدا، گوتیان ئەرێ زەوی خوا فراوان نەبوو کە کۆچی تێدا بکەن (بۆ جێگەیەکی دیکە) جا ئەوانە لانکەیان دۆزەخە، ئەوەش خراپترین چارەنووس و سەرەنجامە.»[1]

ئیبن کەثیر دەفەرموێت: "سا ئەم ئایەتە پیرۆزە دابەزی بە گشتگیری بۆ تەواوی ئەوانەی لەناو موشریکاندا نیشتەجێ دەبن لە کاتێکدا توانای کۆچکردنیشیان هەیە، خۆ لەو جێگەیەشی تێیدان دەسەڵات و هێزی چەسپاندنی ئایینیان نییە، جا ئەوانە ستەمیان لە خۆیان کردووە، بە ئیجماعی زانایانیش ئەوە تاوانی گەورەیە و بە دەقی ئەم ئایەتەش." ئەوەتا ئەوانە خەڵکانێک بوون هیجرەتیان لەسەر فەرز کرابوو بۆ ئەوەی بگەن بە مەدینە و ئایینی خۆیان بپارێزن و ئاشکرای بکەن، کەچی مانەوەی ناو ماڵومنداڵ و کار و پارە و بازرگانی و نیشتمانیان هەڵبژارد بەسەر ڕزگارکردنی ئایینەکەیان تاکوو تووشی ئەو فیتنەیە بوون و ڕاپێچی گۆڕەپانی جەنگی بەدر کران لەناو لەشکری موشریکاندا. جا هەر کەس کە

---

(١) [البخاري: ٤٥٩٦]

لێیان کوژرا ستەمکارانە سەری نایەوە وەکوو خوا فەرمووی.

ئیتر ئەوانەی ئەم فەتوایانە دەهاون دەیانەوێت بۆ کوێ لە دەستی (الله) هەڵبێن؟ دوایی چی وەڵام دەدەنەوە؟! هەر کەسیش بڵندی و هێزی دەوێت: (الله) دەفەرمووێت: ﴿وَلِلَّهِ العِزَّةُ وَلِرَسولِهِ وَلِلمُؤمِنينَ وَلٰكِنَّ المُنافِقينَ لا يَعلَمونَ﴾ [المنافقون: ٨]، «بۆ خوایە عیززەت و بۆ پێغەمبەرەکەیەتی و بۆ باوەڕداران، بەڵام دووڕووان نازانن.»

فەرموشیەتی: ﴿إِنَّما وَلِيُّكُمُ اللَّهُ وَرَسولُهُ وَالَّذينَ آمَنُوا الَّذينَ يُقيمونَ الصَّلاةَ وَيُؤتونَ الزَّكاةَ وَهُم راكِعونَ ۝ وَمَن يَتَوَلَّ اللَّهَ وَرَسولَهُ وَالَّذينَ آمَنوا فَإِنَّ حِزبَ اللَّهِ هُمُ الغالِبونَ﴾ [المائدة: ٥٥ - ٥٦]، «بەڕاستی دۆستی ئێوە تەنیا (الله) و پێغەمبەرەکەی و باوەڕدارانە کە نوێژ دەکەن و زەکات دەدەن و کڕنۆشبەرن (٥٥) هەر کەسیش دۆستایەتی و پشتیوانی بۆ خوا و پێغەمبەرەکەی و باوەڕداران بێت ئەوا حیزبی خوا خۆیانن براوە و زاڵ.»

سا بێباوەڕی ڕسواییە، تاوان ڕسواییە، با هاوەڵانیشی لە ڕووی ماددییەوە زاڵ و پێشکەوتوو بن. ئەوەشی بە چەسپاوی لەسەر ئایینی خۆی بمرێت ئەوە بڵند و سەربەرزە. بەڵام دووڕووان نازانن و لەم واتا و حەقیقەتانەش خۆ تێ ناگەن.

**العز في كنف العزيز ومن**

**عَبَدَ العبيـــــــد أذله الله**

✿✿✿✿✿

**عیززەت هەر لەپەنای خوای عەزیزدا بەدەست دێـــــت و**

**هەر کەسیش بەندەی بەندەکان بێت خوا ڕسوای دەکات**

# ٥- گۆڕانی دۆستایەتی و پەیوەندی بەپێی تەرازووەکانی هێز

ئەمەش سروشتێکی سووک و ڕەوشتێکی نزمی دیکەی دووڕووانە! دووڕوو وەختێک لێکدانەوە و پێوەرەکانی زەمینی و قوڕینن، چاوی هەر لەسەر سەروخواردکردنی تای تەرازووەکانی هێزە. جا کاتێک تای دۆستانی چوو بە ئاسماندا و ئومێدی نەما زاڵ ببنەوە، ئیتر نایاننناسێتەوە و پشت لەوانیش دەکات، بگرە لەوانەیە هاوکار و هاوپەیمانیش بێت لە دژیان، ئەسڵەن وەک بڵێی ڕۆژێک لە ڕۆژان نەیناسیون و دۆستیان نەبووە! دووڕوو چووزانێت واتای وەفا و پێزانی بۆ دۆستان یانی چی، چووزانێت پیاوەتی و جوامێری و ماقووڵی و بەهاناوەچوون یانی چی. بتەوێت ئەم واتایانەی لەلا ببزوێنێت وەک ئەوە وایە بەگوێی بزن و مەڕدا بخوێنیت.

(الله) دەفەرموێت: ﴿أَلَم تَرَ إِلَى الَّذينَ نافَقوا يَقولونَ لِإِخوانِهِمُ الَّذينَ كَفَروا مِن أَهلِ الكِتابِ لَئِن أُخرِجتُم لَنَخرُجَنَّ مَعَكُم وَلا نُطيعُ فيكُم أَحَدًا أَبَدًا وَإِن قوتِلتُم لَنَنصُرَنَّكُم﴾ [الحشر: ١١]، «ئەرێ نەتبینی دووڕووان بە برا بێباوەڕەکانیان لە ئەهلی کیتاب گوت: ئەگەر دەربکرێن ئێمەش لەگەڵتان دەردەچین و گوێڕایەڵی قسەی کەس نابین لە دژی ئێوە و ئەگەریش شەڕتان لەگەڵ بکرێت ئێمە سەرتان دەخەین.»

دووڕوو ئاوایە! بەڵێنی زل و پان و بانگەشەی ئازایی و بەجەرگی... بەڵام خوا بۆ خۆی بەدرۆی خستوونەتەوە: ﴿وَاللَّهُ يَشهَدُ إِنَّهُم لَكاذِبونَ ۝١١ لَئِن أُخرِجوا لا يَخرُجونَ مَعَهُم وَلَئِن قوتِلوا لا يَنصُرونَهُم وَلَئِن نَصَروهُم لَيُوَلُّنَّ الأَدبارَ ثُمَّ لا

يُنصَرونَ﴾ [الحشر: ١١ – ١٢]، «خوا شاهێدی دەدات کە ئەوانە درۆ دەکەن (١١) ئەگەر دەربکرێن ئەوان لەگەڵیان دەرناچن و ئەگەریش شەڕیان لەگەڵ بکرێت ئەوان سەریان ناخەن و خۆ ئەگەر سەریشیان بخەن پشت هەڵدەکەن و هەڵدێن و پاشانیش سەرناخرێن.»

تەنیا هێندەی هێزی بێباوەڕان لەقی ئیدی کانزای مونافیقیش بەدەر دەکەوێت. ئەوجا پەروەردگار هۆکاری ئەم گۆڕانی هەڵوێستە ڕوون دەکاتەوە و دەفەرمووێت: ﴿لَأَنتُم أَشَدُّ رَهبَةً فِى صُدورِهِم مِنَ اللَّهِ﴾ [الحشر: ١٣]، «ئێوە لە سینەیاندا لە خوا بەسام و ترسترن.»

دووڕوو وەختێک دۆستایەتیی بێباوەڕی کردووە، فرمان و نەهی خوای لە پێشچاو نەبووە. وەختێکیش ئەم دۆستایەتییەی هەڵوەشاندەوە و دەستی لێ هەڵگرت بۆ خوا نەبوو هەڵوەشاندنەوەکەی، بەڵکوو لە ترسی باوەڕداران بوو. جا ئەو لە گشت حاڵەکاندا بەس خوای لەیاد نەبووە!

﴿ذٰلِكَ بِأَنَّهُم قَومٌ لا يَفقَهونَ﴾ [الحشر: ١٣]، «ئەوەش چونکە خەڵکێکی تێنەگەیشتوو و نەفامن.»

دەشێت دووڕوو لەمەدا دابەزێتە خوار ئاستی بێباوەڕیشەوە. ئەوەتا لە غەزای بەنی قورەیظەدا حویەی کوڕی ئەخطەب بەڵێنێک کە دابووی بە بەنی قورەیظە بردییە سەر و لەگەڵیان چووە ناو قەڵاکەوە و ئامادەبوو دووچاری هەمان چارەنووسی ئەوان ببێتەوە، بەڵام دووڕووان بەڵێنی سەرخستنی بەنی نوضەیریان نەبردە سەر و ئەم ئایەتانەیان لەسەر دابەزی.

❁ تەماشای ئەم ئایەتانە بکە چۆن وێنای حاڵی دووڕووان دەکەن و دیدگایان بۆ ململانێکان چۆنە: "کام کۆمەڵ زاڵ دەبێت؟ با دۆستایەتی لەگەڵ ئەو گرێ بدەین و ڕاستەوخۆ لەژێر چەتری کۆمەڵەکەی دیکە بێینە دەرێ و

**هەڵبێین!" پەروەردگار دەفەرموێت:** ﴿الَّذِينَ يَتَرَبَّصُونَ بِكُمْ فَإِن كَانَ لَكُمْ فَتْحٌ مِّنَ اللَّهِ قَالُوا أَلَمْ نَكُن مَّعَكُمْ وَإِن كَانَ لِلْكَافِرِينَ نَصِيبٌ قَالُوا أَلَمْ نَسْتَحْوِذْ عَلَيْكُمْ وَنَمْنَعْكُم مِّنَ الْمُؤْمِنِينَ﴾ **[النساء: ١٤١]، «ئەوانەی خۆیان لە ئێوە مەڵاسداوە جا ئەگەر سەرخستن و فەتحێکتان لەلای خواوە بۆ بێت دەڵێن ئەرێ ئێمەش لەگەڵتاندا نەبووین ئەگەر بێباوەڕانیش بەشێکیان بەرکەوێت دەڵێن ئەرێ ئێمە ئێوەمان نەکەوتە ژێردەست و پاراستمانن لە باوەڕداران.»**

**سا ئەوان لەگەڵ زاڵدان هەر کێ بێت. دەڵێی لە پێشچاومە چۆن مرۆڤی دووڕوو گێل و وێڵ قاپێکی بە دەستەوەیە و لیکی شۆڕ بووەتەوە، بە شوێن سەرکەوتووەکاندا دەگەڕێت تا لەبەر پێیاندا بکەوێت و بلاڵێتەوە قاپەکەی بۆ پڕ بکەن لە خواردن. ئەگەر پێی بڵێیت: ڕەزامەندیی خوا، بەهەشت، غیرەکردن بۆ ئایینەکەی خوا... دەم دادەچەقێنێت و شێوەی شێتان لێت دەڕوانێت و تێ ناگات و ئەوجا ڕوو وەردەگێڕێت و دەڵێت: "کوا ئەمە زگی من تێر دەکات؟"!**

**پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت: "وێنەی دووڕوو وێنەی بزنی گێژی نێوان دوو ڕانە، جارێک سەر بەملادا دەکات و جارێک سەر بەولادا دەکات، نازانێت شوێن کامیان بکەوێت."[١]**

**خوای بالادەستیش فەرموویەتی:** ﴿وَإِنَّ مِنكُمْ لَمَن لَّيُبَطِّئَنَّ فَإِنْ أَصَابَتْكُم مُّصِيبَةٌ قَالَ قَدْ أَنْعَمَ اللَّهُ عَلَيَّ إِذْ لَمْ أَكُن مَّعَهُمْ شَهِيدًا﴾ **[النساء: ٧٢]، «بەڕاستی هی واتان تێدایە خاوەخاویەتی و لێی دەوەستێت جا ئەگەر کارەساتێکتان تووش بێت دەڵێت ئەها خوا میهر و بەخششی بە من کرد کە لەوێ لەگەڵیان ئامادە نەبووم.»**

**مونافیق ئەم سووکی و بێئەرزشییەی خۆی بە دانایی لێک دەداتەوە، بگرە بە نیعمەتی خوای دەزانێت! ئیتر خۆی لە جیهاد و قوربانیدان دوا دەخات و**

---

(١) [مسلم: ٢٧٨٤]

ئەوانی دیکەش سارد دەکاتەوە و دەیانلەقێنێت.

﴿وَلَئِن أَصابَكُم فَضلٌ مِنَ اللَّهِ لَيَقولَنَّ كَأَن لَم تَكُن بَينَكُم وَبَينَهُ مَوَدَّةٌ يا لَيتَني كُنتُ مَعَهُم﴾ [النساء: ٧٣]، «خۆ ئەگەر فەزڵ و بەخششێکی خواشتان پێ بگات دەڵێت -وەک بڵێی قەت لەنێوان ئێوە و ئەودا پەیوەندی و دۆستێتییەک نەبوویێت-: خۆزگە منیشیان لەگەڵ دەبوو.» ئەمجار پەشیمانە و ئاواتیەتی لەگەڵ باوەڕداران بووایە.

پێت وایە پەشیمانییەکەی بۆ ئەوەیە کە سەرخستنی خوا بۆ بەندە بڕوادارەکانی دەبینێت و دەزانێت بڵندی هەر بۆ خوا و پێغەمبەرەکەی و باوەڕدارانە و بۆیە ئیتر ڕقی لە دووڕوویی خۆی دەبێتەوە و ڕۆحی شەیدای مەیدانی پاڵەوانانە؟ نا! بگرە هێشتا چاوی لە بەرپێی خۆی زیاتر نابینێت!

﴿يا لَيتَني كُنتُ مَعَهُم فَأَفوزَ فَوزًا عَظيمًا﴾ [النساء: ٧٣]، «خۆزگە منیش لەگەڵیان بامایە و ئیتر بەشێکی گەورە بردنەوەم بە قسمەت دەبوو.» دەستکەوتی دەوێت، غەنیمەتی دەوێت، پارە و شمەکی هیچوپووچ، ناوودەنگێکی کە شایەنی نییە. ئەم بردنەوە گەورەیەی بە ئومێدیەتی و چاوی لەسەر لانابات!

جا بۆیە مرۆڤی دووڕوو دۆستایەتیی ڕاستەقینەی بۆ هیچ کەس نییە. تەنیا هەیە و نییە بەرژەوەندییە پووچە دونیاییەکانن کە قیبلەنما و ئینتیما و هاوپەیمانییەتیی ئەو ئاڕاستە دەکەن.

(الله) لە وەسفییاندا فەرموویەتی: ﴿مُذَبذَبينَ بَينَ ذلِكَ لا إِلى هؤُلاءِ وَلا إِلى هؤُلاءِ﴾ [النساء: ١٤٣]، «ڕاڕا و لەقیون لەو نێوانەدا نە بۆ لای ئەوانە نە بۆ لای ئەوانە.»

هەروەها فەرموویەتی: ﴿أَلَم تَرَ إِلَى الَّذينَ تَوَلَّوا قَومًا غَضِبَ اللَّهُ عَلَيهِم ما هُم مِنكُم وَلا مِنهُم﴾ [المجادلة: ١٤]، «ئەرێ نابینی ئەوانەی دۆستایەتیی خەڵکێک

دەکەن کە خوا خەشمی لێ گرتوون نە لە ئێوەن و نە لەوانیشن»دووڕوو ئینتیمای ڕاستی نە بۆ باوەڕداران هەیە و نە بۆ ئەوانەشی کە خوا خەشمی لێ گرتوون "جوولەکە". تەنیا بەرژەوەندی!

✿ کەسانێکیش لەوانەی دەدرێنە پاڵ زانست، کەوتوونەتە هەمان ئەم سیفەتەوە، فێر بوون بەهانە بۆ هەڵگەڕانەوەی دۆستایەتی و پەیوەندی بهێننەوە بەپێی هێز و مل نەوی بکەن بۆ بەهێزیی ناهەق و بەرگێکی شەرعییانەشی بەبەر ئەوەدا بکەن! کە (الله) لەمە بێبەرییە، کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) سەرداری ماقوولان و جوامێران و مەردان و وەفاداران و باوەڕدارانی ڕاستاڵیش لێی بێبەرین.



# ٦- درۆکردن

## دووڕوویی و درۆ دوو وشەی هاوواتان!

ئەگەر لێت داوا کرا هەرچی سیفەتی دووڕووانە لە یەک وشەدا کۆی بکەیتەوە، بڵێ: "درۆکردن"! پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿لِيَجزِيَ اللَّهُ الصّادِقينَ بِصِدقِهِم وَيُعَذِّبَ المُنافِقينَ إِن شاءَ أَو يَتوبَ عَلَيهِم إِنَّ اللَّهَ كانَ غَفورًا رَحيمًا﴾ [الأحزاب: ٢٤]، «بۆ ئەوەی خوا پاداشتی ڕاستگۆیان بداتەوە بە ڕاستگۆییان و ئەشکەنجەی دووڕووان بدات ئەگەر ویستی، یان تەوبەیان لێ وەربگرێت بەڕاستی خوا لێخۆشبوو و میهرەبانە.» دەبینی لە بەرانبەر ڕاستگۆیاندا دووڕووانی داناوە.

هەروەها لە فەرمودەی "چوار هەن لە هەر کەسدا هەبن ئەوە دووڕوویەکی تەواو و پەتییە" دیسان دەبینیت هەر چوار سیفەتەکە لە دەوری درۆ دەخولێنەوە: کاتێک دووا درۆ دەکات، کاتێک بەڵێن دەدات دەیشکێنێت (کە بەڵێنشکێنیش جۆرێک لە درۆکردنە)، وەختێک پەیمان دەدات دەیشکێنێت (کە شکاندنی پەیمان و ناپاکیلێکردنیش هەر درۆیە، چونکە پێچەوانەی ڕاستاڵبوون و وەفاپێکردن و بردنەسەری ئەو پەیمانەیە)، وەختێکیش دەبێت بە شەڕ و تێکگیران، ناخۆشی دەکات (لە ڕوونترین شێوەکانی ناخۆشکردن و سنوورشکاندنیش لە دوژمنایەتیدا: دەستدانە درۆیە لە زەمکردن و شکاندنی لایەنی دژ و نەیار).

حەسەنی بەصری دەفەرموێت: "ئەو بنچینەیەی کە دووڕوویی لەسەر دامەزراو و وەستاوە: درۆکردنە".

ئەوەش هەر هاوشێوەی درۆیە کە کردارت پێچەوانەی گوفتارت بێت، ئەو کات کردار بەدرۆخەرەوەی گوفتارە.

هەربۆیە دەبینیت پەروەردگار پێی ناخۆشە، بگرە ڕقی لێیە و خەشمی لەسەریەتی کە باوەڕدار لەم سیفەتەوە تێ بگلێت، بەمە پێکگەیشتن و یەکتربڕینی بۆ دروست دەبێت لەگەڵ کەسایەتیی مرۆڤی دووڕوودا، خاڵی هاوبەش، (الله) فەرموویەتی: ﴿يا أَيُّهَا الَّذينَ آمَنوا لِمَ تَقولونَ ما لا تَفعَلونَ ۝٢ كَبُرَ مَقتًا عِندَ اللَّهِ أَن تَقولوا ما لا تَفعَلونَ﴾ [الصف: ٢ – ٣]، «ئەی ئەوانەی باوەڕیان هێناوە! بۆچی شتێک دەڵێن کە نایکەن (٢) گەلێک خەشمی لەلای خوا گەورەیە شتێک بڵێن کە نایکەن.»

چەند ئەم سیفەتە -پێچەوانەبوونی کردار لەگەڵ گوفتار- لەناو موسڵماناندا بڵاو و بەرچاوە! چەند دەیانبینین لۆمەی واقیعێک دەکەن کە خۆیانن خشتی بیناکەی و دەستی یاریدەر تێیدا:

كم قلت أمراض البلاد وأنـــت من أمراضها

والشؤم علتها فهل فتشـــت عن أعراضها

يا من حملت الفأس تهدمها على أنقاضها

اقعد فما أنت الذي تسعــى إلى إنهاضها

وانظر بعينيك الذئاب تعــب في أحواضها



چەند باسی دەردەکانی وڵاتت کرد کە خـۆت یەکێکیت لە دەردەکانی

هۆکاری کە شوومێتییە جا تـــــــــــــۆ ڕوانیوتە بۆ نیشانەکانی

هێی تۆ کە چەکوشت بەدەستەوەیە خەریکـــی سەرەوژێری ئەکەی

دانیشە تازە خۆ تۆ پیاوی هـــــــــــــەوڵ و هەستاندنەوەی نیت

تۆش بۆستە و بڕوانە چۆن گەلەگورگ خۆیان تێ ناوە و حەپەلووشی دەکەن

چەند موسڵمان دەبینی سەرکۆنەی ناپاکی و بەدەستەوەدانی وڵات دەکات و نەفرەت دەهاوێت لە پیلانگێڕانی ناوخۆ، پرسیاریشی لێ بکەیت: "ئاواتتە جیهاد بکەیت؟" بێ دوودڵی دەڵێت: "ئای خۆزگە! بێگومان"، پاشان هەر ئەوە قەرزی ڕیبا وەردەگرێت و مامەڵەی حەرام دەکات و دروشمە بریقەدارەکانی خۆی بەدرۆ دەخاتەوە. ئەمەیە کردار پێچەوانەی گوفتار. سا داوامان لە خوایە نموونەی ئەمانە هیدایەت بدات و چاکیان بکات.

## دووڕوو، یەکەم جار لەگەڵ خۆیدا درۆ دەکات

قوڕطوبی لە ڕاڤەی ئەو فەرمایشتەی پەروەردگاردا: ﴿انظُر كَيفَ كَذَبوا عَلى أَنفُسِهِم وَضَلَّ عَنهُم ما كانوا يَفتَرونَ﴾ [الأنعام: ٢٤]، «بڕوانە چۆن درۆیان بەدەم خۆیانەوە کرد و ئەوەشی کە هەڵیانبەستبوو وا لێیان ون بوو.» دەفەرموێت: "درۆکردنی دووڕووان بەوەیە کە بەهانەی پووچ و باتڵ دەهێننەوە و نکۆڵی لە دووڕوویوونی خۆشیان دەکەنەوە."

دووڕوو بەهانەی بێواتا و باتڵ دەهێنێتەوە و پاساوی بۆ دووڕوویی خۆی دەوێت، بگرە ئەسڵەن دان بە موونافیقێتیی خۆشیدا نانێت! خۆی لە حەق کوێر دەکات و ئەو خراپەیەی کە لەسەریەتی و خەریکیەتی، لەلای خۆی دەڕازێنێتەوە و بانگی ئیمان لە دڵیدا سەرکوت دەکات و دەمرێنێت، خۆشی قایل بەوە دەکات ڕێگەی دووڕوویی سەلامەتترە، لەوانەیە هەست و درکی خۆشی بەوە سڕ بکات کە سیفەتی جوانیشم هەیە و مادەم وایە لەسەر خێرم و هێشتا وێڵ نەبووم.

## دووڕووو، بۆ پاساودانی کارە خراپەکانی درۆ دەکات:

ئیدی دوای فریودانی خۆی، نۆرەی فریودانی باوەڕدارانە. باوەڕداران لە دیدی ئەودا ساویلکە و گێلن و ئەو دانایی و درکەیان نییە ئەو هەیەتی، باوەڕی ئەوان، باوەڕی کەمعەقڵەکانە بە تێڕوانینی ئەو! (أنؤمن كما آمن السفهاء - ئەرێ باوەڕ بهێنین چۆن ئەو کەمعەقڵانە باوەڕیان هێناوە). سا بێ دوودڵی دەبێت ئەو کەمعەقڵانە بخەڵەتێنرێن بۆ ئەوەی نەکەونە مشتومڕی بێسوود لەگەڵیان و خۆشمان لە کاردانەوەی خرۆش و سۆزی ساویلکانەیان بپارێزین. جا بۆیە دووڕووو ترسێکی لەوە نییە سوێندی درۆیان بۆ بخوات: ﴿اتَّخَذوا أَيمانَهُم جُنَّةً فَصَدّوا عَن سَبيلِ اللَّهِ إِنَّهُم ساءَ ما كانوا يَعمَلونَ﴾ [المنافقون: ٢]، «سوێندەکانیان کردووە بە قەڵغان و سا ڕێگەی خوایان بەستووە و خەڵکی لێ لادەدەن، بەڕاستی خراپترین کارێکە دەیکەن.»

ئەو هەموو ناشیرینییەکی لێ دەوەشێتەوە و لە هەر قوڕاوێکی نیفاقدا خۆ دەگەوزێنێت لەپاشان سوێند بە خوا دەخوات کە تەنیا نییەتی چاکەی هەبووە، ئەو سوێندەی بەسەر باوەڕداراندا تێپەڕ دەبێت چونکە ئەوان ناتوانن وێنای ئەوە بکەن کەسێک سوێندی درۆ بەو خوایە بخوات کە هێندە مەزنە لە دڵی ئەماندا! ئیتر دووڕووو زیاد پێ ڕادەکێشێت لەم بێڕەوشتییەیدا دوابەدوای ئەوەش کە باوەڕداران بڕوای پێ دەکەن.

بڕوانە چۆن پەروەردگار نکۆڵی ئەم کارە بەدەیان لێ دەکات - درۆکردن لەپێناو بەستنی ڕێگەی (الله)دا، دەفەرمووێت: ﴿إِنَّهُم ساءَ ما كانوا يَعمَلونَ﴾ [التوبه: ٩]، «بەڕاستی خراپترین کارێکە کە دەیکەن!»

ئەوەش وێنەی ئەو فەرمایشتەی دیکەی کە دەفەرمووێت: ﴿اتَّخَذوا أَيمانَهُم جُنَّةً فَصَدّوا عَن سَبيلِ اللَّهِ فَلَهُم عَذابٌ مُهينٌ﴾ [المجادلة: ١٦]، «سوێندەکانیان کردووە بە قەڵغان و سا ڕێگەی خوایان بەستووە و خەڵکی لێ لادەدەن، سا سزایەکی ڕسواکەر بەشیانە.»

جا سوێندی درۆ، ئەو قەڵغانە پارێزەرەیە کە دووڕوو دەچێتە پشتی لە دونیادا، ئەو پەردەیەی هەموو سووکی و بەدڕەوشتییەکی خۆی لە پشتییەوە ڕەت دەکات، بەڵام هەر ئەوەشە هەڵیدەڕەنێت لە ئاگری دۆزەخدا. لەمەودواش تەماشا بکە چۆن دووڕوو سیفەتە دووڕووییەکانی بە درۆ دەشارێتەوە، ئیدی ئەو سیفەتانەی تا ئێستە باسمان کردووە یان ئەوانەی دی کە دێن:

١. گومانکردن لە ئایینی خوا: ﴿وَمِنَ النَّاسِ مَن يَقولُ آمَنّا بِاللَّهِ وَبِاليَومِ الآخِرِ وَما هُم بِمُؤمِنينَ﴾[البقرة: ٨]، «هەندێک هەن لە خەڵک دەڵێن باوەڕمان هێناوە بە خوا و بە ڕۆژی دوایی، بەڵام باوەڕداریش نین.»

هەروەها دەفەرموێت: ﴿إِذا جاءَكَ المُنافِقونَ قالوا نَشهَدُ إِنَّكَ لَرَسولُ اللَّهِ وَاللَّهُ يَعلَمُ إِنَّكَ لَرَسولُهُ وَاللَّهُ يَشهَدُ إِنَّ المُنافِقينَ لَكاذِبونَ﴾ [المنافقون: ١]، «کاتێک دووڕووان دێنە لات دەڵێن شاهێدی دەدەین کە تۆ پێغەمبەری خوایت، خوا بۆ خۆی دەزانێت تۆ پێغەمبەری ئەویت، خواش شاهێدی دەدات کە دووڕووان درۆکارن.»

٢. پشتکردن لە بەداوەرکردنی پەڕتووکەکەی خوا و سوننەتی پێغەمبەرەکەی (ﷺ): ﴿أَلَم تَرَ إِلَى الَّذينَ يَزعُمونَ أَنَّهُم آمَنوا بِما أُنزِلَ إِلَيكَ وَما أُنزِلَ مِن قَبلِكَ يُريدونَ أَن يَتَحاكَموا إِلَى الطّاغوتِ وَقَد أُمِروا أَن يَكفُروا بِهِ وَيُريدُ الشَّيطانُ أَن يُضِلَّهُم ضَلالًا بَعيدًا﴾[النساء: ٦٠]، «ئەرێ نابینی ئەوانەی بانگەشە دەکەن باوەڕیان هێناوە بەوەی دابەزیوە بۆ تۆ و ئەوەشی بەر لە تۆ دابەزێنراوە، دەیانەوێت حوکم بەرنە لای طاغووت، لە کاتێکدا فەرمانیان پێ کرابوو بێباوەڕ بن پێی، شەیتانیش دەیەوێت بە گومڕاییەکی دوور و قووڵ گومڕایان بکات.»

هەتا ئەوێ کە دەفەرمووێت: ﴿فَكَيفَ إِذا أَصابَتهُم مُصيبَةٌ بِما قَدَّمَت أَيديهِم ثُمَّ جاءوكَ يَحلِفونَ بِاللَّهِ إِن أَرَدنا إِلّا إِحسانًا وَتَوفيقًا﴾[النساء: ٦٢]، «جا چۆن ئەگەر کارەساتێکیان تووش هات بە بەری دەستی خۆیان و پاشان هاتنە

لات سوێندیان بە (اللە) دەخوارد کە ئێمە جگە لە چاککاری و گونجاندن مەبەستێکی دیکەمان نەبووە.» جا سوێند دەخۆن کە حوکمبردنیان بۆ لای طاغووت، بۆ بەدرۆخستنەوەی ئیسلام نییە.

٣. دۆستایەتی و پاڵپشتیکردنی بێباوەڕان: ﴿أَلَم تَرَ إِلَى الَّذينَ تَوَلَّوا قَومًا غَضِبَ اللَّهُ عَلَيهِم ما هُم مِنكُم وَلا مِنهُم وَيَحلِفونَ عَلَى الكَذِبِ وَهُم يَعلَمونَ﴾ [المجادلة: ١٤]، «ئەرێ نابینی ئەوانەی دۆستایەتی و پاڵپشتیی خەڵکێک دەکەن خوا خەشمی لێ گرتوون، ئەمان نە لە ئەوانن و نە لە ئێوەش، سوێندیش لەسەر درۆ دەخۆن و دەشزانن.»

جا دووڕووان دۆستایەتیی جوولەکەیان دەکرد کە ﴿غَضِبَ اللَّهُ عَلَيهِم﴾ «خوا خەشمی لێ گرتوون»، سوێندیش بە درۆ دەخۆن کە ئەم دۆستایەتی و پەیوەندییەیان بە جوولەکەوە پەردەپۆش بکەن.

٤. هەڵاتن لە قوربانیدان لەپێناو خوادا و ڕەتکردنەوەی: (اللە) جل جلالە فەرموویەتی: ﴿وَلِيَعلَمَ الَّذينَ نافَقوا وَقيلَ لَهُم تَعالَوا قاتِلوا في سَبيلِ اللَّهِ أَوِ ادفَعوا قالوا لَو نَعلَمُ قِتالًا لَاتَّبَعناكُم هُم لِلكُفرِ يَومَئِذٍ أَقرَبُ مِنهُم لِلإيمانِ يَقولونَ بِأَفواهِهِم ما لَيسَ في قُلوبِهِم وَاللَّهُ أَعلَمُ بِما يَكتُمونَ﴾ [آل عمران: ١٦٧]، «بۆ ئەوەی (خوا) ئەوانەش بزانێت (بەدەر بخات) کە دووڕوویيان کرد و پێیان گوترا وەرن لەپێناو خوادا بجەنگن، یان بەرگری بکەن، گوتیان ئەگەر بمانزانیایە جەنگێک دەقۆمێت شوێنتان دەکەوتین، ئەوان ئەو ڕۆژە لە کوفرەوە نزیکترن هەتا ئیمان، بە دەمیان شتێک دەڵێن کە لە دڵیاندا نییە و خواش زاناترە بەوەی دەیشارنەوە.» جا لەو بانگەشەیاندا درۆیان کرد کە پێشبینییان وا نییە جەنگ بکەوێتەوە، بۆ پاساودانی دواکەوتنی خۆیان لە جیهاد لەگەڵ پێغەمبەری خوا (ﷺ) و باوەڕداران لە جەنگی ئوحوددا.

هەروەها دەفەرمووێت: ﴿يَحلِفونَ لَكُم لِتَرضَوا عَنهُم فَإِن تَرضَوا عَنهُم فَإِنَّ اللَّهَ لا يَرضى عَنِ القَومِ الفاسِقينَ﴾ [التوبە: ٩٦]، «سوێندتان بۆ دەخۆن تاکوو لێیان ڕازی بن، سا ئەگەر ئێوەش لێیان ڕازی بن بەڕاستی خوا لە خەڵکی لەڕێدەرچوو و خراپەکار ڕازی نابێت.» جا سوێندی درۆیان خوارد بۆ پاساودانی دواکەوتنیان لە غەزای تەبووک.

٥. بێئەدەبی بەرانبەر بە خوای گەورە و بەرانبەر بە پێغەمبەرەکەی (ﷺ): ﴿يَحلِفونَ بِاللَّهِ ما قالوا وَلَقَد قالوا كَلِمَةَ الكُفرِ وَكَفَروا بَعدَ إِسلامِهِم وَهَمّوا بِما لَم يَنالوا﴾ [التوبە: ٧٤]، «سوێند بە خوا دەخۆن کە نەیانگوتووە کە بەڕاستیش قسەی کوفرییان گوتووە و کافربوونەتەوە پاش موسڵمانێتییان و بەتەمای شتێک بوون کە دەستیان نەیگەشتێ.»

جا ئەوان لە شکۆی پێغەمبەریان (ﷺ) دەدا و بەدرۆیان دەخستەوە، پاشان کاتێک شتێک لەوەی پێ بگەیشتایە، سوێندیان دەخوارد کە نەیانگوتووە.

لە ئیبن عەبباسەوە هاتووە فەرموویەتی: "پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە سێبەری یەک لە حوجرەکانیدا (ژووری خێزانەکانی کە لکابوون بە مزگەوتەوە و دەرگایان لەسەری بوو.) دانیشتبوو، سێبەرەکە کورتی دەهێنا لێی، جا فەرمووی بە هاوەڵانی پیاوێک دێتە لاتان بە چاوی شەیتانەوە سەیرتان دەکات، جا ئێوە هیچی لەگەڵ مەڵێن. گوتی جا پیاوێکی شین هات. وەختێک پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەوی بینی پێی بانگی کرد و پێی فەرموو لەسەر چی تۆ و هاوڕێکانت جنێوم پێ دەدەن؟ فەرمووی بۆستە تا دەیانهێنمە لات. چوو و هێنانی و دەستیان کرد بە سوێندخواردن کە نە شتی وایان گوتووە و نە کردووە، پەروەردگاریش عز و جل ئەوەی دابەزاند: ﴿يَومَ يَبعَثُهُمُ اللَّهُ جَميعًا فَيَحلِفونَ لَهُ كَما يَحلِفونَ لَكُم وَيَحسَبونَ أَنَّهُم عَلى شَيءٍ أَلا إِنَّهُم هُمُ الكاذِبونَ﴾ [المجادلة: ١٨]، «ڕۆژێک خوا هەموویان زیندوو دەکاتەوە و جا سوێندی بۆ دەخۆن چۆن سوێند

بۆ ئێوە دەخۆن و واش دەزانن شتێکیان بەدەستەوەیە (و ئەوە لەوێش سوودێکیان پێ دەگەیەنێت) ئەرێ بەڕاستی ئەوانەن درۆکاران.»."[1]

جا تەماشا ئەم پیاوە چۆن شارەزای درۆ بوو تەنانەت وا خۆشی دەرخست لە پێش پێغەمبەر (ﷺ) کە هیچ نالێت بۆ ئەوەی بەدرۆی نەخەنەوە، بەڵکوو دەچێت هاوڕێکانی دەهێنێت و پێکەوە سوێند دەخۆن کە جنێویان نەداوە، چۆن بڵێی درۆی بەکۆمەڵ بەهێزتر بێت لە درۆی تاک! جا دێن و سوێند دەخۆن کە... پێغەمبەری خواش (ﷺ) لە هێمنی و ئاستبەرزیی خۆیدا چاوەڕێی ئەوە بوو نواندنە سواوەکەیان تەواو بکەن و ئەویش چاویان لێ بپۆشێت.

بێنە پێشچاو خۆت دووڕووان وەختێک پەردەی ئیش و پیشەیان لەلای هەر پیاوچاکێک هەڵبماڵرێت کە لە شەقی بترسن، دێن و لە بەردەم ئەم پیاوچاکەدا ڕیز دەبن و پێشتریش ڕۆڵەکانیان دابەش کردووە: یەکێک سوێند بە خوا دەخوا و پەنجەی ڕەش و پیسی بەرز دەکاتەوە بۆ ئاسمان، یەکی دیکەش دەستەکانی دادەخات و ئەوجا پەنجەکانی درێژ دەکات وەک پێداگربوونێک، سێیەم قسە بە هەردووکیان دەبڕێت و بە دەست ئاماژە بۆ سنگی گەنیوی دەکات و خوا دەکاتە شاهێد کە چی لە دڵدایە لە مەزنڕاگریی خوا و پێغەمبەرەکەی (ﷺ).

٦. دووبەرەکینانەوە لەناو باوەڕداراندا: ﴿وَالَّذينَ اتَّخَذوا مَسجِدًا ضِرارًا وَكُفرًا وَتَفريقًا بَينَ المُؤمِنينَ وَإِرصادًا لِمَن حارَبَ اللَّهَ وَرَسولَهُ مِن قَبلُ وَلَيَحلِفُنَّ إِن أَرَدنا إِلَّا الحُسنى وَاللَّهُ يَشهَدُ إِنَّهُم لَكاذِبونَ﴾ [التوبه: ١٠٧]، «ئەوانەشی مزگەوتێکیان بۆ زەرەردان و دەستوەشاندن و بێباوەڕی و دووبەرەکی خستنە ناو باوەڕداران بنیاتنا و هەروەها لە چاوەڕوانی و کۆمەکیی ئەوانەی کە پێشتر لە دژی خوا و پێغەمبەرەکەی جەنگاون، سوێندیش دەخۆن کە جگە لە چاکترین ویستێکی دیکەمان نەبووە، خواش شاهێدی دەدات کە ئەوانە درۆ دەکەن.»

---

(١) [مسند أحمد: ٣٢٧٧]

ئیتر ئاوان ئەوان! ژێربەژێریی بۆگەن و نیازی چەپەڵ، بانگەشەی زل و قەوی و کاری نابووت: ﴿وَأَقسَموا بِاللَّهِ جَهدَ أَيمانِهِم لَئِن أَمَرتَهُم لَيَخرُجُنَّ قُل لا تُقسِموا طاعَةٌ مَعروفَةٌ إِنَّ اللَّهَ خَبيرٌ بِما تَعمَلونَ﴾ [النور: ٥٣]، «سوێندیان بە خوا خوارد بە سوێندی سەختیان کە ئەگەر فەرمانیان پێ بکەیت (بۆ جیهاد) دەردەچن، بڵێ سوێند مەخۆن گوێڕایەڵییەکی ناسراوە (تاقی کراوەتەوە درۆ دەکەن) بەڕاستی خوا ئاگادارە بەوەی دەیکەن.»

جا سوێند بە خوا دەخۆن کە ئامادەن بۆ قوربانیدان لەپێناوی خوا و دەرچوونی جیهاددا بەشداری بکەن، جۆراوجۆر و سەرنجڕاکێش سوێند دەخۆن بۆ فریودانی باوەڕداران. سوێند لەسەر ئامادەگییان بۆ گوێڕایەڵیکردنی خوا و پێغەمبەرەکەی دەخۆن، بەڵام تاقی کراونەتەوە! لە قسەی پان و بەرینی زمان زیاتر تێ ناپەڕێت، هەرگیز کردارێکی لە پشت نییە. دووڕوو لە ترسی باوەڕدارانیش درۆ دەکات، کە خوا لەپێشترە لێی بترسێت:

پەروەردگار دەفەرمووێت: ﴿سَيَحلِفونَ بِاللَّهِ لَكُم إِذَا انقَلَبتُم إِلَيهِم لِتُعرِضوا عَنهُم﴾ [التوبە: ٩٥]، «سوێندتان بۆ دەخۆن بە خوا وەختێک دەگەڕێنەوە بۆ لایان بۆ ئەوەی وازیان لێ بهێنن.»

هەروەها دەفەرمووێت: ﴿يَحلِفونَ بِاللَّهِ لَكُم لِيُرضوكُم وَاللَّهُ وَرَسولُهُ أَحَقُّ أَن يُرضوهُ إِن كانوا مُؤمِنينَ﴾ [التوبە: ٦٢]، «سوێندتان بە خوا بۆ دەخۆن تا ڕازیتان بکەن کە خوا و پێغەمبەرەکەی شایەنتر بوون ڕازی بکەن ئەگەر باوەڕدار بوونایە.»

فەرمووشیەتی: ﴿يَحذَرُ المُنافِقونَ أَن تُنَزَّلَ عَلَيهِم سورَةٌ تُنَبِّئُهُم بِما في قُلوبِهِم قُلِ استَهزِئوا إِنَّ اللَّهَ مُخرِجٌ ما تَحذَرونَ﴾ [التوبە: ٦٤]، «دووڕووان لەوە دەترسن سوورەتێکیان دابەزێتە سەر و پێیان بڵێت چی لە دڵیاندایە، بڵێ ئێوە گاڵتە بکەن بەڕاستی خوا هەر ئەوە دەردەهێنێت و دەهێنێتە پێش کە ئێوە لێی دەترسن.»

جا جگە لە خەڵک ترسی تریان نییە، گوێش بەوە نادەن نێوانی خۆیان و خوا وێرانە بێت!

## لەوانەیە باوەڕداریش بڕوا بە دووڕوو بکات

باوەڕدار بە پاکیی دڵی و گەورەبینینی بۆ خوای باڵادەست، دەشێت وا بۆی نەچێت خەڵکێک هەبن بە درۆ و بەم شێوە سواوە سوێند بە خوا بخۆن.

﴿وَمِنَ النَّاسِ مَن يُعجِبُكَ قَولُهُ فِي الحَياةِ الدُّنيا وَيُشهِدُ اللَّهَ عَلى ما في قَلبِهِ وَهُوَ أَلَدُّ الخِصامِ﴾[البقرة: ٢٠٤]، «لەناو خەڵکدا هەیە قسەی لە ژیانی دونیادا سەرسامت دەکات و خواش دەکاتە شاهێد لەسەر ناواخنی دڵی و کەچی ئەویش سەرسەختترین دوژمنە.» ... مەعقووڵە ئادەمیزاد هەبێت بڵێت: "خوا شاهێد بێت من باوەڕدارم بە (الله) و باوەڕدارم بە پێغەمبەرەکەی و ئایینەکەشیم خۆش دەوێت." لە ڕاستیشدا دوژمن بێت و ڕقی لەم دینە ببێتەوە؟! یانی بەسووکگرتنی دۆخەکە وای لێ بێت خواش بکاتە شاهێد بەسەر دڵییەوە بۆ ئەوەی تووشی شەڕی باوەڕداران نەیەت، خۆشی دەزانێت جگە لە ڕەشی و گەناوی نیفاق هیچی تری لە دڵدا نییە! چ گاڵتەهاتنێک بە خوا؟ ﴿اللَّهُ يَستَهزِئُ بِهِم وَيَمُدُّهُم في طُغيانِهِم يَعمَهونَ﴾[البقرة: ١٥]، «خوا گاڵتە بەوان دەکات و پەتیان بۆ شل دەکات لە سنوورشکێنیی خۆیاندا کوێرانە بڕۆن و پەل بهاون.»

ئاوان ئەوان: ﴿يُرضونَكُم بِأَفواهِهِم وَتَأبى قُلوبُهُم وَأَكثَرُهُم فاسِقونَ﴾[التوبە: ٨]، «بە دەمیان ڕازیتان دەکەن، بەڵام دڵیان پشتی کردووە و نایەوێت و زۆرینەشیان لەڕێدەرچوو و بەدکارن.»

جا دەشێت باوەڕدار لە دووڕوو ڕازی بێت بەهۆی قسەی شیرین و زمانی لووسی، پێچەوانەی دڵی ژەهراوی و تاڵ و تیژی.

لا بأس بالقوم من طول ومن عظم

جسم البغال وأحـــــــلام العصافير

❁❁❁❁❁

**ئەمانە گرفتی زلـی و درێژییان نییە**

**جەستەی هێستر و عەقڵی چۆلەکە**

سا پەروەردگار فەرمانی پێ کردووین باوەڕیان پێ نەکەین دوای ئەوەی نیشانەکانی دووڕووییان لێ بەدەر کەوت و کرداریان پێچەوانەی گوفتاریان بوو، ئەو کات ئیتر بڕواپێکردنیان مەترسیدارە: ﴿قُل لا تَعتَذِروا لَن نُؤمِنَ لَكُم قَد نَبَّأَنَا اللَّهُ مِن أَخبارِكُم﴾ [التوبە: ٩٤]، «بڵێ بەهانە مەهێننەوە باوەڕتان پێ ناکەین خوا هەواڵی ئێوەی پێ داوین.»

دووڕوو لە سوێندخواردندا نە وەستانی بۆ هەیە و نە ڕکابەر، سوێند بە گەورەیی خوا و بە پاشایەتیی دێرینی خوا و بە ڕووی پیرۆزی خوا، زمانی حاڵیشی دەڵێت سوێند بەو هەموو ناو و سیفەتە ڕقم لە خوا و لە دینی خوایە و بە خوێنی سەری ئێوەش تینووم، زمانی حاڵ کە ڕاستگۆترە.

**من يدعي حب الحبيب ولم يفد من هديه فسفاهة وهراء**

**فاحب أول شرطه وفروضـــــه إن كان صدقا طاعة ووفاء**



**ئەوەی بانگەشەی خۆشەویستیی پێغەمبەر بکات و سوودی لە سوننەتی نەبینیبێت، تەنیا کەمعەقڵی و وڕێنەبازییە**

**خۆشەویستی یەکەم مەرجی و فەرزەکانی ئەگەر ڕاست بێت، گوێڕایەڵـــی و پێزانییـــە**

## دووڕووانی ڕۆژگاری ئێمە، قسەیان لە ڕووە!

لە دەورانی بڵندیی باوەڕداران و زاڵێتییاندا، دووڕووان قسە چەپەڵەکانیان ئاشکرا نەدەکرد، چپەچپ و کارشاراوەیی داڵدەیان بوو: ﴿أَلَم تَرَ إِلَى الَّذينَ نُهوا عَنِ النَّجوى ثُمَّ يَعودونَ لِما نُهوا عَنهُ وَيَتَناجَونَ بِالإِثمِ وَالعُدوانِ وَمَعصِيَتِ الرَّسولِ﴾ [المجادلة: ٨]، «نابینی ئەوانەی کە نەهی چپەچپیان لێ کرا و پاشان دەگەڕێنەوە سەر ئەوەی نەهیی کرابوو لێیان و چپەچپ بە تاوان و دوژمنکاری و سەرپێچیکردنی پێغەمبەر دەکەن.»

بەڵام لەم ڕۆژانەدا، هاوکات لەگەڵ لاوازیی باوەڕداران، ئیتر دووڕووان بەگشتی و پێشەواکانیان بەتایبەتی، زۆربەی جار پێویستیان بە شاردنەوەی نەنگییەکانیان نییە. لووتبەرزیکردن بەسەر ئاییندا و ڕەتکردنەوەی حوکمەکانی و پشتگیریکردن لە بێباوەڕان، ئەسڵەن هەموو ئەمانە ئێستە بوونەتە ڕێگەی گەیشتن بە دەسەڵات و چوونەپێشەوە لە زۆرێک لە کۆمەڵگەکانی موسڵماناندا. ئیدی دووڕووان تەنیا بە ئەندازەیەک پێویستییان بە درۆکردنە کە تووڕەیی عەوامی موسڵمانانی پێ سڕ بکەن، خۆ عەوامیش چەند وشەیەکی هەنگوینیاوییان بەسە کە گوایە دینت خۆش دەوێت و ڕێزت بۆی هەیە، بۆ دووڕووش هیچی تێ ناچێت لەناو قوڕاوی نیفاقی خۆیدا هەرچییەک دەڵێت، نیفاقێکی ئاشکرا بۆ هەر خاوەن هۆش و ئاگاییەک، دووڕوو تەنیا دەیەوێت ئەو دەروێشانە بێزاری نەکەن، هەڵسوکەوت و لێدوانە ڕۆشنبیرانەکانی ئەو، گێچەڵ بە سۆزی ئایینی ساویلکانەی ئەوان نەکات، بە دیدی خۆی!

کەمعەقڵیی دووڕوو دەگاتە ئاستێک، هەوڵی درۆکردن لەگەڵ خواش بدات:

ئەمەش چالاوێکی سەیروسەمەرەیە دەروونی مرۆڤانێکی پێ بگات! بەسووکگرتنێکی ناشیرین بەرانبەر بە مەزنێتیی خوای باڵادەست! بەتایبەت

وەختێک بهێنینە پێشچاوی خۆمان کە ئەم هەوڵە بێناکامە دەکەوێتە ڕۆژی دوایی و زیندووبوونەوەوە، ڕۆژێک کە پەردە لادەدرێت و بینایییەکان تیژ دەبنەوە و هیچ پەنهانێک نامێنێت! ئەو کات دووڕوو دەزانێت ئەوەی گومانی لێی هەبوو وا ڕاستە و یەخەی مرۆڤایەتیشی گرتووە، دەزانێت کە خوا ڕاستیی ڕەها و ڕۆشنایە. لەگەڵ هەموو ئەمەشدا هێشتا درۆ دەکات، بگرە سوێندی درۆش دەخوات! تۆ بڵێی دەشیەوێ کێی پێ بخەڵەتێنێت؟! خوای مەزنی ئاگادار! ئەمە هیچ لێکدانەوەیەکی بۆ نییە جگە لە سڕانەوەی تەواوی بینایی و عەقڵ.

﴿يَومَ يَبعَثُهُمُ اللَّهُ جَميعًا فَيَحلِفونَ لَهُ كَما يَحلِفونَ لَكُم وَيَحسَبونَ أَنَّهُم عَلى شَيءٍ أَلا إِنَّهُم هُمُ الكاذِبونَ﴾ [المجادلة: ١٨]، «ڕۆژێک خوا هەموویان زیندوو دەکاتەوە جا سوێندی بۆ دەخۆن چۆن سوێند بۆ ئێوە دەخۆن، واش دەزانن شتێکیان بەدەستەوەیە، ئەرێ بەڕاستی ئەوانەن درۆکاران.»

بە هەمان شێوە و شێوازی سواو و دووبارە، سوێند دەخۆن و واش دەزانن سوودێکی بۆیان هەیە، لە بەردەست خوایەکدا کە نهێنی و شاراوەتر لە نهێنیش پێ دەزانێت!

ئەمە ئەگەر بە ڕاهاتنێکی سەرسوڕهێنەر نەبێت لە دونیادا لەسەر درۆکردن و ژیان لەگەڵی، دووڕوو ئاوا نەدەگەیشت بەم ئاستە نزمە... ئالوودەی درۆ و بگرە سوێندی درۆش بووە، ئەمە لە دڵیدا چەسپیوە و کفن و خاکیش نەیانتوانیوە بیسڕنەوە، سەدەکان یەک بەشوێن یەکدا کە بەر لە قیامەت هاتوون و چوون، هیچیان لەگەڵی پێ نەکراوە.

تەماشا ئەم حاڵەتە سەیرەی هەندێکیان کە قورئان باسی دەکات:

﴿وَإِذا لَقُوا الَّذينَ آمَنوا قالوا آمَنّا وَإِذا خَلا بَعضُهُم إِلى بَعضٍ قالوا أَتُحَدِّثونَهُم بِما فَتَحَ اللَّهُ عَلَيكُم لِيُحاجّوكُم بِهِ عِندَ رَبِّكُم أَفَلا تَعقِلونَ﴾ [البقرة: ٧٦]، «کاتێک بە باوەڕداران دەگەن دەڵێن ئێمەش باوەڕمان هێناوە، کاتێکیش بەتەنیا دەکەونەوە

لەگەڵ یەکتریدا دەڵێن ئەریٚ ئێوە شتێک کە خوا زانستی پیٚ داون و ئاگاداری کردوون بۆ ئەو باوەڕدارانەی دەگێڕنەوە کە دوایی بێن لەلای پەروەردگارتان (لە ڕۆژی دواییدا) بیکەن بە بەڵگە بەسەرتانەوە؟ باشە عەقڵ و ژیریتان نییە؟»
گرۆیەک لە دووڕووانی جوولەکە دان بەوەدا دەنێن کە پەروەردگار موحەممەدی (ﷺ) بە پێغەمبەر ناردووە و بگرە باس لە وەسفە واقیعییەکانیشی دەکەن کە لە تەوراتدا هاتووە، گرۆیەکی دیکەش لۆمەیان دەکەن چونکە ئەم دانپێدانانە بەڵگەی باوەڕداران بەهێز دەکات بەسەر دووڕووان لە ڕۆژی دواییدا. بەڵکوو، بە جۆرێکیش توند سەرزەنشتیان دەکەن، پێیان دەڵێن: " أفلا تعقلون - یەعنی ئێوە فام و عەقڵتان نییە!" چۆن بڵێی باس لە خوایەکی نائامادە دەکەن کە ئاگای لەم ژووانەیان نییە و نایبیستێت، یان ڕۆژی دوایی نازانێت چی لە سینەیاندایە!

ئیبن عاشوور لەبارەی (لیحاجوکم بە عند ربکم - تاکوو لەلای پەروەردگارتان بیکەنە بەڵگە بەسەرتانەوە) دەفەرمووێت: "بێگومان مەبەست لەوە ڕۆژی دواییە، واتە ئەوە دەکەنە بەسەرتانەوە لە بەردەستی خوادا، کە پێغەمبەرەکەی ئەوان ڕاستە و ئێوەش ئەو کات دەبێت بار و سزای بڕوانەهێنانتان پێی، هەڵبگرن و بیچەشن. ئەمەش هەمان ڕێڕەوی سەربوردەی حاڵی بیروباوەڕی جوولەکەیە کە پەروەردگار دەچوێنن بە کاربەدەست و پادشا مرۆڤەکانەوە کە فێڵیان لیٚ دەکرێت و هەر بە هەمان هۆکار و هەستەوەرە ڕووالەتییەکان ئاگاداری شتەکان دەبێت و بڕیاریان لەسەر دەدات. بۆیە زۆر خەریکی حیلەشەرعی و پێچوپەنابازی دەبوون لەناو ئایینی خۆشیاندا، بڕۆ دەبینی کتێبەکانیان پڕە لە باسی ئەوەی خوا وای دەزانی فلانە شت وایە و دوایی بۆی دەرکەوت پێچەوانەی گومانی ئەو بووە".

جا لە دواتردا پەروەردگار سەرنجمان ڕادەکێشێت بۆ ئەم کەمعەقڵییەیان: ﴿أَوَلا يَعلَمونَ أَنَّ اللَّهَ يَعلَمُ ما يُسِرّونَ وَما يُعلِنونَ﴾ [البقرة: ٧٧]، «ئەریٚ نازانن (الله) ئەوەی دەیشارنەوە و ئەوەی ئاشکرای دەکەن هەمووی دەزانێت» ئەم

ئاستە خەیاڵییە لە لادان، پێویستی بە ڕاهێنان و ڕاهاتنێکی دووروودرێژە لەسەر درۆکردن! جا فریودانی خود و پاشان فریودانی خەڵک و پاشان فریودانی خوا لە دونیادا و ئەوجا فریودانی خوا لە ڕۆژی دواییدا. ئەوەش چونکە دڵەکانیان ڕەق بووە و هەستیان لەدەست داوە:

﴿يُخادِعونَ اللَّهَ وَالَّذينَ آمَنوا وَما يَخدَعونَ إِلّا أَنفُسَهُم وَما يَشعُرونَ﴾ [البقرة: ٩]، «وا دەنوێنن خوا و باوەڕداران فریو دەدەن، بەڵام تەنیا خۆیان فریو دەدەن و هەستیشی پێ ناکەن.»

سا خوایە ئێمە بپارێزە لە هەڵدێرانە ناو ئەم چاڵاوە بۆگەنانەدا!

## ڕاستگۆیی، بە کردەوە و قوربانیدان دەردەکەوێت

هەموو کەس توانای بانگەشەلێدانی هەیە، بەڵام کردەوە تەنیا ڕاستاڵان پێی دەوێرن، بەتایبەت ئەگەر قوربانیدانی بوێت بە گیان و بە ماڵ وەک جیهاد. بۆیە دەبینیت پەروەردگار لە سوورەتی بەڕائەتدا پەردەی لەسەر دووڕووان هەڵماڵیوە و باسی دواکەوتنیانی لە جیهاد کردووە، دەفەرموێت: ﴿يا أَيُّهَا الَّذينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَكونوا مَعَ الصّادِقينَ ﴿١١٩﴾ ما كانَ لِأَهلِ المَدينَةِ وَمَن حَولَهُم مِنَ الأَعرابِ أَن يَتَخَلَّفوا عَن رَسولِ اللَّهِ وَلا يَرغَبوا بِأَنفُسِهِم عَن نَفسِهِ﴾ [التوبه: ١١٩ - ١٢٠]، «ئەی ئەوانەی باوەڕیان هێناوە لە خوا بترسن و لەگەڵ ڕاستگۆیاندا بن (١١٩) ئەهلی مەدینە و ئەوانەشی لە دەوروبەریانن لەدەشتەکییان بۆیان نەبوو لە پێغەمبەری خوا دوا بکەون، یان گیانی خۆیان بخەنە پێش گیانی ئەو.»

باوەڕداری ڕاستگۆ، ڕاستییەتیی ئیمانی بەوە دەسەلمێنێت چرووکی بە گیانی خۆی نەکات و نەیگرێتەوە لە قوربانییەک کە پێغەمبەی خوا (ﷺ) خۆی داویەتی، خۆ بەدوور نەگرێت لە چەرمەسەری و ناڕەحەتییەک کە

پێغەمبەری خوا (ﷺ) خۆی تێی کەوتووە. باوەڕداری ڕاستگۆ بە خۆی ناڵێت: "ئەریَ من کە خاوەن موڵک و ماڵ و ئەرزەی زۆر و گرانبەهام، خاوەن عەقڵییەتی زیرەک و بەهرەی ناوازەم، چۆن خۆم بدەمە بەر مەترسی؟!" ﴿وَلا يَرغَبوا بِأَنفُسِهِم عَن نَفسِهِ﴾ «گیانی خۆیان نەخەنە پێش گیانی ئەو» جا وەختێک قوربانیدانێک هاتە پێش لەپێناو خوادا، ڕەزیلی بە گیانی خۆی نەکات، کە پێغەمبەری خوا ڕەزیلی بە گیانی خۆی نەکردووە.

هەروەها دەفەرموویت: ﴿قالَتِ الأَعرابُ آمَنّا قُل لَم تُؤمِنوا وَلٰكِن قولوا أَسلَمنا﴾ [الحجرات: ١٤]، «دەشتەکییان گوتیان باوەڕمان هێنا، بڵێ باوەڕتان نەهێناوە، بەڵام بڵێن موسڵمان بووین.» هەتا ئەو جێگەی دەفەرموویت: ﴿إِنَّمَا المُؤمِنونَ الَّذينَ آمَنوا بِاللَّهِ وَرَسولِهِ ثُمَّ لَم يَرتابوا وَجاهَدوا بِأَموالِهِم وَأَنفُسِهِم فى سَبيلِ اللَّهِ أُولٰئِكَ هُمُ الصّادِقونَ﴾ [الحجرات: ١٥]، «بەڕاستی باوەڕداران تەنیا ئەوانەن کە باوەڕیان بە خوا و پێغەمبەرەکەی هێناوە و پاشانیش نەکەوتوونەتە شکەوە و جیهادیان بە ماڵ و گیانیان کردووە لەپێناو خوادا ئەوانەن ڕاستگۆیان.»

دەبینی خوای گەورە ڕاستگۆیی -کە دژی سیفەتی درۆکردنی دووڕووانە- بە دوو شت داناوە، باوەڕێک دوودڵی و شک توخنی نەکەوتووە هەروەها جیهاد. (الله) فەرمووشیەتی: ﴿لَيسَ البِرَّ أَن تُوَلّوا وُجوهَكُم قِبَلَ المَشرِقِ وَالمَغرِبِ وَلٰكِنَّ البِرَّ مَن آمَنَ بِاللَّهِ وَاليَومِ الآخِرِ وَالمَلائِكَةِ وَالكِتابِ وَالنَّبِيّينَ وَآتَى المالَ عَلىٰ حُبِّهِ ذَوِي القُربىٰ وَاليَتامىٰ وَالمَساكينَ وَابنَ السَّبيلِ وَالسّائِلينَ وَفِي الرِّقابِ وَأَقامَ الصَّلاةَ وَآتَى الزَّكاةَ وَالموفونَ بِعَهدِهِم إِذا عاهَدوا وَالصّابِرينَ فِي البَأساءِ وَالضَّرّاءِ وَحينَ البَأسِ أُولٰئِكَ الَّذينَ صَدَقوا وَأُولٰئِكَ هُمُ المُتَّقونَ﴾ [البقرة: ١٧٧]، «چاکە ئەوە نییە ڕوو بکەنە ڕۆژهەڵات یان ڕۆژئاوا، بەڵکوو ئەوە چاکەیە کەسێک باوەڕی بە خوا و ڕۆژی دوایی و فریشتەکان و پەڕتووکی ئاسمانی و پێغەمبەران هێنابێت و سەرەڕای خۆشویستنی پارە و ماڵ بچێت بیبەخشێت بە خزمان و هەتیوان و نەداران و ڕێبواران و ئەوانەی داوای دەکەن، هەروەها (بیبەخشێت) بۆ

ئازادکردنی گەردنی کۆیلەکان و نوێژ بەرپا بکات و زەکات بدات و ئەوانەی پەیمان دەبەنە سەر وەختێک پەیمانیان داوە و ئارامگران لە سەختی (هەژاری) و ناهەمواری (نەخۆشی)دا و لە وەختی ئەو پەڕی توندیی جەنگ و جیهاددا، ئەوانەن ڕاستیان کردووە و ئەوانەن لەخواترسان.»

(حين البأس - وەختی گەرمەی جەنگ و جیهاد) واتە لە ناوەندەکانی گەرمەی شەڕ و هەڵادا. ئەم ئایەتە بە دەق دەفەرمووێت کە ڕاستگۆیان -لەبەرانبەر دووڕوواندا کە درۆزنن- ئەوانەن کە ئەم کردەوانەیان هەیە. بینیشمان و لەمەودواش دەیبینین، کە دووڕووان پیاوی ئەو کارانە نین. لەبری باوەڕ، گومان. لەبری بەرپاکردنی نوێژ، دواکەوتن لێی و هەستانی تەمەڵانە بۆی. لەبری دانی زەکات بە دڵنیایی و دڵفراوانییەوە، زەکاتدانێکی قەڵس و قەبز و ڕقاوی. لەبری بردنەسەری پەیمان، شکاندن و پشتکردن و خۆگێلکردن لێی. لەبری ئارامگری، هەڵاتن و دۆڕاندن و ترسنۆکی. بە جۆرێک ئەگەر داوای کوفریشیان لێ بکرێت هەر زوو ڕادەست دەبن و زۆر لەسەری ناوەستن، ڕقیشیان دەبێتەوە لە قوربانیدان لەپێناو خوادا.

# ٧- ڕقبوونەوە لە قوربانیدان لەپێناو خوادا

مرۆڤ بە سروشتی خۆی ڕقی لە نارەحەتی و خۆدانەبەر مەترسی و تیاچوونە، بۆیە پەروەردگاری باڵادەست فەرموویەتی: (كتب عليكم القتال وهو كره لكم - جەنگتان لەسەر فەرز کراوە و ئەویش بۆ ئێوە ناحەز و ناخۆشییە) ئەم ڕقلێبوونە سروشتییە، دوورڕوویی نییە. بەڵام لەبەرانبەریشدا باوەڕدار قوربانیدانی پێ خۆشە وەک ئەوەی گوێڕایەڵی خوا و نزیکبوونەوەیە لێی و پاداشتی لەسەرە و سەرەنجامی باشی هەیە لە دونیا و دواڕۆژدا. ئەم حەزپێکردنەیە کە لەلای دووڕوو بوونی نییە.

وەک چۆن باسەکەی ئێمە لێرەدا لەبارەی قوربانیدانێکیشەوە نییە کە مرۆڤ گومانی هەیە ئایا لەسەری فەرزە یان ئایا ئەسڵەن لەلای خوا خوازراو و خۆشەویستە. بۆ نموونە: ڕووبەڕووبوونەوەی ستەمکاران و دوژمنانی ئایین بە دەست و زمان و شمشێر کارێکی خۆشەویستە لەلای باوەڕداران. گومان بەرانبەر بە زۆرێک باوەڕدار وایە، تەنانەت ئەوانەشیان کە تاوانیان هەیە، ئامادە بن قوربانی لەو پێناوەدا بدەن ئەگەر قایل بن بە ڕاستییەتیی ئەم ڕووبەڕووبوونەوەیە و بەوەی لە جێی خۆشەویستی و ڕەزامەندیی پەروەردگاردایە. کاتێک ئەم قایلبوونە دروست دەبێت، ئازایەتی و پێشڕەویی سەیروسەمەرەیان لێ دەوەشێتەوە. بەڵام، دەشێت بکەونە دوودڵییەوە بەهۆی گومانکردنیان لە متمانەدارییەتیی ئەوانەی بانگ بۆ ئەم ڕووبەڕووبوونەوانە و ڕاستییەتیی پەیڕەوییەکەی دەکەن و بەهۆی نەبوونی پێشەنگی متمانەپێکراویشەوە، هەروەها چونکە لەوەش دەترسن لاوازی و شکانی زیاتری بۆ موسڵمانان لێ بکەوێتەوە. لەو هەلومەرجەدا کەس بۆی نییە تۆمەتی دوورڕوویی و ڕقبوون لە قوربانیدانی ڕێگەی خوایان لێ بدات.

بەڵام، دووڕوو تاوانەکانی هێندە لەسەر سەری گلێربوونەتەوە و باری قورس بووە و دڵی نەخۆشی لێی داوە و ئیتر کەوتووەتە گومان لەمەڕ خوا و ڕۆژی دواییەوە. ئیدی چۆن چاوەڕوانی قوربانیدانی لەو پێناوەدا لێ بکرێت؟!

پەیوەندیی ڕقبوونەوە لە قوربانیدانی ڕێگەی خوا بە گومانکردن لە ئایین و بە نەخۆشیی دڵ و تاوانەکانەوە:

ئێستا با نموونەیەک لەسەر ڕقبوونەوە لە جیهادی ڕێگەی پەروەردگار و دواکەوتن لێی بهێنینەوە، تا ببینین کە چۆن وەک زۆرێک لە سیفەتەکانی دووڕووان، ئەم ڕقلێبوونەوە و جێمانە لە جیهاد، گومانکردن لە ئایین سەرچاوەیەتی، کە ئەویش لە شوێنکەوتنی ئارەزووەوە پەیدا بووە، ئەویش لە جێی خۆیەوە بەسەر دڵی نەخۆشدا زاڵ دەبێت، بەپێی پاڵپشتیی کاروانی بەردەوامی تاوانەکان.

جا تاوانەکان، پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿فَما لَكُم فِي المُنافِقينَ فِئَتَينِ وَاللَّهُ أَركَسَهُم بِما كَسَبوا﴾ [النساء: ٨٨]، «چیتانە ئێوە سەبارەت بە دووڕووان بوون بە گرۆوە کە خوا پەکی خستوون و گلاندوونی بە کاری خۆیان.»

بوخاری گێڕاوییەتییەوە کە لەسەر ئەو دووڕووانە دابەزیوە کە لەشکرەکەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) گەڕانەوە وەختێک دەرچووبوو بەرەو ئوحود، جا ڕەتیان کردەوە بەردەوام بن لەسەر ڕێگە بەرەو جیهاد.

کەواتە؛ جێمان لە جیهاد، بەری تاوانەکانە!

هەروەها فەرموویەتی: ﴿إِنَّ الَّذينَ تَوَلَّوا مِنكُم يَومَ التَقَى الجَمعانِ إِنَّما استَزَلَّهُمُ الشَّيطانُ بِبَعضِ ما كَسَبوا﴾ [آل عمران: ١٥٥]، «بەڕاستی ئەوانەی پشتیان هەڵکرد لە ڕۆژی پێکگەیشتنی دوو کۆمەڵەکەدا ئەوانە شەیتان هەڵیخلیسکاندن بە هەندێک لە کاری خۆیان.» ئەم ئایەتەش هەرچەند لەسەر باوەڕداران دابەزیوە نەک دووڕووان، بەڵام ئاماژەپێدەری هەمان واتایە، کە ئەو تاوانانەی مرۆڤ

لە ڕۆژانی خۆشی و پشوودا دەیخاتە بارخانەی خۆیەوە، لە ڕۆژانی تەنگژە و جیهاددا بەرۆکی دەگرنەوە و لاوازی دەکەن لە ڕابوون بۆ قوربانیدان لەپێناو (الله)دا.

ئەوجا پەیوەندیی ڕقبوونەوە لە جهاد بە نەخۆشیی دڵەوە، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَيَقولُ الَّذينَ آمَنوا لَولا نُزِّلَت سورَةٌ فَإِذا أُنزِلَت سورَةٌ مُحكَمَةٌ وَذُكِرَ فيهَا القِتالُ رَأَيتَ الَّذينَ في قُلوبِهِم مَرَضٌ يَنظُرونَ إِلَيكَ نَظَرَ المَغشِيِّ عَلَيهِ مِنَ المَوتِ فَأَولى لَهُم ﴿٢٠﴾ طاعَةٌ وَقَولٌ مَعروفٌ فَإِذا عَزَمَ الأَمرُ فَلَو صَدَقُوا اللَّهَ لَكانَ خَيرًا لَهُم ﴿٢١﴾ فَهَل عَسَيتُم إِن تَوَلَّيتُم أَن تُفسِدوا فِي الأَرضِ وَتُقَطِّعوا أَرحامَكُم﴾ [محمد: ٢٠ – ٢٢]، «باوەڕداران دەڵێن با سوورەتێک دابەزێنرێت (کە ڕێگەی جیهادمان بدات) جا وەختێک سوورەتێکی ڕوون و چەسپاو دادەبەزێت و باسی شەڕی تێدا دەکرێت، دەبینیت ئەوانەی دڵیان نەخۆشی تێدایە تەماشات دەکەن وێنەی تەماشاکردنی کەسێک بووراببێتەوە لە ترسی مردن، سا لەپێشتر بوو بۆیان (٢٠) گوێڕایەڵی و قسەی چاک بکەن، جا کاتێک کار چەسپا و هاتە پێش ئەگەر لەگەڵ خوا ڕاستیان بکردایە باشتر بوو بۆیان (٢١) جا نزیکە وەختێک پشتتان هەڵکرد خراپە بنێنەوە لە زەویدا و سیلەی ڕەحمتان بپچڕێنن.»

جا نەخۆشبوونی دڵ، ترسنۆکی دەچێنێت لە ڕێگەی جیهاددا و وا لە خاوەنەکەی دەکات وەختێک زانی ڕووبەڕووبوونەوە نزیک بووەتەوە، دەم داچەقێنێ و زەرد هەڵگەڕێ. بڕوان لە پێوەستیی نەخۆشبوونی دڵ بە تاوانەکان و خراپەنانەوە لە زەویدا و پچڕاندنی سیلەی ڕەحم.

هەروەها پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَإِذا أُنزِلَت سورَةٌ أَن آمِنوا بِاللَّهِ وَجاهِدوا مَعَ رَسولِهِ استَأذَنَكَ أُولُو الطَّولِ مِنهُم وَقالوا ذَرنا نَكُن مَعَ القاعِدينَ ﴿٨٦﴾ رَضوا بِأَن يَكونوا مَعَ الخَوالِفِ وَطُبِعَ عَلى قُلوبِهِم فَهُم لا يَفقَهونَ﴾ [التوبة: ٨٦ – ٨٧]، «وەختێ سوورەتێک دابەزێنرێت کە باوەڕ بە (الله) بهێنن و لەگەڵ پێغەمبەرەکەیدا

جیهاد بکەن، دەستروێشتووانی ئەوانە مۆڵەتت لێ وەردەگرن و دەڵێن لێ گەڕێ ئێمە لەگەڵ دانیشتوواندا بین (٨٦) ڕازی بوون بەوەی لەگەڵ ئافرەتانی جێماودا بن و مۆریش دراوە لە دڵیان ئیتر ئەوان تێ ناگەن.»

جا دەستهەڵگرتن لە جیهاد پەیوەندیدارە بە مۆرکرانی دڵەوە، کە خراپترین جۆرەکانی نەخۆشیی دڵە. نەخۆشبوونی دڵ یەکخەری دەرچوون بۆ جیهادە و ڕازیبوونیش بە جێمان لە جیهاد نەخۆشیی دڵ زیاتر دەکات. باسەکەش لێرەدا لەسەر ڕازیبوونە بە دانیشتن، کە بریتییە لە ڕقبوون لە قوربانیدانی ڕێگەی خوا بەهۆی کەمئیمانی و دڵنیانەبوون لە پاداشتی مەزن.

پەیوەندیی ڕقبوونەوە لە جیهادیش بە گومانکردن لە ئایینەکەی خوا، پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿إِنَّما يَستَأذِنُكَ الَّذينَ لا يُؤمِنونَ بِاللَّهِ وَاليَومِ الآخِرِ وَارتابَت قُلوبُهُم فَهُم في رَيبِهِم يَتَرَدَّدونَ﴾ [التوبه: ٤٥]، «بەدڵنیاییەوە تەنیا ئەوانە مۆڵەتت لێ دەخوازن (تا نەیەن بۆ جیهاد ) کە باوەڕیان بە خوا و ڕۆژی دوایی نییە و دڵەکانیشیان لە ڕاڕاییدایە سا لە گومانی خۆیاندا هەر دێن و دەڕۆن و دوودڵ دەتلێنەوە.» جا ئەوانە مۆڵەتیان لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) وەرگرت کە دەرنەچن بۆ غەزای تەبووک.

هیچیش سەیر نییە، چۆن مرۆڤ گیانی خۆی بەخت بکات لەپێناو کەسێکدا کە باوەڕی پێی نییە؟! خۆ ئەگەر داخوازییەکان ئاسان و نزیک بن لەوانەیە دووڕوو گرفتێکی نەبێت کە پێیان هەستێت، بە شێوازی ﴿وَما أَظُنُّ السّاعَةَ قائِمَةً وَلَئِن رُجِعتُ إِلى رَبّي إِنَّ لي عِندَهُ لَلحُسنى﴾ [فصلت: ٥٠] «پێشم وا نییە قیامەت هەستێت و ئەگەریش بگەڕێنرێمەوە بۆ لای پەروەردگارم بێگومان لەلای ئەو باشترین بەشمە.» جا ئاساییە دووڕوو هەندێک لە ڕاسپاردەکان بەجێ بهێنێت بە مەبەستی یەدەگ، بە جۆرێک کە لە ئەگەری ڕاستگەڕانی بوونی خوایەک و دوارۆژێک و بەهەشت و دۆزەخێکدا، بە خەیاڵی خۆی

وا شتێکی پێشکەش کردووە کە ڕزگاری بێت، لە ئەگەری نەهاتنەپێشی هیچێک لەوەشدا، ئەم زۆری نەدۆڕاندووە! کەواتە خۆدانە بەر مەترسی بۆ شتێک کە دڵنیا نییە لێی، دووڕوو گیانبازی وای قەت لێ ناوەشێتەوە.

**دووڕوو هونەری بیانووهێنانەوەی جۆربەجۆری هەیە لەمەڕ دواکەوتنی لە قوربانیدانی ڕێگەی خوا:**

١) جارێک دەڵێت کەشوهەوا لەبار نەبووە! (الله) فەرموویەتی: ﴿فَرِحَ المُخَلَّفونَ بِمَقعَدِهِم خِلافَ رَسولِ اللَّهِ وَكَرِهوا أَن يُجاهِدوا بِأَموالِهِم وَأَنفُسِهِم فى سَبيلِ اللَّهِ وَقالوا لا تَنفِروا فِى الحَرِّ﴾ [التوبە: ٨١]، «جێماوان شاد بوون بە دانیشتنیان لە پشت پێغەمبەری خواوە و ڕقیان لەوە بوویەوە بە ماڵ و گیانیان جیهاد بکەن لەپێناو خوادا و وتیان لە گەرمادا دەرمەچن.» چۆن بڵێی جیهاد چاوەڕێ دەکات تاکوو هەوا خۆشتر بێت و گەشتێکی جیهادی سەرنجڕاکێش و دڵڕفێن بێت!

لەگەڵمدا بهێنە پێش چاو خۆت چۆن کاتێک کە لە چاوی باوەڕداران دیار نەمان و کۆ بوونەوە و دەستیان کرد بە گەپ و گەمە و پێکەنین بەو بەهانە هیچوپووچانەی خۆیان، جا پەروەردگاریش وەڵامێکی دانەوە دڵ بهەژێنێت و جەستەیەک کە ڕۆحی تێدا بێت لێی هەڵبلەرزێت: ﴿قُل نارُ جَهَنَّمَ أَشَدُّ حَرًّا لَو كانوا يَفقَهونَ ۝٨١ فَليَضحَكوا قَليلًا وَليَبكوا كَثيرًا جَزاءً بِما كانوا يَكسِبونَ﴾ [التوبە: ٨١ - ٨٢]، «بڵێ ئاگری دۆزەخ گەرمترە ئەگەر تێ بگەیشتنایە (٨١) سا با کەم پێ بکەنن و زۆر بگرین لە پاداشتی کارێک کە دەیانکرد.»

با زۆر بگرین! پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: "کەسێک کە سووکترین سزای هەبێت لە هاوەڵانی ئاگر، ئەوەیە کە دوو نەعل و دوو قەیتانی ئاگرینی لە پێدایە مێشکی لێی دێتە کوڵ چۆن مەنجەڵ دەکوڵێت ئاوا، بۆ خۆشی وا نازانێت سزای کەس لە هی ئەو سەختتر بێت، بەڵام بەڕاستی سزاسووکترینیان ئەمە."[1]

---

(١) [مسلم: ٢١٣]

ئیتر هاوەڵانی چاڵاوی هەرەخواری ئاگر حاڵیان چۆن بێت؟! بێگومان ئەورۆژ دڵیان بەو دانیشتن و مەنزڵەیان خۆش نابێت! بگرە وەک ئەوەی دۆزەخ پێیان بڵێت: "ئێوە بە گەرما دەرمەچن، گەرما خۆی دێت بۆ لای ئێوە!" دیسان بڕوانە چۆن پەروەردگار فەرموویی: ﴿فَرِحَ المُخَلَّفونَ﴾ «جێماوان شاد بوون» ئەمەش جیاوازیی نێوان باوەڕدار و دووڕووە. باوەڕدار دەشێت بکەوێتە سەرپێچییەکەوە بەهۆی حەزەوە، یان سستی بنوێنێت لە گوێڕایەڵییەک، بەڵام دان بە گوناهی خۆیدا دەنێت و ڕقی لێیەتی و شاد نییە پێی بگرە پەشیمانیش دەبێتەوە، وەک لەگەڵ کەعبی کوڕی مالیک و دوو هاوڕێکەیدا ڕوویدا خوا لێیان ڕازی بێت، کاتێک جێمان لە تەبووک.

٢) جارێکی دیکە دڵی دووڕوویی تێخزاو دەڵێت کاتەکە گونجاو نییە بۆ قوربانیدانی واجب لە ڕێگەی خوادا. ئەو هێشتا دەیەوێت چێژی خۆی لە دونیا وەرگرێت. پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿أَلَم تَرَ إِلَى الَّذينَ قيلَ لَهُم كُفّوا أَيدِيَكُم وَأَقيمُوا الصَّلاةَ وَآتُوا الزَّكاةَ فَلَمّا كُتِبَ عَلَيهِمُ القِتالُ إِذا فَريقٌ مِنهُم يَخشَونَ النّاسَ كَخَشيَةِ اللَّهِ أَو أَشَدَّ خَشيَةً وَقالوا رَبَّنا لِمَ كَتَبتَ عَلَينَا القِتالَ لَولا أَخَّرتَنا إِلى أَجَلٍ قَريبٍ قُل مَتاعُ الدُّنيا قَليلٌ وَالآخِرَةُ خَيرٌ لِمَنِ اتَّقى وَلا تُظلَمونَ فَتيلًا﴾ [النساء: ٧٧]، «ئەرێ نەتبینی ئەوانەی پێیان گوترا دەست بگرنەوە (لە جەنگ) و نوێژ بەرپا بکەن و زەکات بدەن جا کاتێکیش جەنگیان لەسەر فەرز کرا دەروانی گرۆیەکیان لە خەڵک دەترسن هێندەی ترسیان لە (الله)، یان زیاتر و دەڵێن پەروەردگارمان بۆچی جەنگت لەسەر فەرز کردین با دوات بخستینایە بۆ وادەیەکی نزیک، بڵێ گوزەران و چێژی دونیا کەمە و دواڕۆژ باشترە بۆ یەکێک لە خوا بترسێ و هێندەی دەزوولەیەکی سەر ناوکی خورما ستەمتان لێ ناکرێت.»

نەسائی و جگە لەویش بە سەنەدێکی دروست لە ئیبن عەبباسیان گێڕاوەتەوە کە ئەم ئایەتە تەنانەت هەندێک لە هاوەڵانی ڕاستاڵیشی گرتووەتەوە کە پێشتر

بە ڕاستی ئاواتی جیهادیان بوو بەڵام کاتی فەرزکردنی لاوازییان نواند. بەڵام، گەلێک جیاوازن ئەوانە لەگەڵ دووڕوواندا، چونکە ئەم گرۆ هاوەڵە با جارێکیش وەک تووشهاتێکی سەرپێیی گلابن، بەڵام پاش یادهێنانەوەی پەروەردگار بۆیان وەڵامی خوا و پێغەمبەریان دایەوە و ئازایانە ڕابوون و ئیدی جارێکی دیکەش دواکەوتنیان لێ نەبینرا، ئەم خلیسکانە کاتییەیان بە مێژوویەکی سپیی پاکی ڕووناک لە ئارامگری و چەسپان بۆ هەمیشە سڕییەوە، لەوەودوا کەس "خۆزگە" و "با وا بووایە"ی لێ نەبیستن. باشترین هەڵەکاریش ئەوەیە تەوبە دەکات.

بەڵام، دووڕووان وەختێک ڕووبەڕووبوونەوە نزیک بوویەوە و جەنگ فەرز کرا، ترس لە دڵیاندا کردی بە هەرا، ئیتر ترسیان لە خەڵک پێشی ترسی خواشی دایەوە، ڕەخنەیان لە قەدەر و فەرمانی خوا دەگرت لەگەڵ هەر تاقیکردنەوەیەکدا و لە دڵی خۆیاندا دەیانگوت: "پەروەردگارمان ئاخر بۆچی جەنگت لەسەر فەرز کردین؟!" گەورەترین هەوڵیان ئەوە بوو بە شێوەیەک خۆ لە پێشچاوی باوەڕداران ون بکەن هەستیان پێ نەکرێت و کەس گوێی لە شەقشەقەی دڵیان نەبێت لە ترسی جیهاد. کاتێکیش بە ناخۆشی و دڵی سارد و ئاوساوەوە بۆی دەربچوونایە، زۆر بەکەمی خۆیان لە سەختی دەدا. هەر لەم جەنگانەشیاندا: ﴿وَإِن تُصِبهُم سَيِّئَةٌ يَقولوا هٰذِهِ مِن عِندِكَ﴾ [النساء: ٧٨]، «ئەگەریش ناخۆشییەکیان تووش بێت دەڵێن ئەمە لای تۆوەیە.» واتا خەتای ئەوەیە شوێن ئایینی موحەممەد کەوتووین.

ئەم ترسەنۆکی و قین و بۆڵەبۆڵە لە دڵی دووڕوواندا هەر ویزەی دێ هەتا گیانیان دەردەچێت.

٣) جاری دواتر دەڵێت مەودای ئەم خاکی جیهادە دوورە:

﴿لَو كانَ عَرَضًا قَريبًا وَسَفَرًا قاصِدًا لَاتَّبَعوكَ وَلٰكِن بَعُدَت عَلَيهِمُ الشُّقَّةُ﴾

[التوبه: ٤٢]، «ئەگەر دەستکەوتێکی نزیک و ئاسان و سەفەرێکی مامناوەند بووایە شوێنت دەکەوتن، بەڵام مەوداکەیان لەلا دوورە.»

ئەو ئیمانەی مونافیق پێیەتی تەنیا بەشی مەودای نزیک دەکات، پاشی ئەو ئیتر سووتەمەنیی ئیمانی لێ دەبڕێت! خۆزگەش ئامانجی ئەم جیهادە دەستکەوتێکی وا بووایە شایەنی دەرچوون و ماندووبوون بایە؛ "بەهەشتێک بە پانتایی ئاسمانەکان و زەوی" لە دەروونی مرۆڤی دووڕوودا هێندەی پارچە دەستکەوتێکی دونیایی نرخی نییە!

٤) ئەمجار دەڵێت جیهاد تووشی فیتنەم دەکات و گوێڕایەڵیی خوا لە ئایینەکەی خوا دوورم دەخاتەوە!

زانایانی تەفسیر دەگێڕنەوە پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە میانەی ئامادەکاری بۆ غەزای ڕۆم، بە پیاوێکی فەرموو کە ناوی جەددی کوڕی قەیس بوو: "ئەرێ جەدد دەڵێی چی ئەمساڵ دەرچیت بۆ شەڕوشۆڕی ڕۆمەکان؟" ئەویش گوتی: "ئەی پێغەمبەری خوا مۆڵەتم بدە و تووشی فیتنەم مەکە سوێند بە خوا قەومەکەم هەموویان دەزانن هیچ پیاوێک هێندی من حەزی لە ژن نییە، جا دەترسم کاتێک ژنانی ڕۆمی دەبینم ئارامم لێیان نەبێت." خوای گەورەش ئەوەی دابەزاند: ﴿وَمِنهُم مَن يَقولُ ائذَن لي وَلا تَفتِنّي﴾ [التوبه: ٤٩]، «هەیانە دەڵێت مۆڵەتم بدە و تووشی فیتنەم مەکە.»

دیسان هەندێک لە خەڵکیش لەوانەیە بۆ دەستبەردان لە فەرمانێکی خوا، بەهانەی ئەوە بهێنێتەوە کە کارکردن بەم فەرمانە زیانی بۆ ئایین خۆی هەیە و دووری دەخاتەوە لێی، لە دڵی خۆیدا دەڵێت: "با ئەم تاوانە کردارییە بهێڵمەوە باشترە لەوەی تووشی ئەم بەڵا عەقیدەییە بێم کە لە دین دوور بکەومەوە." ئەمە لەوانەیە کەسێک بیڵێت کە پارەی بە حەرامی پەیدا دەکات و دەترسێت ئاستی ژیانی دابەزێت، یان ئافرەتێک کە هیچ ڕەچاوی ڕێسا شەرعییەکان ناکات لە

مامەڵەیدا. بەهانەیەک کە شەرعی نییە و زۆریشی لێ نەکراوە تاوان بکات.

دەی با هەموو ئەوانە لەم هۆشیاریدانەی (الله) بترسن: ﴿أَلَا فِي الفِتنَةِ سَقَطوا﴾[التوبه: ٤٩]، «ئەرێ ئەوە فیتنەیە کە تێی کەوتوون.»

ئەم بیانووە ناوبۆشە بۆ خۆی خودی فیتنە و ئاشووب و ماڵوێرانییە، وەک چۆن دەستبەردانیش لە فەرمانی خوا فیتنەیە، چەند دەبینین موسڵمانان لە ڕووبەڕووبوونەوەی باتڵ و پیلانگێڕییەکانی دوژمنانی ئوممەت سارد دەکرێنەوە، بە پاساوی ئەوەی ئەم ڕووبەڕووبوونەوانە ئاشووب و ماڵوێرانییان بە شوێنەوەیە، لە کاتێکدا حەقیقەتی دۆخەکە ئەوەیە گەنجانێک کە لەسەر قوربانیدانی ڕێگەی خوا پەروەردە نەکراون، ڕۆحیان ژەنگ هەڵدەهێنێت و دەکەونە زۆنگاوەکانی گومان و ئارەزووەوە کە ئەمەش خۆی خودی فیتنەیە.

٥) بێتەوە ئەمجاریشیان دەڵێت وەستانی ئێمە لە هێڵەکانی ڕووبەڕووبوونەوەدا هەڕەشە لە ئاسایشی ناوخۆییمان دەکات:

﴿وَيَستَأذِنُ فَريقٌ مِنهُمُ النَّبِيَّ يَقولونَ إِنَّ بُيوتَنا عَورَةٌ وَما هِيَ بِعَورَةٍ إِن يُريدونَ إِلّا فِرارًا﴾[الأحزاب: ١٣]، «کۆمەڵێکیشیان مۆڵەت لە پێغەمبەر وەردەگرن دەڵێن ماڵەکانمان بەدەرەوەیە و جێی ترسە، واش نییە و لە جێی ترسیشدا نییە تەنیا ئەوەیە دەیانەوێت هەڵبێن.»

دووڕووان بانگەشەی ئەوەیان کرد ماڵەکانیان نزیکی لەشکری دوژمنە و ترسی ماڵ و منداڵ و سامانەکانیان هەیە.

هەر بەم شێوەیەش، کاتێک دوژمن یەخەی وڵاتێک لە وڵاتانی موسڵمان دەگرێت و موسڵمانان هانا بهێنن بۆ لای برایانیان لە وڵاتانی دیکە، کەسانی بەربەست و نەفسنزم لەو وڵاتانەی دیکەدا، دروشمی ئەوە بەرز دەکەنەوە کە پاراستنی ئاسایشی وڵاتی خۆمان لەپێشترە هەتا سەرخستن و بەهاناوەچوونی

موسڵمانانی لێقەوماو، لە کاتێکدا ئەو ئایەتەش پێ دەزانن: ﴿وَإِنِ اسْتَنصَرُوكُم فِي الدِّينِ فَعَلَيْكُمُ النَّصرُ إِلَّا عَلَى قَومٍ بَيْنَكُم وَبَيْنَهُم مِيثَاقٌ﴾ [الأنفال: ٧٢]، «ئەگەر لە ئاییندا داوای بەهانەوەچوون و سەرخستنیان لێ کردن ئەوا سەرخستنیانتان لەسەر واجبە مەگەر دژی خەڵکێک بێت کە پەیماننامە لە نێوانتاندا هەیە.»

٦) ئەو جاریش بیانوو بە سەرقاڵبوونی بە ماڵ و کار و خێزانەوە دەهێنێتەوە:

﴿سَيَقُولُ لَكَ المُخَلَّفُونَ مِنَ الأَعرَابِ شَغَلَتنَا أَموَالُنَا وَأَهلُونَا فَاستَغفِر لَنَا يَقُولُونَ بِأَلسِنَتِهِم مَا لَيسَ فِي قُلُوبِهِم﴾ [الفتح: ١١]، «جێماوان لە دەشتەکییەکان، پێت دەڵێن ماڵ و سامان و خێزانەکانمان سەرقاڵیان کردین دەی تۆش داوای لێخۆشبوونمان بۆ بکە، شتێک بە زمانیان دەڵێن کە لە دڵیاندا نییە.»

ئەوانە وەختێک لەجێمان پێغەمبەر (ﷺ) ویستی مەککەی هەبوو و ئیحرامی عەمرەشی کردبوو و قوربانییەکانی ماڵی خوایشی دابووە پێش خۆی، ئەوەش بۆ ئەوەی خەڵکی مەککە بزانن بۆ شەڕ نەهاتووە، ئەو کات پێغەمبەری خوا (ﷺ) داوای لەو دەشتەکییانە کرد لەگەڵی دەرچن و موسڵمانان لە چاوی دوژمندا کافرانی قوڕەیش زۆر بکەن نەوەک بوێرن ناپاکییەکیان لەگەڵ بکەن.

خاوەخاویان کرد هەتا بەجێمان و گوێڕایەڵی نەبوون، جا پەروەردگار هەواڵی ئەوەی دا کە بیانووی سەرقاڵیی سامان و ماڵ و منداڵ دەهێننەوە و وەک ڕیابازی و دووڕوویش لە پێغەمبەر (ﷺ) دەخوازن داوای لێخۆشبوونیان بۆ بکات، چونکە لە ڕاستیدا پەشیمان نین لە دواکەوتنیان و تەوبەیەک لە دڵیاندا نییە.

ئیتر ئەمانەن بەهانەکانی دووڕووان بۆ هەڵاتن لە قوربانیدانی ڕێگەی (الله)! تاریکی و پووچییەتیی چین لەسەر چین، بیانووی مرۆڤی ڕسوا و ترسنۆک و بانگەشەی حەتاڵ و بەتاڵ و تەوەزەلان.

لەگەڵ هەموو ئەمەشدا سوێند دەخوات: ﴿وَأَقسَموا بِاللَّهِ جَهدَ أَيمانِهِم لَئِن أَمَرتَهُم لَيَخرُجُنَّ قُل لا تُقسِموا طاعَةٌ مَعروفَةٌ إِنَّ اللَّهَ خَبيرٌ بِما تَعمَلونَ﴾ [النور: ٥٣]، «سوێندیان بە خوا خوارد بە سوێندی سەختیان کە ئەگەر فەرمانیان پێ بکەیت دەردەچن، بڵێ سوێند مەخۆن، گوێڕایەڵییەکی ناسراو و تاقیکراوەیە، خواش ئاگادارە بەوەی دەیکەن.»

گوێڕایەڵییەکی وابەستە بە گورزێک مەرجی چەوتەوە، کە دووڕوو خۆی باش دەزانێت هەرگیز بەدی نایەن. چونکە ئەسڵەن ئەو نایەوێت قوربانی بدات لە ڕێگەی خوادا. وێنەی ئەو کابرایەی دەڵێت:

أُحَمِّسُ في الوغى أبناء قومي
وأحمي ظهرهم عند النزال
فإن فروا سبقتهم جميعا
وإن كروا فقد دبرت حالي
ولي عزم يشق الماء شقا
ويكسر بيضتين على التوالي



لە مەیدانی جەنگیدا هانی کوڕانی هۆز دەدەم و
پشتیان دەپارێزم لە وەختی تێکپرژاندا
خۆ گەر هەڵاتن پێش هەموویان دەدەمەوە و
ئەگەریش پێشڕەوییان کرد من مشووری خۆمم خواردووە
منیش ئیتر ورەیەکم هەیە ئاو لەت دەکات و
دوو هێلکەش بەسەر یەکەوە دەشکێنێت

لەگەڵ هەموو ئەمەدا دەبینی دووڕوو چەند دەستکراوەیە لە بانگەشەکردندا. پەروەردگار سەبارەت بە دووڕووان دەفەرمووێت: ﴿فَإِذا ذَهَبَ الخَوفُ سَلَقوكُم بِأَلسِنَةٍ حِدادٍ﴾ [الأحزاب: ١٩]، «وەختێکیش ترس و باس نامێنێت بە زمانی تیژ پڕتان دەدەنێ.»

ئیبن کەثیر دەفەرمووێت: "لە وەختی ئاساییشدا قسەی بەپێز و پاراو و تەواو و ڕاقی دەکەن و بانگەشەی پلەی بەرزی بەجەرگی و ئازایی بۆ خۆیان دەکەن، کە لەوەشدا درۆزنن".

واتە لە کاتی دواییهاتنی ڕووبەڕووبوونەوەدا، دەستپێشخەری و ئازایی و قوربانیدان بە درۆ دەدەنە پاڵ خۆیان.

دووڕوو بەوەندە ناوەستێت خۆی لە قوربانیدانی ڕێگەی خوا پاڵی داوەتەوە، بگرە غەیری خۆشی سارد دەکاتەوە:

پەروەردگار دەفەرمووێت: ﴿قَد يَعلَمُ اللَّهُ المُعَوِّقينَ مِنكُم وَالقائِلينَ لِإِخوانِهِم هَلُمَّ إِلَينا وَلا يَأتونَ البَأسَ إِلّا قَليلًا﴾ [الأحزاب: ١٨]، «پەروەردگار دەزانێت خەڵکانی بەربەست و پەکخەر لەناوتاندا و ئەوانەشی کە بە براکانیان دەڵێن وەرن بۆ لای ئێمە (کۆ بینەوە و پێکەوە پاڵی لێ بدەینەوە و نەچین) و ڕوو لە شەڕێکیش ناکەن مەگەر بەکەمی.»

هەروەها دەفەرمووێت: ﴿وَإِنَّ مِنكُم لَمَن لَيُبَطِّئَنَّ﴾ [النساء: ٧٢]، «تیاشتاندا هەیە بۆ خۆی نایەت و جگە لە خۆشی سارد دەکاتەوە.»

بۆخۆی دانیشتووە و قاچی خەڵکیش دەبەستێت لە جیهاد!

بەڵکوو دووڕوو تانە لە قوربانیدانی ڕێگەی خوا خۆشی دەدات و پێی وایە دەستبەردان لێی دانابییە: ﴿الَّذينَ قالوا لِإِخوانِهِم وَقَعَدوا لَو أَطاعونا ما قُتِلوا﴾ [آل عمران: ١٦٨]، «ئەوانەی بە براکانیان گوت و خۆشیان پاڵیان دابۆوە: ئەگەر بە

گوێی ئێمەیان بکردایە نەدەکوژران.»

ئەم ئایەتە ئەو قسەیە دەگوێزێتەوە کە دووڕووان گوتیان سەبارەت بەو موسڵمانانەی لە ڕۆژی ئوحوددا کوژران، ئەمە بوو: "ئەگەر گوێیان بە ڕاوێژی ئێمە بدایە کە دابنیشن و دەرنەچن لە لەشکری موسڵماناندا، نەدەکوژران ئاوا!"

سەلامەتی لە پاڵدانەوەی ماڵەوەدایە!

**یری الجبنـــــاءُ أن العجز عقلٌ**

**وتلك خديعـــــة الطبع اللئيم**

✿✿✿✿✿

**ترسنۆکان پێیان وایە نەتوانکاری ژیرێتییە و**

**ئەوەش فێڵی سروشتـــی نزمی خۆیانە**

بگرە هەندێک لە دووڕووان، ئەو بەڵایانەی تووشی باوەڕداران دەبێت، دەیکەنە بەڵگە و مایەی تانەدان لە ئایینەکە خۆی: ﴿يَقولونَ لَو كانَ لَنا مِنَ الأَمرِ شَيءٌ ما قُتِلنا هاهُنا﴾ [آل عمران: ١٥٤]، «دەڵێن گەر هیچێک لەو کارە بەدەست ئێمەوە با، لێرەدا نەدەکوژراین.»

هەندێک لە ڕاڤەوانان وەک بەغەوی دەیهێنێت فەرموویانە: "واتا ئەگەر لەسەر حەق بایین لێرەدا نەدەکوژراین." ئەوەی لە ئوحوددا بەسەر موسڵماناندا هات، کردیانە بەڵگە لەسەر بەتاڵییەتیی ئایینەکە خۆی. ئەژمار و لێکدانەوەکانی ئەوان پاکی زەمینییە، لەوە تێ ناگەن کە پەروەردگار بەو تاقیکردنەوەیە ڕیزی موسڵمانان پاک دەکاتەوە لە خڵتەی دووڕووان و شەهیدانێکی بڕیار داوە پلەیان بەرز بکاتەوە و پاداشتی گەورەیان بۆ بگێڕێت.

هەروەها دووڕووان بانگەشەی ئەوەیان کرد کە گوێڕایەڵیکردنی پێغەمبەر (ﷺ) بە دەرچوون بۆ شەڕی موشریکان، هۆکاری کارەساتەکەی ئوحود بوو. ڕاستیش ئەوەیە کە سەرپێچیکردنی پێغەمبەر (ﷺ) هۆکاری کارەساتەکە بوو: ﴿وَلَقَد صَدَقَكُمُ اللَّهُ وَعدَهُ إِذ تَحُسّونَهُم بِإِذنِهِ حَتّى إِذا فَشِلتُم وَتَنازَعتُم فِي الأَمرِ وَعَصَيتُم مِن بَعدِ ما أَراكُم ما تُحِبّونَ﴾ [آل عمران: ١٥٢]، «بەڕاستیش (الله) بەڵێنی خۆی کە بە ئێوەی دابوو، بەڕاست گەڕاند، وەختێک ئێوە کوشتاری چاکتان لەوان دەکرد بە ویستی وی، هەتا ئەو کاتی کە هەرەستان هێنا و ناکۆکیتان لە کارەکەدا تێ کەوت و سەرپێچیتان کرد پاش ئەوەی ئەوەی پیشان دان کە پێتان خۆشە.»

لەگەڵ ئەوەشدا دووڕووان بابەتەکە ئاوەژوو دەکەنەوە و ئەو کارەساتانەی تووشی موسڵمانان دێت، دەیدەنە پاڵ گوێڕایەڵیکردنی خوا و پێغەمبەرەکەی!

﴿وَإِن تُصِبهُم سَيِّئَةٌ يَقولوا هذِهِ مِن عِندِكَ﴾ [النساء: ٧٨]، «ئەگەریش ناخۆشییەکیان تووش بێت دەڵێن ئەمە لەلای تۆوەیە.»

واتا لەلای تۆوە (ئەی موحەممەد) بە هۆی شوێنکەوتنمان بۆ تۆ و دەستگرتن بە ئایینەکەتەوە، دەڵێن ئەمە خەتای موحەممەدە، ڕووانین و بەڕێوەبردنی وێرانە و لێی نازانێت.

پەروەردگاریش دەفەرموێت: ﴿يا أَيُّهَا الَّذينَ آمَنوا لا تَكونوا كَالَّذينَ كَفَروا وَقالوا لِإِخوانِهِم إِذا ضَرَبوا فِي الأَرضِ أَو كانوا غُزًّى لَو كانوا عِندَنا ما ماتوا وَما قُتِلوا لِيَجعَلَ اللَّهُ ذلِكَ حَسرَةً في قُلوبِهِم﴾ [آل عمران: ١٥٦].

پەروەردگار نەهی ئەوە لە بەندە باوەڕدارەکانی دەکات بەو بێباوەڕانە بچوێن کە نە باوەڕیان بە پەروەردگاریان هەیە و نە بە قەزا و قەدەری، لە دووڕووان و جگە لەوانیش، نەهییان لێ دەکات لە هەر شتێکدا بەوان بچن، بەتایبەتیش لەمەدا، ئەمیش ئەوەی کە بە براکانیان ئیتر برای ئایینییان یان برای نەژادییان

دەگوت: (إذا ضربوا في الأرض) واتا: گەشت بکەن بۆ بازرگانی (أو كانوا غزى) واتا: غەزاکار بن، پاشان کوشتن یان مردنیان بەسەر بێت، بەرهەڵستیی قەدەر دەکەن و دەڵێن: ﴿لو كانوا عندنا ما ماتوا وما قتلوا﴾ «ئەگەر لای ئێمە بان نە دەمردن و نە دەکوژران» ئەمەش درۆیە کە دەیکەن." چونکە بێباوەڕ و دووڕوو باوەڕیان بە قەدەر نییە، دەڵێن: "ئەمانە قسەی ئێمەیان ببیستایە و دەرنەچوونایە، لە گەشتدا نەدەمردن یان لە غەزادا نەدەکوژران".

بۆیە دەبینیت پەروەردگار وریاییمان دەداتێ لەم لۆجیکە درۆینەیە، کە ئەو نەهامەتییانەی بەرۆکی موسڵمانان دەگرێت بکەینە بەڵگە بەسەر بەتاڵییەتیی کەیسەکەیان و پاڵنەر بۆ ساردبوونەوە لە قوربانیدان، بەرپەرچی سەرجەم ئەم قسانە دەداتەوە، ئەوانەی گوتیان ﴿لَو أَطاعونا ما قُتِلوا﴾ [آل عمران: ١٦٨] «بەگوێی ئێمەیان بکردا نەدەکوژران.»

ئەوانەی گوتیان ﴿لَو كانَ لَنا مِنَ الأَمرِ شَيءٌ ما قُتِلنا هاهُنا﴾ [آل عمران: ١٥٤] «ئەگەر هیچێکمان لەو کارە بەدەست بووایە لێرەدا نەدەکوژراین.»

ئەوانەی گوتیان ﴿لَو كانوا عِندَنا ما ماتوا وَما قُتِلوا﴾ [آل عمران: ١٥٦] «ئەگەر لای ئێمە بان نەدەمردن و نەدەکوژران.»

بەرپەرچی ئەوان و بەرپەرچی هەر سەرشۆڕ و ساردکەرەوە و دەمبەبۆڵەیەکی وەختی هاتنی قەزا و قەدەر، دەداتەوە، ئەوانەی سەرکۆنەی باوەڕدارانی جوامێر و ئازا دەکەن، پەروەردگار بە جوانترین وەڵام و پاراوترین ڕوونکردنەوە وەڵامیان دەداتەوە: ﴿قُل لَو كُنتُم في بُيوتِكُم لَبَرَزَ الَّذينَ كُتِبَ عَلَيهِمُ القَتلُ إِلى مَضاجِعِهِم﴾ [آل عمران: ١٥٤] «بڵێ ئەگەر لە ماڵەکانیشتاندا بووایەن، ئەوانەی کوژرانیان لە چارە نووسرابوو وەدەر دەکەوتن و لە جێگەی تەرمەکانیاندا لە گۆڕەپانی شەڕدا، دەکەوتن.»

﴿وَلَئِن قُتِلتُم في سَبيلِ اللَّهِ أَو مُتُّم لَمَغفِرَةٌ مِنَ اللَّهِ وَرَحمَةٌ خَيرٌ مِمّا يَجمَعونَ﴾

«خۆ ئەگەر بکوژرێن لە ڕێگەی خوادا یان بمرن، لێخۆشبوون لەلایەن خواوە و میهرێکی باشترە لەوەی کۆی دەکەنەوە.» [آل عمران: ١٥٧]

﴿قُل فَادرَءوا عَن أَنفُسِكُمُ المَوتَ إِن كُنتُم صادِقينَ﴾ [آل عمران: ١٦٨] «بڵێ دەی مردن لە گیانی خۆتان لادەن ئەگەر ڕاست دەکەن.»

مردن لە کۆتاییدا، ئازا و ترسنۆک هەموو دەچنێتەوە

غير أن الفتى يلاقـــي المنايا
كالحات ولا يلاقـــي الهوانا
وإذا لم يكـــن من الموت بد
فمن العار أن تمـــوت جبانا



ئەوە نەبێـــت ئازا دەگات بە مردنی
درێژ و تاڵ بەڵام بە ڕیسوایـــی ناگات
وەختێکیش لە مردن دەربازییـــەک نییە
ئیتر شەرمە بە ترسنۆکـــی بمرین

بەڵام گەلێک جیاوازن ئەو دوو چەشنە مردنە، گەلێک جیاوازن ئەو شوێنەوارانەی هەر یەکێکیان بەجێی دەهێڵن، گەلێک جیاوازن دواهات و سەرەنجامیان.

"ئایا من دووڕوویم تێدایە بۆیە نامەوێت لەپێناو خوادا قوربانی بدەم؟ یان ئەوەیە قایل نیم کە ئەوە قوربانیدانی پێناوی خوا بێت؟"

ئەو باسەمان لە پێشتردا کردەوە کە زۆرێک لە ئێمەی موسڵمان دوودڵە لە قوربانیداندا نەک بەهۆی ئەوەش بێ کە دوورِوویی هەیە، بەڵکوو چونکە باوەڕی وا نییە ئەم قوربانیدانە خۆشویستراوە لای خوا و هەروا کەمیی پێشەنگ و ڕووننەبوونی ڕێگەکە. بەڵام ئایا گشت ئەمانە، دەبنە بەهانە بە دەستمانەوە؟ یان نا لەسەرمانە ڕاستیی نییەتمان بۆ خوای باڵادەست بسەلمێنین بەوەی قوربانییە بچووکترەکان پێشکەش بکەین، وەک دەستهەڵگرتن لە تاوانەکان و خووە حەرامکراوەکان لەپێناو خوادا و نییەتهێنان لەوەی یەکلا بین بۆ پێشکەشکردنی ئەو قوربانییە گەورانەشی بڕوامان وایە خوا دەیەوێت و پێی خۆشە کاتێک دێنە ئاراوە؟

پاشان چۆن ئومێدمان وا بێت خوا بەرچاوڕۆشنمان بکات بەوەی ئەم قوربانیدانە یان ئەوەی تریان خۆشەویستە لای ئەو یان نا، کاتێک ئێمە لە خوا ناترسین لەمەڕ گوناهانێکدا کە ئێستا دەیانکەین و بەردەوامین لەسەریان، لە کاتێکدا قوربانیدان بە وازهێنان لەو گوناهانە گەلێک ئاسانترە لە قوربانیدانە هەرەگەورەکە کە لەو فەرمایشتەی پەروەردگاردا باس کراوە: ﴿إِنَّ اللَّهَ اشْتَرَى مِنَ الْمُؤْمِنِينَ أَنفُسَهُم وَأَموالَهُم بِأَنَّ لَهُمُ الجَنَّةَ﴾ [التوبه: ١١١]، «بەڕاستی خوا لە باوەڕدارانی کڕیوەتەوە گیانیان و ماڵیان بەوەی بەهەشت بۆ ئەوان بێت.»

چۆن بەتەما بین بەرچاوڕۆشنمان بکاتەوە کە هەر خۆی فەرموویەتی: ﴿يا أَيُّهَا الَّذينَ آمَنوا إِن تَتَّقُوا اللَّهَ يَجعَل لَكُم فُرقانًا﴾ [الأنفال: ٢٩]، «ئەی ئەوانەی باوەڕیان هێناوە، ئەگەر ئێوە لە خوا بترسن خواش ڕوونی و جوێکردنەوە (ی نێوان حەق و باتڵ )تان پێ دەدات.» ڕۆشناییەک لە دڵتاندا کە ڕاستی و ناڕاستی و ئەوەی خوا خۆشی دەوێت و ئەوەی خوا ڕقی لێیە پێی جوێی بکەنەوە، دانایی و ترسنۆکیتان لێ تێکەڵ نەبێت و جیاوازی لەنێوان ئازایەتی و سەرشێتیدا بکەن.

چۆن بەئومێد بین ڕێنوێنیی ئەو ڕێگانەی قوربانیدانمان بکات کە خۆی

پێی ڕازییە لە حاڵێکدا کە لەگەڵ نەفسدا تێ ناکۆشین بۆ لەمەڕ تاوانەکان، دەشبیستین کە پەروەردگار دەفەرمووێت: ﴿وَالَّذِينَ جاهَدوا فينا لَنَهدِيَنَّهُم سُبُلَنا وَإِنَّ اللَّهَ لَمَعَ المُحسِنينَ﴾ [العنكبوت: ٦٩]، «ئەوانەشی لە ڕێگەی ئێمەدا تێ دەکۆشن هیدایەتی ڕێگەکانمانیان دەدەین و خواش لەگەڵ چاکەکاراندایە.» جا کاتێک ئێمە لەگەڵ نەفس و ئارەزووەکاندا هەوڵمان دا، ئەویش سبحانە و تعالی بە چاکەی خۆی ڕێنوێنیی ئەو ڕێگانەی قوربانیدانمان دەکات کە بە پێگەی بڵندی و شانوشکۆمان دەگەیەنن لە دونیا و لە بەهەشتەکەی دوارۆژیشدا.

ئەوەی گیرۆدەی دووڕوویی بوویێت، بە حاڵی ڕۆژانی خۆشیدا نازانرێت ئایا نییەتی قوربانیدانی پێناوی خوای هەیە یان نا:

زۆرجار دووڕووان پاکانەی ئەوە بۆ خۆیان دەکەن کە بە دڵ ئاواتی جیهادیان هەیە بەڵام هێشتا هەل نەڕەخساوە. پەروەردگار دەفەرمووێت:

﴿وَلَو أَرادُوا الخُروجَ لَأَعَدّوا لَهُ عُدَّةً﴾ [التوبە: ٤٦]، «ئەگەر نیازی دەرچوونیان هەبوایە کەلوپەلێکیان بۆ پێک دەهێنا و ساز دەکرد.»

خۆ ئەگەر ئەم ئاواتخواستنەیان ڕاست بووایە لە کاروکردەوەیاندا دەردەکەوت. بەڵام، کاتێک ئەژنۆیان شکا لە هەمبەر ئارەزووەکانیان، دڵەکانیشیان نەخۆش کەوت و ئەسڵەن دەرچوونیان بووە مایەی مەترسیش بۆ باوەڕدارانی ڕاستاڵ، چونکە دووڕوویەک کە ڕادەستی گومان و ئارەزووەکان بوویێت، چۆن گومانی ئەوەی پێ ببرێت لە وەختی ترس و پێگیراندا ئازایانە بوەستێت و بەجەرگی بنوێنێت. تازە هەر لە جێی ئەوەدایە شەیتان بە بەشێک لە تاوانەکانی زاڵ بێت بەسەریدا و هەڵیبخلسکێنێت و بیکاتە باریش بەسەر باوەڕداران و ئاشووب بۆ ناو ڕیزەکانیان. بۆیە خوا ڕقی لە دەرچوون و ڕابوونی ئەوان بوویەوە: ﴿وَلٰكِن كَرِهَ اللَّهُ انبِعاثَهُم فَثَبَّطَهُم وَقيلَ اقعُدوا مَعَ القاعِدينَ﴾ [التوبە: ٤٦]، «بەڵام خوا ڕقی لە

هاتن و دەرچوونی ئەوان بوو جا پەکی خستن و گوترا دانیشن لەگەڵ ئەوانەی دانیشتوون و جێماون.»

پێغەمبەری خواش (ﷺ) نەبوونی نیازی پێداگر و ڕاستەقینە بۆ جیهادکردن، بە نیشانەی دووڕوویی دادەنێت: "هەر کەس بمرێت و غەزای نەکردبێت و لە دڵی خۆشیدا نیازی غەزای نەبووبێت، ئەوە لەسەر بەشێک لە دووڕوویی مردووە."[١]

دەی با ئەوەی باوەڕدارە خۆی لەم بەشەی دووڕوویی بەدوور بگرێت بەوەی خۆی دانابێت بۆ قوربانیدانی پێناوی خوا و دوعاش بکات خوای گەورە ڕێگەکانی بۆ ئاسان بکات و ئەو تاوانانە دەست لێ بەربدات کە دەبنە ڕێگر و بەربەستی سەر ئەو ڕێگەیە. چونکە گەر لەسەر ئەمە بێت، پاشان بە مەرگی ئاسایی خۆشی بمرێت، هێشتا بە کردەوەی دڵ دەگاتە پلە بەرزەکان. پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرمووێت: "هەر کەس ڕاستگۆیانە لە دڵەوە داوای شەهیدی لە خوا بکات، خوا دەیگەیەنێتە پلەی شەهیدان ئەگەر لەسەر دۆشەکەکەشی مردبێت."[٢]

فەرمووشیەتی (ﷺ): "خەڵکانێک لە مەدینە هەن، ڕۆشتنێک نەڕۆشتوون و دۆڵێکتان نەبڕیوە کە لەگەڵتان نەبووبێتن." گوتیان: "ئەی پێغەمبەری خوا لە حاڵێکدا ئەوان لە مەدینەشن؟" فەرمووی: "لە حاڵێکدا لە مەدینەشن؛ عوزر ڕێی لێ گرتوون."[٣]

ئەوانە ڕاستاڵانە بەئاواتی جیهادکردن بوون لە غەزای تەبووک، بەڵام نەیانتوانی بەهۆی نەخۆشی یان نەبوونی توانا ماددییەوە، خوای بەخشندەش پاداشتی موجاهیدانی بۆ دانان بەو سەرڕاستییەیان، کاتێک هیچیان نەبوو

---

(١) [مسلم:٢٥٠٢]

(٢) [الترمذي:١٦٥٣]

(٣) [البخاري:٤٤٢٣]

بیبەخشن بۆ جیهاد و پێی بکەونە ڕێ، بە چاوی پڕ فرمێسکەوە گەڕانەوە ڕۆحەکانیان بە تاسقی مەیدانەکانی قوربانیدانی ڕێگەی (الله)وە بوو.

هەمان کات دووڕووان دەستڕۆیشتوو و بێ کێشەش بوون کەچی هەر بە سووکییەتی ڕازی بوون.

﴿إِنَّمَا السَّبِيلُ عَلَى الَّذِينَ يَسْتَأْذِنُونَكَ وَهُمْ أَغْنِيَاءُ رَضُوا بِأَن يَكُونُوا مَعَ الْخَوَالِفِ وَطَبَعَ اللَّهُ عَلَى قُلُوبِهِمْ فَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ﴾ [التوبە: ٩٣]، «بەڕاستی جیهاد لەسەر ئەوانەیە کە مۆڵەتت لێ دەخوازن لە حاڵێکدا هەیانە و دەوڵەمەندیشن ڕازی بوون لەگەڵ ئافرەتانی پاشماودا بمێنن و خواش مۆری ناوە لە دڵیان ئیدی نازانن.»

سا خوایە شەهیدیمان لە ڕێگەی خۆتدا پێ ببەخشە و بەر لەویش نییەتێکی ڕاستاڵانە کە بێبەری بین پێی لە دووڕوویی.

# ٨- سەختیی پەرستشەکان لەسەریان

ئەمەشیان دیسان پەیوەندی بە سیفەت گومانکردن لە ئایینەوە هەیە لەلای مرۆڤی دووڕوو، هەتا دڵنیایی لاوازتر بێت، ئەمیش زیاد دەکات. پارێزران لێی پێویستی بە دڵنیاییە. پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿وَاستَعينوا بِالصَّبرِ وَالصَّلاةِ وَإِنَّها لَكَبيرَةٌ إِلّا عَلَى الخاشِعينَ ۝ الَّذينَ يَظُنّونَ أَنَّهُم مُلاقو رَبِّهِم وَأَنَّهُم إِلَيهِ راجِعونَ﴾ [البقرة: ٤٥ – ٤٦]، «هاوکاری بخوازن لە ئارامگری و نوێژ ئەوەش سەختە مەگەر لەسەر ملکەچان و دڵکزان (٤٥) ئەوانەی بڕوایان وایە کە بە پەروەردگاریان دەگەنەوە و بۆ لای ئەو دەگەڕێنەوە.» وەک پێشتریش باسمان کرد (يظنون) لەم ئایەتەدا بە واتای (يوقنون) دێت، وێنەی ئایەتگەلی دیکەش بە هەمان شێوە.

جا نوێژ قورسە، مەگەر لەسەر ئەوانەی یەقینیان بە ڕۆژێکی دوایی هەیە کە دەگەنەوە بە پەروەردگاریان تێیدا و لەوێ پاداشتی ڕاسپاردە و ئەرکی نوێژەکانیان دەداتەوە بە پاداشتێکی مەزن.

بەڵام، دووڕووان گومانیان لەم ڕۆژی دواییە هەیە، یان ئەسڵەن باوەڕیان پێی نییە، هۆی ئەوەیە نوێژیان لەسەر قورسە. چونکە کاتی دەوێت بۆی تایبەت بکەیت لەپێناو بەجێگەیاندنی مەرجەکانی دروستگەڕانی و دابڕان لە بیرکردنەوەی دونیایی، ئەو دونیایەی کە تەنیا باوەڕی دڵنیا و چەسپاوی دووڕووانە. پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرمووێت: "بەڕاستی قورسترین نوێژ لەسەر دووڕووان نوێژی عیشا و نوێژی بەیانییە. گەر بیشیانزانیایە چییان تێدایە (لە پاداشت) بە گاڵکێش بووایە بۆی دەهاتن، سوێند بێت هاتووە بە دڵمدا فەرمان بدەم قامەتی نوێژ بکرێت و پاشان فەرمان بە پیاوێک بدەم پێشنوێژی بۆ خەڵک بکات و ئەوجا لەگەڵ

کۆمەڵێک پیاودا دەربچم کە چەند کۆڵ داریان پێ بێت، بچمە سەر خەڵکێک کە نایەن بۆ نوێژ و ماڵەکانیان بەسەردا بسووتێنم بە ئاگر."[١]

بۆچی دوو نوێژی عیشا و بەیانیش؟ چونکە دووڕووان لەو دووانەدا تەنیا خوا ئاگای لێیانە! لە نوێژەکانی دیکەدا لە ترسی شەرمەزاربوونی لای موسڵمانان دێن بۆ مزگەوت، بەهەر حاڵێش ئەوان وەختی ئەم نوێژانە خۆ بەخەبەرن. کەواتە کێشە نییە لەم دۆخەدا نوێژەکان بکەن باشترە... خۆ ئەگەر دوارۆژێک و بەهەشت و دۆزەخێک هەبێت هیچێک زەرەر ناکەن بەم نوێژانەی کردوویانە! بەڵام عیشا و بەیانی، دوو وەختی تاریکین، لەوانەیە ئاسان نەبێت باوەڕداران بیانناسنەوە ئاخۆ لەوێن یان نا. ئەوجا لەم دوو کاتەشدا دەبێت خەوەکەش بکەنە قوربانی، یەک کاتژمێر خەویش لای دووڕوو گرنگترە لە بەهەشتێک بە پانتایی ئاسمانەکان و زەوی! کە بەهەشت لەلای ئەو گریمانەیە هێندە لە جێی دڵنیاییدا نییە قوربانی بۆ بدات! ڕاکشێ خەونی خۆش ببینێت پێی باشترە لەوەی بۆ کردەوەیەک هەستێت بە ئامانجێکی غەیبی کە شکی لێی هەیە!

"خۆ ئەگەر بیانزانیایە چییان تێدایە" ئەگەر دڵنیا بوونایە لە گەڕانەوە و پاداشتی چاک، لەسەر دەست و قاچیش با بۆی دەهاتن، وەک چۆن بۆ ئیشی دونیا وان، بە چوار پەل بۆی دەڕۆن و بگرە زمانەلاسکەشی بۆ دەکەن بۆ بچووکترین قازانج و شمەکێک.

لە فەرموودەیەکی دیکەدا دەفەرمووێت (ﷺ):

(سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە گەر یەکێکیان بیزانیایە پارچە ئێسکێکی زلی گۆشت پێوە ماو، یان دوو سمی باشی دەست دەکەوێت، دەهات بۆ نوێژی عیشا).[٢]

---

(١) [مسلم:٦٥١]

(٢) [البخاري: ٦٤٤]

دوورڕوو شک بەرێ بە هاتن بۆ مزگەوت، ئێسکێکی گۆشتن، یان تەنانەت گۆشتی نێوان دوو سنوچقی بزنێک لە دەمی دەدات، بۆ عیشا دێت! بەڵام بەهەشتێک کە پانتاییەکەی ئاسمانەکان و زەوی بێت، هێندی ئەو پلە گۆشتە پاڵنەر نییە بۆی!

لەم ڕۆژانەی خۆماندا، بیربکەوە ... حاڵی مزگەوت چۆنە لە گەڕەکێکی قەرەباڵغی پڕ لە خەڵک و خانوو؟ نوێژی عیشا بچۆ یان دوو ڕیزە، یان سیان، ئەی چۆنی لێ دێت گەر بڵێن دوای نوێژ "چێشتێکی" چەور، یان بڕێک پارە بەسەر ئامادەبوواندا دابەش دەکرێت؟ چەند خەڵکی تێ دەڕژێت؟

واتای ئەوە نییە هەر کەس نەیەت بۆ نوێژی بەکۆمەڵی بەیانی، دوورڕوو بێت، بەڵام وەک لە پێشەکییەکەدا باسمان لێ کرد، بابەتەکە پلەبەندی و ئاستی جیاوازی هەیە. جا ئیتر کەسێک لە خەمی نوێژی بەکۆمەڵدا بێ و نەیفەوتێنێ، لەم لایەنەوە لە دوورڕوویی ترسی نییە. هەمان شێوە شایەنی ئاماژەپێکردنە کە ئەمە دیسان خاوەن عوزرەکان ناگرێتەوە، لە ناویشیاندا ئەوانەی دۆخی نالەباری وڵات و ڕاوەدوونانی ستەمکارانە ناچاری کردوون لە پێشچاوان ون بن.

لە بەرانبەریشدا، لەم ڕۆژگارەی خۆماندا خەڵکانێک هەن، پابەندبوون بە نوێژی مزگەوت بووە بە پیشەیان بە ئامانجی نیشانگرتنەوە لە موسڵمانان و بەدواداچوونی نهێنییەکانیان و دۆزینەوەی بەڵگە لەسەریان. جا ئەوەی دەیانهێنێت بۆ نوێژ، پاداشتی چاوەڕوانکراوی خوا نییە، بەڵکوو کرێیەکی دونیاییە، وێنەی ئێسکە گۆشتنەکە و سمە چەورەکان! جوان بەجێگەیاندنی نوێژ، پێوەری جوێکردنەوەی ئیمانە لە نیفاق:

باوەڕدار گورجوگۆڵانە بۆ نوێژ هەڵدەستێت؛ دڵسۆزانە، نییەتپاکانە، لە خەمی گەشتن بە نوێژی کۆمەڵ و بە دڵ و دەروونی ملکەچ و ئارامیشەوە

بۆی دەوەستێت. بەڵام دووڕوو، پراوپڕ پێچەوانەی ئەم سیفەتانە پێی هەڵدەستێت:

أ) دووڕوو لە خەمی نوێژی بەکۆمەڵدا نییە:

بەو فەرموودەیەی لە پێشدا هێنامان و بەم فەرمایشتەی عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوودیش -خوا لێی ڕازی بێت-:

(هەر کەس پێی خۆشە سبەی بەموسڵمانی بگاتەوە دیداری خوا، با پارێزگاری لەو نوێژانە بکات، لە هەمان جێگەدا کە بانگی تێدا دەدرێت بۆیان. چونکە (الله) ڕێگەکانی هیدایەتی تەشریع کردووە بۆ پێغەمبەرەکەتان، ئەو نوێژانەش لەو ڕێگەیانەی هیدایەتن. خۆ گەر ئێوە وێنەی ئەم کابرا دواکەوتووە لە ماڵەکانتاندا نوێژ بکەن، سوننەتی پێغەمبەرەکەتان دەست لێ بەرداوە، سوننەتی پێغەمبەرەکەشتان گەر دەست لێ بەربدەن، گومڕا دەبن. هەر پیاوێک دەستنوێژ بگرێت بە دەستنوێژێکی جوان و پاشان ڕوو بکاتە مزگەوتێک لەم مزگەوتانە، پەروەردگار بە هەر هەنگاوێک کە دەینێت، چاکەیەکی بۆ دەنووسێت و پلەیەک بەرزی دەکاتەوە پێی و خراپەیەکی لە شان دادەنێت. سوێند بێت بیرمە حاڵمان بە جۆرێک بوو، کە تەنیا دووڕوویەکی پەتیی پەردەهەڵماڵراو لەو نوێژانە دوادەکەوت. سوێند بێت پیاویان دەهێنا، بە دوو پیاوەوە دەچوونە ژێر باڵی هەتا لە ڕیزدا دەیانوەستاند)[1].

سا بڕوانە چۆن هاوەڵان سوور بوون لەسەر بەجێگەیاندنی نوێژەکان بەکۆمەڵ، تەنانەت نەخۆشی عوزرداریشیان بە سەر شانی دوو پیاوەوە دەهێنا، کە خۆی نەیدەتوانی بەتەنیا بچێت بە ڕێدا، لەبەر نەخۆشی یان پیری.

ب) دووڕوو تەمەڵی لە نوێژ دەنوێنێت:

زۆرت گوێ لێ دەبێت یەکێک دەڵێت: "خۆ من بڕوام بە نوێژ هەیە، تەنیا

---

(١) [مسلم: ٦٥٤]

لە تەمەڵیدایە کە نایکەم."، نازانێت هەر بەم قسەیەی چۆتەوە سەر دووڕووان! چونکە گەر لە کوفر ڕزگاری ببێت لەسەر بۆچوونی ئەوانەی نوێژنەکەر بە کافر نابینن، هێشتا بە بەهانەی تەمەڵییەکەی، کەوتۆتە سیفەتێک لە سیفەتەکانی دووڕوویەوە. پەروەردگار دەفەرمووێت:

﴿إِنَّ المُنافِقِينَ يُخادِعونَ اللَّهَ وَهُوَ خادِعُهُم وَإِذا قاموا إِلَى الصَّلاةِ قاموا كُسالى يُراءونَ النّاسَ وَلا يَذكُرونَ اللَّهَ إِلّا قَليلًا﴾ [النساء: ١٤٢]

«دووڕووان فێڵ دەنوێنن بەرانبەر خوا و ئەویشە فێڵ لەوان دەکات، وەختێکیش هەڵبستن بۆ نوێژ، تەمەڵانە بۆی هەڵدەستن؛ ڕووپامایی خەڵک دەکەن و کەمێکیش نەبێت، یادی خوا ناکەن.»

جا ئەوەی بڵێت: "لە تەمەڵیدا نایکەم." ئەمە مەحکوومبوونە، نەک عوزر. دووڕووان جارجارێک تەوەزەلانە بۆ نوێژ هەڵدەستان، بەڵام ئەم تەوەزەلی ئەسڵەن ناهێڵێ هەستێت!

خۆ گەر بشوترێت: "بەڵام سیفەتێکی تریش لە ئایەتەکەدا هەیە، ئەوەی کە ئەوان بۆ ڕیایی خەڵک دەیان کرد، لە کاتێکدا ئەوانەی نوێژ ناکەن، زۆرێکیان وەختێک چوستییان بۆ بێت و نوێژ بکەن، ڕیابازانە نایکەن." دەڵێین: بەڵێ، بەڵام وەختێک تەمەڵ دەبن، لەو تەمەڵییەیاندا دەچنەوە سەر دووڕووان. با خۆیان لەم چووان و هاوڕێیەتییە قوتار بکەن.

ج) دووڕوو لە نوێژەکەشیدا ڕیا دەکات:

خوای باڵادەست فەرموویەتی: ﴿يُراءونَ النّاسَ﴾ [النساء: ١٤٢]، «ڕووپامایی خەڵک دەکەن». ئەم ڕیابازییەش لە نوێژدا، بەشبەشە و پلەی جیاوازی هەیە. دەشێت پاڵنەری نوێژەکە لە بنەڕەتەوە ڕیا نەبێت لەلای هەندێکمان، بەڵام جوانتر نوێژ دەکات لەناو خەڵکدا، جوانتر لە کاتی تەنیایی خۆی و خوادا (عز وجل).

دەشگونجێت هۆی ئەمە، چوستییەک بێت کە موسڵمان لەناو برایانیدا بۆی بێت، لە بەرانبەردا دەشێت لە ڕیاشەوە بێت.

د) دووڕوو لەسەرخۆ نوێژ بەجێ ناگەیەنێت:

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرمووێت:

(ئەوە نوێژی دووڕووە، دادەنیشێت چاوەڕێی خۆرە هەتا دەکەوێتە نێوان دوو شاخی شەیتانەوە (واتە:نزیکی ئاوابوون دەبێتەوە)، ئەوجا هەڵدەستێت چوار دەنووک لە زەوی دەدات، کەمێکیش نەبێت یادی خوای تێدا ناکات)[1].

چەند پەلەپەل بە موسڵمانانێکی زۆرەوە دەبینیت! نە لەنێوان دوو کڕنووشەکەدا و نە لە هەستانەوەی پاش ڕکووعدا تاوێک وەستانیان نییە.

نوێژی بەکۆمەڵی مزگەوت، هۆی جوێبوونەوەی باوەڕدارە لە دووڕوو لە ڕۆژی دواییدا:

کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی:

(ئەوانەی ڕێگەی ناو تاریکاییەکان بەرەو مزگەوت دەکوتنەوە، مژدەی ڕووناکی تەواوی قیامەتیان پێ بدە)[2].

ئەم ڕووناکییە تەواوەیە بەسەر سیراتدا دەیان پەڕێنێتەوە و هەر ئەوکاتیشە کە بەبێ ترووسکاییەک، دووڕووان بەجێ دەمێنن:

﴿يَومَ لا يُخزِي اللَّهُ النَّبِيَّ وَالَّذينَ آمَنوا مَعَهُ نورُهُم يَسعى بَينَ أَيديهِم وَبِأَيمانِهِم﴾ [التحريم: ٨]، «ڕۆژێک کە خوا پێغەمبەر و باوەڕداران سەرشۆڕ ناکات، ڕووناکییان لە پێشیان و لە لای ڕاستییانەوە دێت و دەچێت.»

---

(١) [مسلم: ٦٢٢]

(٢) [أبو داود: ٥٦١]

﴿يَومَ تَرَى المُؤمِنينَ وَالمُؤمِناتِ يَسعى نورُهُم بَينَ أَيديهِم وَبِأَيمانِهِم بُشراكُمُ اليَومَ جَنّاتٌ تَجري مِن تَحتِهَا الأَنهارُ خالِدينَ فيها ذٰلِكَ هُوَ الفَوزُ العَظيمُ﴾ [الحديد: ١٢]، «ڕۆژێک کە باوەڕدارانی پیاو و ژن دەبینیت ڕووناکییان لە پێش و لەلای ڕاستییانەوە دێت و دەچێ، مژدەتان ئەمڕۆ باخانێکە ڕووبارەکان بە ژێریدا دەڕۆن، ئا ئەوەیە بردنەوە مەزنەکە.»

لە تاریکاییەکانی شەودا ڕۆشتن، پەروەردگاریشیان بە ڕووناکی بۆی گەڕاندنەوە، ئەو ڕۆژی ڕووناکیگەلێک پێویستە.

هەر لە بەرامبەریشدا:

﴿يَومَ يَقولُ المُنافِقونَ وَالمُنافِقاتُ لِلَّذينَ آمَنُوا انظُرونا نَقتَبِس مِن نورِكُم قيلَ ارجِعوا وَراءَكُم فَالتَمِسوا نورًا﴾ [الحديد: ١٣]

«ڕۆژێک دووڕووانی پیاو و ئافرەت بە باوەڕداران دەڵێن: "چاوەڕێمان بن ئێمەش لە ڕووناکی ئێوە وەربگرین."، گوترا: "بگەڕێنەوە پشت خۆتان، [لەوێ] بە دووی ڕووناکیدا بگەڕێن.»

دەیانەوێت مشەخۆری بکەن بەسەر باوەڕدارانەوە و بەبێ کردەوە دەستیان بە بەهەشت بگا! خەیاڵی خاو! باوەڕداران بە بڕینی تاریکاییەکان ئەو نوورەیان دەست کەوتووە، بەڵام ئێوە دووڕووان بەرانبەر بە چی نوورتان پێ ڕەوا ببینرێ؟ بگەڕێنەوە، لەناو گومان و ڕیابازی و تەمەڵییەکانتاندا بۆی بگەڕێن. مرواری لەناو لمی بیاباندا بەشکوو پەیدای بکەن. ئیتر شووراکە لێ دەدرێت و حەقیقەتەکان دەردەکەون و هەر نەفسێک پاداشتی کاری خۆی دێتەوە دەستی.

## وازهێنان لە نوێژی هەینی، هۆکاری چوونی دووڕوویە بۆ ناو دڵ:

فەرموویەتی (ﷺ): (هەر کەس بانگی گوێ لێ بێت ڕۆژی هەینی و نەیەت بۆی، پاشان گوێی لێ بێت و نەیەت بۆی، پاشان گوێی لێ بێت

و نەیەت بۆی، خوای گەورە مۆر لە دڵی دەدات و دەیکاتە دڵی مرۆیەکی دووڕوو.)

مۆردان لە دڵ، خراپترین سزایەکی دونیاییە. لەوەو دوا هەرگیز خاوەنەکەی تاوانی خۆی بە ناشیرین نایەتەوە پێشچاو. ئیتر چۆن تەوبە بکات؟

## دووڕوو پەرستشی زەکاتیشی لەسەر سەختە:

پەروەردگار فەرموویەتی:

﴿وَما مَنَعَهُم أَن تُقبَلَ مِنهُم نَفَقاتُهُم إِلّا أَنَّهُم كَفَروا بِاللَّهِ وَبِرَسولِهِ وَلا يَأتونَ الصَّلاةَ إِلّا وَهُم كُسالى وَلا يُنفِقونَ إِلّا وَهُم كارِهونَ﴾ [التوبه:٥٤]

«هیچیش ڕێگریان نەبوو لە وەرگیرانی بەخشینەکانیان، جگە لەوەی کە بێباوەڕ بوون بە خوا و بە پێغەمبەرەکەی و نایەن بۆ نوێژ بە تەمەڵی نەبێت و نابەخشن بە قەڵسی و پێناخۆشییەوە نەبێت.» هەروەها فەرموویەتی سبحانە وتعالی:

﴿فَلَمّا آتاهُم مِن فَضلِهِ بَخِلوا بِهِ وَتَوَلَّوا وَهُم مُعرِضونَ﴾ [التوبه: ٧٦]

«جا کاتێک لە فەزڵ و بەخششی خۆی پێی دان، ڕەزیلییان تێدا کرد و ڕوویان وەرگێڕا بە پشتهەڵکردنەوە.»

هیچیش سەیر نییە، زەکات و خێرکردن لای دووڕوو زەرەرێکی ڕووتە، ئەو بڕوای بە پاداشتە دوارۆژییەکەیان نییە. هەر بۆیە دەبینیت پێغەمبەر (ﷺ) خێرکردنی بە بەڵگە داناوە لەسەر ڕاستێتیی ئیمان کە فەرموویەتی: (... والصدقة برهان)[1].

هاوڕێ لەگەڵ ئەوەشدا کە بەڵگەیە لەسەر باوەڕ، زیادیشی دەکات.

---

(١) [مسلم:٢٢٣]

باوەڕدار وەختێک بییەوێت خێر بکات، باوەڕی خۆی تاو دەدات و ڕۆژی دوایی دەهێنێتەوە یاد، بۆ ئەوەی بەرگەی ساردکردنەوە و سیخورمەی شەیتان بگرێت. ئیدی باوەڕ و چەسپانیشی بەوە دەبووژێتەوە و زیاد دەکات. پەروەردگار دەفەرمووێت:

﴿وَمَثَلُ الَّذينَ يُنفِقونَ أَموالَهُمُ ابتِغاءَ مَرضاتِ اللَّهِ وَتَثبيتًا مِن أَنفُسِهِم كَمَثَلِ جَنَّةٍ بِرَبوَةٍ﴾ [البقرة: ٢٦٥]، «وێنەی ئەوانەشی بە تەمای ڕەزامەندی الله و بە دڵنیایی و پێقایمیی دەروونیانەوە دەبەخشن، وێنەی باخێکە بە بەرزاییەکەوە.»

## چۆن ڕزگارت ببێت لە بەسەخت بینینی پەرستشەکان؟

بە زۆر یادکردنی پەروەردگاری بەرزی مەزن. ئیبن مەسعوود -خوا لێی ڕازی بێت- دەفەرمووێت:

"بەڕاستی کە پەروەردگار ئاکارەکانتانی لێ دابەش کردوون، وەک چۆن ڕۆزییەکانتانی لێ دابەش کردوون، بەدڵنیاییشەوە کە پەروەردگار دونیا دەدات بەوانەی خۆشی دەوێن و بەوانەشی خۆشی ناوێن، بەڵام ئیمان تەنیا بەوانە دەدات کە خۆشی دەوێن.

سا هەر کەس لە بەخشینی پارەدا ڕەزیلی هەیە و لە جیهادی دوژمندا ترسەنۆکی و لە کردەوەی شەودا سستی، با زۆر بڵێت: سبحان الله، والحمد لله، ولا إله إلا الله، والله أكبر".

جا ڕەزیلبوون بۆ پارە و ترسان لە دوژمن و لەلا سەختبوونی شەونوێژ، لە نیفاقەوە نزیکە هەتا ئیمان. بۆنی بیرچوونەوەی پەروەردگاریشی لێ دێت. نابینی چۆن فەرموویەتی:

﴿المُنافِقونَ وَالمُنافِقاتُ بَعضُهُم مِن بَعضٍ يَأمُرونَ بِالمُنكَرِ وَيَنهَونَ عَنِ

المَعروفِ وَيَقبِضونَ أَيدِيَهُم نَسُوا اللَّهَ فَنَسِيَهُم﴾ [التوبه: ٦٧]، «دووڕووانی پیاو و ئافرەت لە یەکن و یەک دەستەن، فرمان بە خراپە دەکەن و ڕێگری لە چاکە دەکەن و دەستیشیان دەگرنەوە، خوایان لەبیر چۆتەوە، سا خواش ئەوانی فەرامۆش کردووە.»

﴿ويقبضون أيديهم﴾ «دەستیشیان دەگرنەوە». واتە: ڕەتی دەکەنەوە خێریان بۆ جگە لە خۆیان لێ ببێتەوە، وێنەی ئەوەش: بەخشین لەپێناو خوادا.

جا وەختێک خوایان بیرچوویەوە، بەخشینیشیان لەپێناو ئەودا لەسەر قورس بوو. ﴿فنسيهم﴾ «خواش فەرامۆشی کردن» لە میهری خۆی، واتە وێنەی لەیادکراوان مامەڵەیان لەگەڵ دەکات، نە چاکەیەکیان بۆ ڕێک دەخات و نە دەیانخاتە بەهەشتیشەوە.

جا لە چارەسەرەکانی ئەم لەبیرچوونەوەیەی پەروەردگار، کە وا دەکات هەرچی تاعەتیشە لەسەر نەفس قورس بێت، یەک لە چارەسەرەکانی؛ یادکردنی خوایە بە دڵ و بە زمان و کەوتنەفکری تەوەربوونی گوێڕایەڵی ئەوە لە ژیانی تۆدا وەکوو باوەڕدار، و تەوەربوونی ڕۆژی دوایی و یادکردنێکیش لە ئامانجی ژیان و هۆکاری بوونی تۆ لەسەر ئەم زەوییە و ئەوەی کە هەر بۆ لای ئەو دەگەڕێتەوە سبحانە وتعالى، یادکردن لە تەوەربوونی شەریعەتەکەی الله و فرمانی ئەو و نەهی ئەو، لە هەر بەش و گۆشەیەک لە بەشەکانی ژیانتدا. جا هەر کەس ئەم یادکردنەوەیە زاڵ ببێت بەسەریدا، گورج دەبێتەوە بۆ تاعەتەکان.

ئیبن قەییم ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێ: "بەندە خوایەکی هەیە کە پێی دەگاتەوە و ماڵێکی هەیە تێیدا نیشتەجێ دەبێت، سا لایەقە بەر لە گەڕانەوە، پەروەردگاری ڕازی بکات و بەر لە ماڵگواستنەوە، گۆڕەکەی ئاوەدان بکاتەوە".

هەروا لە دەرمانەکانی چارەبوونی تەمەڵیی نەفس و بێهیممەت بوونی لە ئاست تاعەتەکان، ڕووانینە بەناو ژیاننامەی پێشینانی هاوەڵان -خوا لێیان ڕازی بێت، ڕێڕەو و ڕەوت و سەرگوزەشتەی وان، هیممەتی مردووش زیندوو دەکاتەوە. لەم بارەیەوە ئامۆژگاریمان وایە کەڵک لەو نامیلکەیەمان وەربگیرێت "فبهداهم اقتده".

# ٩- حەزکردن بەوەی پێیاندا هەڵبدرێت و ستایش بکرێن لەسەر شتانێک کە ئەسڵەن نەیانکردووە

بوخاری و موسلیم گێڕاویانەتەوە لە ئەبووسەعیدی خودرییەوە کە پیاوانێک لە دووڕووان لە دەورانی پێغەمبەردا (ﷺ)، کاتێک ئەو (ﷺ) دەربچوایە بۆ غەزایەک، لەجێ دەمان لێی، شادیش بوون بەو پاڵدانەوەیان لە پشت پێغەمبەری خواوە (ﷺ)، جا کاتێک پێغەمبەر (ﷺ) دەهاتەوە، داوای لێبووردن و عوزرخواییان لێ دەکرد، سوێندیان دەخوارد و حەزیان دەکرد ستایش بکرێن بە شتێک کە نەشیانکردووە، جا ئەوە دابەزی: ﴿لا تَحسَبَنَّ الَّذينَ يَفرَحونَ بِما أَتَوا وَيُحِبّونَ أَن يُحمَدوا بِما لَم يَفعَلوا فَلا تَحسَبَنَّهُم بِمَفازَةٍ مِنَ العَذابِ﴾ [آل عمران: ١٨٨] «وامەزانە ئەوانەی شادن بەوەی کردوویانە [لە هەڵە و تاوان] و حەز دەکەن ستایش بکرێن بە شتێک کە نەیانکردووە، سا وایان مەبینە لە سزا قوتاربوونیان هەیە.»[1]

دووڕوو بەوەوە نەوەستاوە تەمەڵی لە گوێڕایەڵییەکان کردووە، بگرە دەشیەوێت خەڵک پیاشیدا هەڵبدەن لەسەر شتانێک کە ئەسڵەن نەشی کردووە، نواندن و ساختەبازی دەکات تاکوو ئەو ستایشە ناڕەوایە بەدەست بهێنێت. زۆرێکیش لە ئێمەی موسڵمان لەم ڕۆژانەدا هەن، دەچن لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکاندا لەو قسانە زۆر دەکەن کە مایە پیاهەڵدانی خەڵکە بۆیان و وێنەیەکی پرشنگدار و پێچەوانەی واقیعیان بۆ خۆیان دەکێشن. با فەرموودەکەی ئەسماءمان بەبیر بێتەوە -خوا لێی ڕازی بێت- لە دوو صەحیحەکەدا کە پێغەمبەری خوا (ﷺ)

---

(١) [البخاري:٤٥٦٧، مسلم:٢٧٧٧]

فەرموویەتی: (ئەوەی خۆی تێر و پۆشتە بنوێنێت بە شتێک کە نییەتی و پێی نەبەخشراوە، وەک ئەوە وایە لە توێی دوو پارچە جلی درۆینە و نواندندا بێت[١].)[٢]. با وریا بین لەوەی بکەوینە ناو ئەم سیفەتە دوورووییەوە، بێئاگایانە، یان ئاگایانە.

---

(١) مەبەست کەسێکە، جۆرە جلێک لەبەر بکات بە مەبەستی ئەوەی بە شێوەیەکی دیاریکراو بناسرێت، بە نموونە: بەرگێک کە خواناس و زاهید پیشانی بدات. ئاوا ڕاڤە کراوە

(٢) [البخاري:٥٢١٩، مسلم:٢١٢٩]

## ١٠- ساردکردنەوەی خەڵک لە تاعەتەکان و گاڵتەکردن بە کارچاکان:

پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿المُنافِقونَ وَالمُنافِقاتُ بَعضُهُم مِن بَعضٍ يَأمُرونَ بِالمُنكَرِ وَيَنهَونَ عَنِ المَعروفِ﴾ [التوبە:٦٧]، «دووڕووانی پیاو و ئافرەت لە یەکن و یەک دەستەن، فرمان بە خراپە دەکەن و ڕێگری لە چاکە دەکەن.»

جا هەر پیاو یان ئافرەتێک، بانگەوازی بۆ خراپەیەک دەکرد و ڕێگەی چاکەیەکی دەگرت، با بزانێت کە لە سیفەتێکی دووڕوویی گلاوە. هەر گەنجێک هاوڕێکەی بەرەو سەرپێچییەک دەبات، یان لە تاعەتێکی خۆشەویستی لای خوا ساردی دەکاتەوە، با بزانێ ئەمە نیفاقە.

هەروەها پەروەردگار لە وەسفی دووڕوواندا فەرموویەتی:

﴿الَّذينَ يَلمِزونَ المُطَّوِّعينَ مِنَ المُؤمِنينَ فِي الصَّدَقاتِ وَالَّذينَ لا يَجِدونَ إِلّا جُهدَهُم فَيَسخَرونَ مِنهُم سَخِرَ اللَّهُ مِنهُم وَلَهُم عَذابٌ أَليمٌ﴾ [التوبە: ٧٩]

«ئەوانەی کە عەیب دەگرن لە خێرکەرانی باوەڕداران و لەوانەشی کە تەنیا توانای خۆیان لەدەست دایە[1]، جا گاڵتەیان پێ دەکەن، خوا گاڵتەی بەوان کردووە و سزایەکی بەئێشیشیان بۆ هەیە.»

جا ئەم دووڕووانە خۆیان داوەشاوبوون لەوەی شتێک ببەخشن بۆ ئامادەکردنی لەشکری (نارەحەتی- العسرة)، کەچی لەولاشەوە تانەیان لە باوەڕداران دەدا! دانیشتبوون و تەماشایان دەکرد، یەکێک خێرێکی زۆری بهێنایە، دەیانگوت:

---

(١) بەپێی توانای کەمی خۆیان خێر دەکەن

"ئەوە ڕیابازە"، ئەوی دیکە خێرێکی کەمی دەهێنا لەبەر هەژاری و دەستکورتی، کە ئەویشی لە دەمی منداڵەکانی گرتبوویەوە لەپێناو سەرخستنی ئایینەکەی خوادا، گاڵتەیان بە خێرە گچەکەکەی ئەویش دەکرد کە لە چاوی ئەماندا کەم و لە تەرازووی خوادا زۆر و بەفەڕ بوو.

دووڕوو خۆی دەبینی لە بن و ژێری چەندین کێوی سەرکەش و زەبەلاحدا گیری خواردووە، ئەمیش لەبەر گومان و تەمەڵی خۆی توانای ئەوەی نەبوو کێبەرکێی لووتکە بەرزەکانی ئەوان بکات و شکۆیەکی لەبننەهاتووی وا بنیات بنێت. ئیدی ڕێگایەک نابینێتەوە بۆ کەمکردنەوەی جیاوازیی نێوان خۆی و وان، جگە لەوەی زماندرێژی بەرانبەر بەوانە بکات کە باڵاترن، تاکوو لە پێشچاوی خەڵک بیانهێنێتە ئاستی خۆی!

سا دەی تۆ ئەگەر بە تاعەت نەفرییت و لە تاوان خۆ نابوێری، وریا بە، هیچ نەبێت مەبە بە بەردی سەر ڕێگەی تاعەتی خەڵک و بانگیان مەکە بۆ سەرپێچی و تانە لە کارچاکان مەدە. بەشکوو ئەوە لای خوا باشتر بێت بۆت و میهرێکت پێ بکا و کەموکووڕیت بپۆشێ لە دونیا و دواڕۆژدا.

## ١١) گومانكردن لە بەڵێنی سەرخستن و داچەسپاندنی ئیسلام کە خوا داویەتی

ئەمەشیان بەڵایەکی هەرە گەورەیە کە ورەی دووڕووانی پەک خستووە لەوەی سەرخستنێکیان بۆ ئایین هەبێت. ئەو وای دەبینێت کە کەیسی ئایین دۆڕاوە. ئیتر بۆچی خۆی بۆ ماندوو بکات؟! پەروەردگار دەفەرموێت:

﴿وَيُعَذِّبَ الْمُنافِقِينَ وَالْمُنافِقاتِ وَالْمُشرِكينَ وَالْمُشرِكاتِ الظّانّينَ بِاللَّهِ ظَنَّ السَّوءِ عَلَيهِم دائِرَةُ السَّوءِ﴾ [الفتح: ٦]

«تاکوو سزای دووڕووانی پیاو و ئافرەت و موشریکانی پیاو و ئافرەتیش بدات، ئەوانەی گومانی خراپیان بە خوا هەیە، خراپە و بەڵا هەر بۆ خۆیانە و یەخەی خۆیان دەگرێت.»

دووڕوو وەختێک لێکدانەوەکانی زەمینین، و هێز و هەژموون و گیڤبوونەوەی بێباوەڕان دەبینێت، ئیدی وا دەزانێت ئیسلام فەوتاوە و خوا ئایینەکەی خۆی سەر ناخات. ئەمەش گومانی خراپە، جێی خەشمی خوای گەورەیە. هەر بۆیە پاداشتیان ئەوە بوو:

﴿وَغَضِبَ اللَّهُ عَلَيهِم وَلَعَنَهُم وَأَعَدَّ لَهُم جَهَنَّمَ وَساءَت مَصيرًا﴾ [الفتح: ٦]

«هەروا خوا خەشمی لێ گرتوون و نەفرەتی لێ کردوون و دۆزەخیشی بۆ ئامادەکردوون، کە بەڕاستی خراپترین سەرەنجام و چارەنووسە.»

وشەگەلێک، لێوانلێو و نوێنەری تووڕەیی توندی خوا لە خەڵکانێک کە گومانی خراپیان پێ بردووە (سبحانە وتعالی)، گومانی ئەوەی ئایینی خۆی

دەست لێ بەر بدات و سەری نەخات، هەروەها پێغەمبەری خوا (ﷺ) و گرۆی باوەڕداران لە جەنگدا بفەوتێن و ئیدی دوای ئەوانیش تا ماوە ئیسلام سەرێکی دی بەرز نەکاتەوە. چەند ئایەت پاشی وی دەفەرمووێت:

﴿بَل ظَنَنتُم أَن لَن يَنقَلِبَ الرَّسولُ وَالمُؤمِنونَ إِلى أَهليهِم أَبَدًا وَزُيِّنَ ذلِكَ فى قُلوبِكُم وَظَنَنتُم ظَنَّ السَّوءِ وَكُنتُم قَومًا بورًا﴾ [الفتح: ١٢]، «بەڵکوو واتان گومان برد کە پێغەمبەر و باوەڕداران هەرگیز ناگەڕێنەوە ناو ماڵ و منداڵیان، ئەوەشتان لە دڵدا ڕازێنرایەوە و گومانی خراپتان خستە گەڕ و خەڵکێکی فەوتاو و لەبەینچوو بوون.»

دووڕوو کە دەڕوانێتە بێباوەڕان و هێزی ماددییان تاو داوە، دڵی لە سینەی دەخزێت، ئەوجا ئاوڕ دەداتەوە لای باوەڕداران و تەنیا شمەک و تفاقێکی کەمیان پێوە دەبینێت کە ئەوپەڕی توانایانە، لەگەڵ ئەوەشدا دەم بە تەهلیلە و تەکبیرە و ڕوو بە مژدە و دڵ پڕ لە چەسپاوی و یەقینن بە وادەی خوا. ئیدی دووڕوو لە پێکەنین دەدات و دەڵێت: ئەم ساویلکانە وا دەزانن دینەکەیان سەریان دەخات بەسەر ئەو گرۆ پڕچەک و زلهێزانە؟!

﴿إِذ يَقولُ المُنافِقونَ وَالَّذينَ فى قُلوبِهِم مَرَضٌ غَرَّ هؤُلاءِ دينُهُم وَمَن يَتَوَكَّل عَلَى اللَّهِ فَإِنَّ اللَّهَ عَزيزٌ حَكيمٌ﴾ [الأنفال: ٤٩]

«وەختێک دووڕووان و ئەوانەی دڵیان نەخۆشی تێدایە، گوتیان: ئەوانە [باوەڕداران] ئایینەکەیان فریوی داون، هەر کەسیش پشت بە خوا ببەستێت، ئەوا خوا بڵند و زاڵ و دانایە.»

## گومانکردن لە بەڵێنی خوا، هۆکارە بۆ زۆرێک لە سیفەتەکانی دووڕوویی:

کەسی گومانکەر لە سەرخستنی خوایی، دەروونی دەشکێتەوە و ورەی

دەڕووخێت و ئیرادەی ئیفلیج دەبێت، بەتایبەت گەر لەپاڵ ئەودا، گومانکردن لە ڕۆژی دواییش بێتە سەری؛ ئەو ڕۆژەی خوا بەندەکانی بە سەرخستنی هەرەگەورە و یەکلایی بەسەر دوژمنانیدا سەر دەخات:

﴿إِنَّا لَنَنصُرُ رُسُلَنا وَالَّذينَ آمَنوا فِي الحَياةِ الدُّنيا وَيَومَ يَقومُ الأَشهادُ﴾ [غافر: ٥١]

«سوێند بێت کە ئێمە پەیامبەرانمان و ئەوانەی باوەڕیان هێناوە سەر دەخەین لە ژیانی دونیا و لە ڕۆژی هەستانەوەی شاهێدەکانیشدا.»

ئیدی دوابەدوای ئەوە، پەکی دەکەوێت لەوەی قوربانی بۆ ڕێگەی خوا بدات. بۆچی قوربانی بدات وەختێک ئیسلام لەلای ئەو بەزیو و دۆڕاوە؟!

دەبینی لەگەڵ باوەڕدارانیشدا درۆ دەکات، بۆ ئەوەی ڕووی لێ وەرگێڕن و وازی لێ بێنن بکشێتەوە لە ڕووبەڕووبوونەوەی دوژمن.

هەروا لە هەڵێ نەپساویشدایە بۆ گوێڕایەڵیکردنی بێباوەڕان بە زیانی ئایینی خۆشی؛ چونکە لە چاوی ئەودا، ئەوان بەهێزترینن.

دەشبینی پەیمانی خۆی لەگەڵ خوادا دەشکێنێ. ئەو کە شکی لە توانایی خوا هەبێ لە سەرخستنی ئاییندا، شکی لەوەش دەبێ کە تۆڵە لە پەیمانشکێنان بسەنێتەوە.

کردەوەگەلێکی بەد و نابووت، کە سەرجەمیان بەری شوومی گومانکردنن لە سەرخستنی خوایی.

پەروەردگار لە وەسفی حاڵی دووڕوواندا لە ڕۆژانی غەزای خەندەق، دەفەرمووێت:

﴿وَإِذ يَقولُ المُنافِقونَ وَالَّذينَ في قُلوبِهِم مَرَضٌ ما وَعَدَنَا اللَّهُ وَرَسولُهُ إِلّا غُرورًا﴾ [الأحزاب: ١٢]

«وەختێک دووڕووان و ئەوانەی نەخۆشی لە دڵیاندایە دەڵێن: "وادەدانی خوا و پێغەمبەرەکەی جگە لە فریو و بەتاڵ هیچی دیکە نەبوو."»

گومانیان لە بەڵێنی خوا و پێغەمبەرەکەی کرد سەبارەت بە سەرکەوتن. جا ئەم بڕوا بۆگەنەیان بەرەو چی بردنی؟:

١. ﴿وَإِذ قالَت طائِفَةٌ مِنهُم يا أَهلَ يَثرِبَ لا مُقامَ لَكُم فَارجِعوا﴾ [الأحزاب: ١٣] «وەختێ گرۆیەک لەوان وتیان: "ئەی خەڵکی یەثریب! مانەوە و پێگەیەکتان لێرەدا نییە، دەی بگەڕێنەوە."» - پشتکردن لە جیهاد و قوربانیدان لەپێناو خوا.

٢. ﴿وَيَستَأذِنُ فَريقٌ مِنهُمُ النَّبِيَّ يَقولونَ إِنَّ بُيوتَنا عَورَةٌ وَما هِيَ بِعَورَةٍ﴾ [الأحزاب: ١٣] «گرۆیەکیشیان مۆڵەتیان لە پێغەمبەر داوا دەکەن، دەڵێن: "ماڵەکانمان بەدەرەوەیە و جێمەترسییە"، کە وا نییە و جێمەترسیش نییە.» - درۆکردن لەگەڵ باوەڕداران.

٣. ﴿إِن يُريدونَ إِلّا فِرارًا﴾ [الأحزاب: ١٣] «جگە لە هەڵاتن مەرامێکی تریان نییە.» - ئیدی ترسنۆکی و داڕووخان.

٤. ﴿وَلَو دُخِلَت عَلَيهِم مِن أَقطارِها ثُمَّ سُئِلُوا الفِتنَةَ لَآتَوها وَما تَلَبَّثوا بِها إِلّا يَسيرًا﴾ [الأحزاب: ١٤] «خۆ ئەگەر لە لاکانیەوە [مەدینە] بێن بۆیان و بیانگرن و داوای شیرکیان لێ بکەن، ڕاست دەیدەن بەدەستەوە و هێندە لەسەری ناوەستن.» - پەلەکردن لە بێباوەڕبوون و گوێڕایەڵیکردنی بێباوەڕان و نەچەسپان لەسەر مەبدەء.

٥. ﴿وَلَقَد كانوا عاهَدُوا اللَّهَ مِن قَبلُ لا يُوَلّونَ الأَدبارَ وَكانَ عَهدُ اللَّهِ مَسئولًا﴾ [الأحزاب: ١٥] «خۆ ئەوانە پێشتر پەیمانیان بە خوا دابوو کە پشت هەڵناکەن و نایدۆڕێنن، کە بەڕاستیش پەیمانی خوا لێی دەپرسرێتەوە.» - ئەوجا شکاندنی پەیمان لەگەڵ خوا سبحانە وتعالی.

ئیبن کەثیر لە وەسفی حاڵی دووڕووان لە غەزای ئەحزابدا لە خزمەت ئەم

فەرمایشتەی پەروەردگاردا:

﴿وَإِذ يَقولُ المُنافِقونَ وَالَّذينَ في قُلوبِهِم مَرَضٌ ما وَعَدَنَا اللَّهُ وَرَسولُهُ إِلّا غُرورًا﴾ [الأحزاب: ١٢] «وەختێک دووڕووان و ئەوانەی نەخۆشی لە دڵیاندایە، دەڵێن: "وادەدانی خوا و پێغەمبەرەکەی جگە لە فریو و بەتاڵ، هیچی دیکە نەبوو.» دەفەرموێت:

"ئەوەی دووڕوو بوو، دووڕوویيەکەی بەدەر کەوت، ئەوەشی گومان، یان ڕقێک لە دڵیدا هەبوو؛ لاوازی کەوتە گیانی و ئەو خوتخوتەیەی لە دڵیدا بوو کەوتە سەر زاری، لەبەر لاوازیی ئیمانی و دژواریی ئەو حاڵەی تێی کەوتبوو". ڕاستیشی فەرمووە. مەعتیبی کوڕی قوشەیری دووڕوو، دەیگوت: (موحەممەد بەڵێنی ئەوەی پێ دەداین هەرچی گەنجینەی کیسرا و قەیسەرە هەڵی لووشین، کەچی ئێستە ڕێگەمان نییە بچین بۆ سەرئاو).

هەروا بڕوانە چۆن ئیبن کەثیر، دووڕووان و ئەوانەی نەخۆشی لە دڵیاندایە، لە یەک ئاستدا دانەنا. هەیانبوو دووڕوویەکی پەتیی تەواو بوو، هەشیانبوو ئیمان لاواز، حاڵی لە حاڵی دووڕووی پەتی باشتر بوو؛ بەڵام ئەو لاوازی و کەمیەقینییەی هەیبوو، لەبەر تەنگانەی دۆخەکە هەمووی کەوتە دەر.

## باوەڕدار گومان لە وادەی خوا ناکات:

پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ) هەر لە هەمان دۆخی ئاڵۆز و ناهەمواری ڕۆژی خەندەقدا، مژدەی فەتحکردنی وڵاتانی بە باوەڕداران دەدا، لە بڵێسەی دڵنیابوونیەوە لەو بەڵێن و هەواڵەی کە (الله) پێی دابوو سەبارەت بە فەتحەکان. هەر بۆیە پەروەردگار لە سوورەتی ئەحزاب، لە پاش باسکردنی حاڵی دووڕووان، دەفەرموێت:

﴿لَقَد كانَ لَكُم فى رَسولِ اللَّهِ أُسوَةٌ حَسَنَةٌ لِمَن كانَ يَرجُو اللَّهَ وَاليَومَ الآخِرَ وَذَكَرَ اللَّهَ كَثيرًا﴾ [الأحزاب: ٢١]

**«بەڕاستی ئێوە لە پێغەمبەری خوادا پێشەنگێکی باشتان هەبوو، بۆ یەکێک باوەڕ و ئومێدی خوا و ڕۆژی دوایی هەبێت و یادی خوا زۆر بکات». لە وەسفی باوەڕدارانی ڕاستاڵیشدا، دەفەرمووێت:**

﴿وَلَمّا رَأَى المُؤمِنونَ الأَحزابَ قالوا هذا ما وَعَدَنَا اللَّهُ وَرَسولُهُ وَصَدَقَ اللَّهُ وَرَسولُهُ وَما زادَهُم إِلّا إيمانًا وَتَسليمًا﴾ [الأحزاب: ٢٢]

**«وەختێکیش باوەڕداران حیزبەکانیان دی[١]، گوتیان: "ئا ئەمە بوو کە خوا و پێغەمبەرەکەی بەڵێنییان پێ دابووین و خوا و پێغەمبەرەکەشی ڕاستیان فەرموو". جگە لە باوەڕ و ملکەچی، هیچی دییان بۆ زیاد نەبوو و نەنواند.»**

**لەگەڵ ئیماندا، نائومێدییەک بوونی نییە، نەتدیوە خوای گەورە لەسەر زاری ئیبراهیم (علیه السلام) چی دەفەرمووێت:**

﴿قالَ وَمَن يَقنَطُ مِن رَحمَةِ رَبِّهِ إِلَّا الضّالّونَ﴾ [الحجر: ٥٦]

**«گوتی جا کێ لە میهری پەروەردگاری نائومێد دەبێ، جگە لە گومڕایان؟»**

**هەروا لەسەر زاری یەعقووب (علیه السلام):**

﴿وَلا تَيأَسوا مِن رَوحِ اللَّهِ إِنَّهُ لا يَيأَسُ مِن رَوحِ اللَّهِ إِلَّا القَومُ الكافِرونَ﴾ [یوسف: ٨٧]

**«نائومێد مەبن لە میهری خوا بەڕاستی جگە لە خەڵکی کافر کەس لە میهری خوا نائومێد نابێ.»**

**ئیبن مەسعوودی قوتابیی پێغەمبەریش (ﷺ)، هەر وای فەرمووە:**

---

(١) کە گەلەکۆمەیان لێ کردبوون و دەورەی مەدینەیان دابوو

"تاوانە گەورەکان: هاوەڵدانان بۆ خوا و ئەرخەیانبوون لە پیلان و سزای خوا و، بێئومێدبوون لە میهری خوا و نائومێدبوون لە سەرخستنی خوا". جا ئەم ئایینە سەرخراوە. خاوەنەکانی دەمێک لاوازە دەبن بە ئەندازەی دەستبەردانیان لێی، بەڵام ڕیشەکێش نابێ و تۆمار ناپێچێتەوە. ئوممەتی موحەممەد (ﷺ) نافەوتێن. ئەوەشی هەوڵی لەناوبردنی ئیسلام دەدات، گەوجترە لە شێتێک کە سکی خۆی بڕیوە و قوڕگی خۆی دڕیوە و مۆر بۆتەوە و فوو لە خۆر دەکات تا بیکوژێنێتەوە!:

﴿يُريدونَ لِيُطفِئوا نورَ اللَّهِ بِأَفواهِهِم وَاللَّهُ مُتِمُّ نورِهِ وَلَو كَرِهَ الكافِرونَ ۝ هُوَ الَّذي أَرسَلَ رَسولَهُ بِالهُدى وَدينِ الحَقِّ لِيُظهِرَهُ عَلَى الدّينِ كُلِّهِ وَلَو كَرِهَ المُشرِكونَ﴾ [الصف: ٨ – ٩]

«دەیانەوێت ڕووناکیی خوا بە دەمیان بکوژێننەوە کە خوا ڕووناکیی خۆی تەواو دەکات و دەباتە سەر، با بێباوەڕانیش پێیان ناخۆش بێت(٨) ئەوە کە پێغەمبەرەکەی خۆی بە ڕێنوێنی و ئایینی حەق ناردووە، تاکوو بەسەر هەموو ئاییندا [ئایینەکانی دژی] زاڵی بکات، با موشریکانیش پێیان ناخۆش بێت.»

سا ئەم ئایینە سەرخراوە. پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: "مژدە بەم ئوممەتە بدە، بە بڵندی و دەسەڵات و داچەسپان لە شاراندا و، سەرکەوتن و بەرزی لە ئاییندا. هەر کەسیش کاری قیامەتی بۆ دونیا بکات، بەشێکی بۆ نییە لە دواڕۆژدا."[1] جا ئەو کەسەی کە کاری دواڕۆژی بە مەبەستی دونیا کردووە، وەک بڵێی هەمان ئەو کەسەیە هەست دەکات کەیسی ئایین دۆڕاوە، جا بۆیە پێویست بە قوربانیدان ناکات. ئیدی دەڵێت: "دەی هیچ نەبێت بەم کردەوەیە پێگەیەک لەلای خەڵک پەیدا بکەم باشترە لەوەی بە دەستی بەتاڵ لێی دەربچم."

---

(١) [مسند أحمد: ٢١٢٢٤]

پێغەمبەرمان (ﷺ) فەرموویەتی: "هەر کوێ شەو و ڕۆژی پێ بگات، ئەم ئایینە پێی دەگات. پەروەردگار ماڵێکی قوڕین، یان مووینی[دەشتەکی و کۆچەری] لێ دەرناکات، ئیللا ئەم ئەم ئایینەی پێدا دەبات، بە بڵندیی بڵندانێک یان سەرشۆڕیی ڕسوایانێک: بڵندییەک کە (الله) بە ئیسلام و ئەهلەکەی دەدات و سەرشۆڕییەک کە دەیکاتە بەشی کوفر."(١)

جا ئیدی بۆ هەر کەسێکیش کە پاش هەموو ئەمە، هێشتا گومانی لە بەڵێنی خوا هەیە بە سەرخستنی ئایینەکەی:

﴿مَن كانَ يَظُنُّ أَن لَن يَنصُرَهُ اللَّهُ فِي الدُّنيا وَالآخِرَةِ﴾ [الحج: ١٥] «هەر کەس پێی وایە خوا ئەو [موحەممەد] سەر ناخات لە دونیا و دوارۆژدا.» ، واتە: هەر کەس گومانخراپە بەرانبەر بە خوا و، وادەزانێت (الله) دەست لە ئایینەکەی و پێغەمبەرەکەی بەردەدات: ﴿فَليَمدُد بِسَبَبٍ إِلَى السَّماءِ﴾ [الحج: ١٥] «با ئامرازێک درێژ کاتەوە بە ئاسماندا.» ، واتە: با گوریسێک بئاڵێنێ لە ملی و ئەوسەریشی ببەستێت لە بنمیچی خانووەکەی (هەرچی بەسەر سەرتەوە بێ و سێبەرت بکا ئاسمانی پێ دەڵێن).

﴿ثُمَّ ليَقطَع فَليَنظُر هَل يُذهِبَنَّ كَيدُهُ ما يَغيظُ﴾ [الحج: ١٥] «ئەوجا با بیبڕێت، بزانێ ئەم تەگبیرەی داخی سینەی دادەمرکێنێتەوە؟»

با خۆی بخنکێنێ و هەوای لە خۆی ببڕێت تا دەمرێت! یان لە بەرزاییەک ئەمە بکا کە پەتی بڕی، ڕاست بکەوێت و ملی بشکێت. جا گەر بەڵێنی خوا شیفای سینەی دووڕووان نادا لە گومان و ترس و، تیماری ئەو داخەی ناکا کە لە موسڵمانان هەژمار کراوە و دەشزانێت ئەوان دۆڕاون [بە بڕوای خۆی]، هەروەها گەر بەڵێنی خوا وا ناکات بێباوەڕان بێئومێد بن لە دواپێهێنانی ئیسلام و پیلان لێ گێڕانی، با هەردوو تاقم هەوڵ بدەن بە ملشکاندنی خۆیان ئەم

---
(١) [مسند أحمد: ١٦٩٥٧]

ئاشووب و هەرایەی ناو دڵیان هێور بێتەوە!

ئیبن عاشوور دەفەرمووێت:

"ئەگەریشی هەیە ئایەتەکە مەبەستی گرۆیەکی دیکە بێت، کە لە سەروەختی لاوازیی ئیسلامدا موسڵمان بوویێتن و بێئومێد بوویێتن لە سەرخستنی خوایی و کەوتبێتنە ناو سەغڵەتی و مەراقەوە و، ختوورەی شەیتانیان بۆ هاتبێ کە واز لە ئیسلام بهێنن و بگەڕێنەوە سەر کوفر. سا پەروەردگاریش بەم ئایەتە دایخورپاندن و هەڕەشەی لێ کردن کە ئەگەر هێندە بێئومێدن لە سەرکەوتن لە دونیادا و بەگومانن لە بەدەستهێنانی پاداشتی دواڕۆژیش، ئیدی هەڵگەڕانەوەیان لە ئیسلام زیانێک بە خوا و پێغەمبەرەکەی ناگەیەنێت و زەفەرێک بە ئایین نابات، ئەگەریش دەیانەوێ با خۆیان بخنکێنن، بەشکوو ئەوە کەفوکوڵی لەرزۆکی و کەسەریان دامرکێنێتەوە، لەوانەشە ئەمانە دووڕووان بوویێتن".

"سیعدی"ش ئاماژە بە واتایەکی نازەنین و جێسەرنجی دیکە دەدات:

"واتای ئەم ئایەتە پیرۆزەش: ئەی ئەوەی دوژمنایەتیی موحەممەدی پێغەمبەر (ﷺ) دەکەیت و لە هەوڵی کوژاندنەوەی ئایینەکەیدای، بە نەزانیی خۆت پێت وایە ئەم هەوڵدانەت شتێک سوودی دەبێت، بزانە چەندی ڕێگەش بگریتە بەر و ئارەقەی شەو و ڕۆژ بکەیتەوە لە پیلانگێڕان لە پێغەمبەرەکەی، هێشتا داخت نامرێتەوە و شیفای ڕقت نایە، چونکە توانای ئەوەت نییە، بەڵام وا ڕێگەیەکت بۆ پێشنیار دەکەین شیفای زامت بێت و پاڵپشتیی ئاسمان لە موحەممەد ببڕیت -ئەگەر مومکین بێت-. لە دەرگەوە بۆی بچۆ و هۆکاری خۆی بۆ بگرە بەر. گوریسێکی چنراوی تۆکمە، یان هەر ئامرازێکی دی بهێنە و بیگیرێنە لە ئاسمان و ئەوجا سەرکەوە پێیدا، هەتا دەگەیتە ئەو دەلاقانەی ئاسمان کە پاڵپشتی و سەرخستنی پێدا دێتە خوار، دایان بخە و قوفڵیان بدە و بپانبڕە، بەمە چارەت دەبێت. ئەمەیە ڕاوێژ و پیلان. ئیدی بە جگە لەمە،

هەرگیز وامەزانە ڕزگارت دەبێت و سەرفراز دەبیت، با تەواوی بوونەوەریش هاوکارت بن. ئەم ئایەتە پیرۆزەش، بەڵێن و مژدەی ڕاشکاوی سەرخستنی پەروەردگاری تێدایە بۆ ئایینەکەی و پێغەمبەرەکەی و بەندە باوەڕدارەکانی و بێئومێدکردنی بێباوەڕان، ئەوانەی دەیانەوێت بە دەمیان نووری خوا بکوژێننەوە، کە خوا تەواوکەری نووری خۆیەتی، با کافرانیش پێیان ناخۆش بێ، واتە: با هەرچیش هەوڵ دەتوانن، بیدەن".

واتای قسەکەی سیعدی ئەوەیە، ئایەتەکە ئاماژەی ئەوە دەکات کە کەس ناتوانێت دەرگەی سەرکەوتن لەسەر باوەڕداران ببەستێت، چونکە بە ئاسمانەکانەوەیە.

﴿إن ربي لطيف لما يشاء﴾ «پەروەردگارم وردەکارە بۆ ئەوەی دەیەوێت»:

ئەوجا برام، گەر تۆ لە باوەڕدارانی بەڵام فووتێبوونی باتڵ و دەسەڵاتداربوونی ئەهلەکەی دەتترسێنێت و عەقڵت قەبووڵی ناکات چۆن خوای گەورە ئایینەکەی سەر بخات، کاتێک توانا ماددییەکان هیچ لە بەرژەوەندیی ئاییندا نین، ئەوا بۆ دڵنیابوونەوەی دڵت پێت دەڵێم:

﴿إِنَّ رَبِّي لَطِيفٌ لِمَا يَشَاءُ إِنَّهُ هُوَ الْعَلِيمُ الْحَكِيمُ﴾ [يوسف: ١٠٠] «بەڕاستی پەروەردگارم وردەکارە بۆ هەرچی دەیەوێت هەر ئەویشە زانا و دانا» ، واتە: کە کارێکی بوێت، هۆکاری بۆ ساختە دێنێ و ڕێکی دەخا و دەیباتە سەر، بە ئاسانترین و نیانترین و وردترین ڕێگەیەک کە بە خەیاڵیشدا نەیەت. لە هەناوی تەنگانەیەکی توندەوە، بۆ فراوانیی دەروویەکی سەرسووڕهێنەر؛ لە لاوازییەوە، بۆ بڵندی و دەسەڵاتداری.

ئەم ئایەتە لەسەر زاری یووسوفە (علیه السلام)، یووسوفێک خوا لە تاریکایی زیندانەوە بەرەو پێگەی بڵندی و مەزنی و بەڕێوەبەری و فرمانڕەوایی بردی و، لە هەر کوێی زەوی میسر بیویستایە، ماڵ و جێی و مەنزڵ بوو بۆی،

تەنیا بە خەونێک کە پیشانی پادشا درا!

﴿إِنَّ رَبِّي لَطِيفٌ لِمَا يَشَاءُ﴾

هەر ئەو بوو (سبحانە)، کە پاشی ئەوەش وای کرد فیرعەون مووسا لە تابووتێکی ناو دەریاوە بگرێتەوە و لە ماڵەکەی خۆیدا بەخێوی بکات، بۆ ئەوەی فەوتانی فیرعەون و سەربازەکانی لەسەر دەستی مووسا (علیە السلام) بێت!

﴿إِنَّ رَبِّي لَطِيفٌ لِمَا يَشَاءُ﴾

هەر ئەو بوو (سبحانە)، کە ئیمانی هاوێشتە دڵی نوعەیمی کوڕی مەسعوودەوە، ئەو ڕۆژی بەنو قوڕەیظە ناپاکییان کرد و باوەڕداران لە ژێر و ژوورەوە دەورە درابوون، نوعەیم ئاشووبی خستە نێوان موشریکان و جوولەکەوە، ئەوجا پەروەردگار بایەکی نارد و جەنگی لەکۆڵ باوەڕداران کردەوە.

﴿إِنَّ رَبِّي لَطِيفٌ لِمَا يَشَاءُ﴾

هەر ئەو بوو (سبحانە)، کە فاطمییەکانی میسری بەردایە گیانی یەکتر، تا ئەوەی لەدژی یەکتر هاوار بەرنە لای نورەددین زەنکی و ئاویش صەلاحەددین بنێرێ، قۆناغێکی نوێی پاککردنەوەی میسر لە بۆگەنی وان دەست پێ بکا و، میسرێک کە بووبووە لانکەی دوژمنایەتیکردنی ئیسلام، بێتە ژێر سایەی دەوڵەتی صەلاحەددین و جەنگی خاچپەرستانی پێ بکا!

﴿إِنَّ رَبِّي لَطِيفٌ لِمَا يَشَاءُ﴾

هەر ئەو بوو (سبحانە)، وای کرد تەتار سەیفەددین قوطوز بە چەند درهەمێک بفرۆشن، تا لە دواییدا فەوتانیان بە دەستی وی بێت!

﴿إِنَّ رَبِّي لَطِيفٌ لِمَا يَشَاءُ﴾

هەر ئەو بوو (سبحانە)، دەوڵەتانێکی "زلهێز" کە هەوڵیان ئەوە بوو هەندێک

لە موسڵمانان بەکار بهێنن لە جەنگی دژ بە دەوڵەتانی کێبەرکێکاری خۆیان، کەچی نغرۆی ناو لمی وڵاتانی هەمان ئەو موسڵمانانە بوون، پاش بیست ساڵ و ڕسوایانە، کلکیان دایە سەر شانیان و گەڕانەوە و دەرچوون لێی.

﴿إِنَّ رَبِّي لَطِيفٌ لِما يَشاءُ﴾

زۆری جگە لەمەش. بێباوەڕان پیلان دەگێڕن و هەمان پیلان بەسەر خۆیاندا هەڵدەگەڕێتەوە و لەناوچوونیان هەر لەوەدا دەبێ، کە وایان دەزانی خاڵی هێزە بە دەستیانەوە:

﴿وَلا يَحِيقُ المَكرُ السَّيِّئُ إِلّا بِأَهلِهِ﴾ [فاطر: ٤٣]

«پیلانی خراپیش تەنیا بەسەر خاوەنەکانیدا دێتەوە.»

﴿وَيَمكُرونَ وَيَمكُرُ اللَّهُ وَاللَّهُ خَيرُ الماكِرينَ﴾ [الأنفال: ٣٠]

«پیلان دەگێڕن و خواش پیلان دەگێڕێت و خواش باشترینی پیلانگێڕانە.»

خەریکی پیلانگێڕییەکی مرۆیی داخوراون ئەوان، لە بەرانبەر پیلانگێڕیی خوای زاڵی زەوی و ئاسمانەکان (سبحانه وتعالى):

﴿إِنَّهُم يَكيدونَ كَيدًا ۝١٥ وَأَكيدُ كَيدًا﴾ [الطارق: ١٥ - ١٦]

«ئەوان پیلانێک دەگێڕن و (١٥) ئەمنیش پیلانێک دەگێڕم.»

سامانیان بەخەرج دەدەن بۆ بەستنی ڕێگەی خوا، بەڵام سەری خۆیانی پێ پان دەبێتەوە:

﴿إِنَّ الَّذينَ كَفَروا يُنفِقونَ أَموالَهُم لِيَصُدّوا عَن سَبيلِ اللَّهِ فَسَيُنفِقونَها ثُمَّ تَكونُ عَلَيهِم حَسرَةً ثُمَّ يُغلَبونَ﴾ [الأنفال: ٣٦]، «بەڕاستی ئەوانەی بێباوەڕ بوون، سامانەکانیان بەخەرج دەدەن بۆ ئەوەی [خەڵک] لە ڕێگەی خوا بدێرن،

سا [دەبینی] بەخەرجی دەدەن و پاشان دەبێ بە داخیش بۆیان و پاشانیش دەبەزێنرێن.»

جا خۆت بەوەوە سەرقاڵ مەکە "چۆن دەکرێت خوا ئایینەکەی سەر بخات؟"، بەڵام سەرگەرم و بەمشووری ئەوە بە، تۆ خۆت لە گرۆی سەرخەری ئەم دینە بیت و تا کۆتا هەوڵ و توانا، لەسەر ڕێگەکانی سەرخستنی بیت، شکۆی هاوکاریکردنت لە سەرخستنی ئوممەتدا پێ ببرێت، ئیتر با ئەم سەرخستنە پاش مردنی تۆش بێت. خوای گەورە من و تۆش لەوانە بگێڕێت.

ئامۆژگاریشتان بە خوێندنەوەی ئەو پەرتووکەمان دەکەین "بَشائِر - مزگێنییەکان"[1]؛ بۆ لادانی نائومێدی و داڕووخان و گومان لەسەر بەڵێنی خوا بە سەرخستنی باوەڕداران. کە هیچێک لەمانە، سیفەتی باوەڕدار نین.

---

(١) ڕێکخراوی ئاستانە ئەم پەڕتووکەی وەرگێڕاوە بۆ کوردی لەژێر ناونیشانی (مزگێنییەکان)

# ١٢- خۆشویستن و هەڵپەکردن بۆ دونیا و دەربڕینی قەڵسی و ناڕەزایی لە وەختی بەڵادا

دووڕوو بەمەرجی دادەنێت کە ئیسلام سوودێکی دونیایی پێشەکییانەی بۆ بهێنێت، ئەوجا بە ئایین وەری بگرێت. چۆن وا نییە کە سنوورەکانی بینایی ئەو، تەنیا لای واتا نزمە دونیاییەکان وەستاوەتەوە و، پاداشتی دوارۆژیش لە هەژمار و لێکدانەوەکانیدا نییە؛ چونکە ئەسڵەن گومانی لە دوارۆژ هەیە. پەروەردگار لە وەسفی دووڕوواندا دەفەرمووێت:

﴿وَمِنهُم مَن يَلمِزُكَ فِي الصَّدَقاتِ فَإِن أُعطوا مِنها رَضوا وَإِن لَم يُعطَوا مِنها إِذا هُم يَسخَطونَ﴾ [التوبە: ٥٨]، «هەروا هەیانە لەبارەی دابەشکردنی خێراتەکانەوە تانەت لێ دەدا، جا ئەگەر پێیان بدرێت لێی ڕازی دەبن و گەر پێیان نەدرێت، دەبینی قەڵس و بەبۆڵە و ناڕازین.»

جا کابرا دووڕووە خاوەنخوێنەکە بە پێغەمبەری (ﷺ) وت: "ئەی پێغەمبەری خوا، دادگەر بە"! وەک چاوچنۆکی و تەماعداری بە شتێک کە مافی ئەو نییە ئەمەی گوت. دووڕوو ئاوایە، هێندە لە دین ڕازییە کە ماڵێکی دونیای بۆ وەدی بهێنێت، چونکە هەر لە بنەڕەتەوە موسڵمانبوونی لەپێناو ڕەزامەندی خوا و لەگەڵبوونی لە دونیا و پاداشتی تەواو و مەزنی دوارۆژ نەبووە.

بوخاری گێڕاوێتییەوە لە ئیبن عەبباسەوە، لە ڕاڤەی ئەو فەرمایشتەی پەروەردگاردا (سبحانە وتعالی):

﴿وَمِنَ النّاسِ مَن يَعبُدُ اللَّهَ عَلى حَرفٍ فَإِن أَصابَهُ خَيرٌ اطمَأَنَّ بِهِ وَإِن أَصابَتهُ فِتنَةٌ انقَلَبَ عَلى وَجهِهِ خَسِرَ الدُّنيا وَالآخِرَةَ ذلِكَ هُوَ الخُسرانُ المُبينُ﴾ [الحج: ١١] «هەندێک

لە خەڵک هەن کە بەسەر لێوارەوە خوا دەپەرستێ جا ئەگەر تووشە خێرێک بێت دڵنیا دەبێتەوە پێی و گەر تووشە فیتنە و ناڕەحەتییەکیش بێت هەڵدەگەڕێتەوە دونیا و دوارۆژیشی دۆڕاندووە ئا ئەوەیە دۆڕاندنی ڕوون و ئاشکرا»

فەرموویەتی: "کابرا دەهات بۆ مەدینە، جا گەر ژنەکەی کوڕی ببوایە و ئەسپەکانی ئاوس بوونایە و بزانایە، دەیگوت: 'ئەمە دینێکی چاکە'، ئەگەریش ژنەکەی منداڵی نەبایە و ئەسپەکانی ئاوس نەبوونایە، دەیگوت: 'دینێکی خراپە ئەمە'!"(١)

ماڵوێرانە بەدیهاتنی ماڵی دونیا دەکاتە بەڵگە لەسەر ڕاستێتیی ئیسلام، کە تووشی بەڵایەک دێ، ئەمە بە ئاماژەی بەتاڵێتیی ئیسلام دەخوێنێتەوە! چ تەنگەبەرییەک لە ئاسۆکاندا و چ گۆشەتەسکییەک لە ڕووانیندا!

چەندیش لە واقیعی خۆماندا خەڵکێک دەبینین، کە لە بچووکترین بەڵادا بۆڵە لەدەست پەروەردگاریان دەکەن و جۆرەها گومانی خراپی پێ دەبەن. ئەوانە دووعای ماڵوێرانی و داوەشینیان لێ کراوە.

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی:

"دارِزێ بەندەی دینار و بەندەی درهەم و بەندەی بەرگ و کەوا؛ بەشی بدرێ ڕازییە و بەشی نەدرێ نارازی، دارِزێ و پەکی کەوێ، دەک درکێکیشی لە گیانی خۆی بۆ دەرنەکرێ".(٢)

بەندەی درهەم و دینار، لەناو پرەنسیپ و ڕێبازە جیاوازەکاندا دێت و دەچێت بە شوێن پارە و پۆست و پێگەدا. لەوانەشە بەئاشکرا لە ئیسلام خۆ دانەڕنێت، بەڵام گۆڕینی تێدا بکات و ئارەزووی بگۆڕێت و وای دانێت ئەوەی خۆی

---

(١) [البخاري: ٤٧٤٢]

(٢) [ابن ماجه: ٤١٣٦]

لەسەریەتی لەگەڵ ئیسلام دێتەوە، بەسەر دوو دەست و دوو پێدا لاسکەلاسکی شوێن باقوبریقی دنیایەتی، جا لەوەیە درکی زۆر بە دەست و پێیدا بچێت لەم هەوڵ و ڕەوتەیدا، ئەوکاتیش ئیدی "دەک درکێکیشی لە گیانی خۆی بۆ دەرنەکرێ".

لە بەرامبەریشدا پێغەمبەر (ﷺ) لە درێژەی فەرموودەکەدا دووعا دەکات بۆ باوەڕداری بەندەی خوا، نەک بەندەی دونیا؛ دەفەرمووێت:

"خۆش بە حاڵی بەندەیەک، لغاوی ئەسپەکەی لە مشتدایە لەپێناو خوادا، سەر ئاڵۆسکاو و پێ تۆزاوی، لە پاسەوانی بێ، لە پاسەوانییە. لە پشتەوەی سوپا بێ، لە پشتەوەی سوپایە. گەر داوای مۆڵەت بکا، مۆڵەتی نادرێتێ. گەر تکا بکات، تکای وەرناگیرێ."[1]

نیشانەکانی قوربانیدانی ڕێگەی خوا، لە ئاڵۆسکاویی سەری باوەڕدار و لە تۆزاویبوونی پێیەکانی و لەمشتبوونی جڵەوی ئەسپەکەیدا دەردەکەوێ، لە هەر کوێ بانگی جیهاد بەرز بێتەوە، ئەم ڕووی لێ دەنێت. لەگەڵ ئەوەشدا هیچی لە دونیا دەست نەکەوتووە، بگرە تەنانەت ڕێز و پێگەی لای ئەوانەش پەیدا نەکردووە کە دەبوو ڕێز و پێگەی لایان هەبێت! دەبینی مۆڵەتی چوونەژوورەوەیەکیشی نییە، بواری وەرگیرانی تکاکارییەکیشی نییە بۆ کەسێکی بکات، هەر کوێ دەچێت، دەست دەنێن بە ڕووی خۆی و داوا و تکاکارییەکانیشیەوە، چونکە لەناو خەڵکدا نە پێگەی هەیە و نە ناسراویشە.

جا ئایا ئەمە پاڵی نا بۆ هەڵگەڕانەوە و دەستبەردان لە جیهاد و قوربانیدان؟ نەخێر، بگرە بەپێچەوانەشەوە، هەرچی بەرژەوەندیی موسڵمانانی تێدا بێت، ئەوە دەکات. جا وەختێک شەونخوونی دەکات بۆ پاسەوانی و خەڵک خەوتوون و ئەم ئێشکچیی سوپای موسڵمانانە. کاتێکیش فرمانی پێ بکرێ بچێتە کلکی سوپا

---

(١) [البخاري: ٢٨٨٦]

لە پشتەوە و، شمەکی جێماوی سەربازانی کۆکاتەوە و لەگەڵ دەستی خۆیدا بەشوێنیاندا بیهێنێتەوە و یارمەتی ئەوانە بدات کە پەکیان دەکەوێ لە ڕێگە، سادە و ئاسان ڕاستەوڕاست جێبەجێی دەکات، ئەمە نەک چونکە نەفسبەرزیی کەم بێت! هەرگیز! بەڵکوو چونکە ئەم باوەڕدارە لەگەڵ مرۆڤدا مامەڵە ناکات، لەگەڵ خوای مرۆڤەکاندا مامەڵە دەکات (سبحانه وتعالى). پاداشت و ڕێزلێنانی مرۆڤەکانی مەرام نییە، ڕەزامەندیی پەروەردگاری هەرە بەرز و باڵای مەبەستە. ئەویش بەدڵنیاییەوە پاداشتی دەدات و ڕازی دەکات. پێغەمبەر (ﷺ) دووعای بە (طوبى) بۆ کردووە، کە دووعای چوونە ناو بەهەشتە.

ئاوایە باوەڕدار؛ پێشکەش دەکا و قوربانی دەدا و، بۆڵەشی نایەت ئەگەر پەروەردگار لە دونیادا پاداشتێک ڕەوانە نەکات و تەنیا تەمای پاداشتی تێر و تەواوی قیامەتیەتی.

بەڵام دووڕوو، نایەوێت هیچێک پێشکەش بکات، مەگەر بەرانبەرێکی ماددیی دنیایی هەبێت! پەروەردگار دەفەرموێت:

﴿سَيَقولُ المُخَلَّفونَ إِذَا انطَلَقتُم إِلى مَغانِمَ لِتَأخُذوها ذَرونا نَتَّبِعكُم﴾ [الفتح: ١٥]

«لەجێماوەکان پێتان دەڵێن: "وەختێک دەرچوون بۆ دەستکەوت کە خەریکەنەوە، بهێڵن ئێمەش شوێنتان بکەوین."»

ئەوانە دواکەوتبوون لە عومرەی حودەیبییە کە پەروەردگار بەڵێنیی دەستکەوتی خەیبەری دابووە ئەوانەی ئامادەی ببوون، جا وەختێک زانییان خەیبەر فەتح دەکرێت و دەکەوێتە دەست موسڵمانان، ئەمجار هەڵپەی ئەوەیان بوو، ڕێگەیان بدرێت ئامادەی غەزای خەیبەر بن! بۆچی؟ چونکە دەستکەوتی تێدایە! بەڵام حودەیبییە خۆ هیچ دەستکەوتێکی دونیایی بەڵێنیدراوی نەبوو، بۆیە هیچ لە خەمیدا نەبوون.

پەورمردگاریش وەڵامی دانەوە: ﴿يُرِيدُونَ أَن يُبَدِّلُوا كَلَامَ اللَّهِ﴾ [الفتح: ١٥] «دەیانەوێ فەرمایشتی الله بگۆڕن.»

چونکە خوا بەڵێنیی دەستکەوتەکانی خەیبەری، تایبەت بە هاوەڵانی حودەیبییە دابوو. پاشان دەفەرمووێ:

﴿قُل لَّن تَتَّبِعُونَا كَذَٰلِكُمْ قَالَ اللَّهُ مِن قَبْلُ فَسَيَقُولُونَ بَلْ تَحْسُدُونَنَا﴾ [الفتح: ١٥]

«بڵێ شوێنمان ناکەون، پەروەردگار پێشتووتر ئاوای فەرمووە، جا دەڵێن: بەڵکوو ئێوە ئیرەییمان پێ دەبەن.»

بێشک تۆمەتی ئەوە لە باوەڕداران دەدەن کە لەبەر گلدانەوەی ماڵی دونیا و بەشنەدانی کەس، ئاوا ئەمان بەجێ دەهێڵن و نایانبەن. پەروەردگاریش بەرپەرچی ئەم دواکەوتووانە بەم وەسفە دەداتەوە: ﴿بَلْ كَانُوا لَا يَفْقَهُونَ إِلَّا قَلِيلًا﴾ [الفتح: ١٥] «بەڵکوو تێگەشتنێکی کەم نەبێ، نییانە»،

پاشان پەروەردگار هەلێکی دیکەی پێدان بۆ ئەوەی نییەتیان چاک کەنەوە و ئامادەیی خۆیان دەرببڕن بۆ قوربانیدان، بەبێ گەرەنتیکردنی بەرامبەرێکی دونیایی، فەرمووی:

﴿قُل لِّلْمُخَلَّفِينَ مِنَ الْأَعْرَابِ سَتُدْعَوْنَ إِلَىٰ قَوْمٍ أُولِي بَأْسٍ شَدِيدٍ تُقَاتِلُونَهُمْ أَوْ يُسْلِمُونَ فَإِن تُطِيعُوا يُؤْتِكُمُ اللَّهُ أَجْرًا حَسَنًا﴾ [الفتح: ١٦]

«بڵێ بە لەجێماوەکانی دەشتەکی، کە بانگ دەکرێن بۆ [جەنگی] خەڵکێکی بەهێز و سەخت و جیر، یان شەڕیان دەکەن، یان ئەوان موسڵمان دەبن. سا گەر گوێڕایەڵ بن، پەروەردگار پاداشتێکی چاکتان دەداتەوە.» طەبەری لە ڕاڤەی "پاداشتێکی چاک"دا، دەفەرمووێت: "ئەوە بەهەشتە". چۆن بڵێی، لەم هەلەیاندا پەروەردگار گەرەنتیی دەستکەوتێکی دونیایی بە لەجێماوان نەدا، وەک لە خەیبەر بە باوەڕدارانی دا. جا ئەگەر ئەو لەجێماوانە ڕازی بن بە بەهەشت، بە

گوێڕایەڵیکردنی خوا دەیسەلمێنن و دەردەچن بۆ جەنگی ئەو خەڵکە ملهوڕ و سەرسەخت و بەهێزە.

﴿وَإِن تَتَوَلَّوا كَما تَوَلَّيتُم مِن قَبلُ يُعَذِّبكُم عَذابًا أَليمًا﴾ [الفتح: ١٦]

«خۆ ئەگەر پشت هەڵبکەن وەک پێشتر پشتتان هەڵکرد، سزایەکی بەئێشتان دەدات.»

چونکە بەدیارخەری ئەو ڕاستییەیە، کە هێشتا تەوبەتان نەکردووە و دڵتان چاک نەکردووە.

هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) باسی لەوانە کرد کە کە دین بە دونیا دەفرۆشن، فەرمووی:

"دەستپێشخەری بکەن بە کردەوەکان، بەر لە فیتنەگەلێک، وێنەی پارچە شەوی تاریک؛ پیاو بەباوەڕداری ڕۆژ دەکاتەوە و بەکافری ئێوارەی لێ دێ، یان بەباوەڕداری ئێوارەی لێ دێ و بەکافری ڕۆژ دەکاتەوە، دینی خۆی بە شتێکی دونیا دەفرۆشێت".[١]

### ئامادەنەبوون بۆ بەرگەگرتنی ئازار لەپێناو خوادا:

هەر کەسیش ئەمە حاڵی بێ لە بەمەرجگرتنی بەرژەوەندیی دونیایی، بۆ ڕازیبوون بە ئیسلام وەک ئایین، ئیدی ئامادە نابێ بۆ بەرگەگرتنی ئازار لەپێناو خوادا. پەروەردگار دەفەرمووێ:

﴿وَمِنَ النّاسِ مَن يَقولُ آمَنّا بِاللَّهِ فَإِذا أوذِيَ فِي اللَّهِ جَعَلَ فِتنَةَ النّاسِ كَعَذابِ اللَّهِ﴾ [العنكبوت: ١٠]

---

(١) [صحيح مسلم:١١٨]

«هەندێک لە خەڵک هەن، دەڵێن: "باوەڕمان بە خوا هێناوە"، وەختێکیش ئازار بدرێ لەپێناو خوادا، ئاشووبی خەڵک و سزای خوا وەک یەک لێ دەکات.»، بانگەشەکردنی ئیمان بە زمان ئاسانە.

بەڵام کاتێک ئازار دران لەپێناو ئەو خوایەدا کە بانگەشەی باوەڕبوونیان پێی دەکرد، دڵیان لەرزی و ئەو ئایینەیان واز لێ هێنا کە بانگەشەیان دەکرد، چونکە دڵە نەخۆشەکانیان ئەم ئازارە دونیاییە گەورە دەکاتەوە، وەک ئەوەی لەگەڵ سزای سەختی دوارۆژدا یەکسان بێ! ئیدی ئەومیان هەڵبژارد خۆیان لە ئیسلام بکەن بە نەناس تاکوو سەلامەت بن لە ئازاری دونیا، ئیتر با ئەوە سزای دوارۆژیشی پێوە بێ. بابەتەکەش ئەوە نییە بڵێی ئازاریان لە خۆیان دوور خستۆتەوە، بەڵام هێشتا دڵیان دڵنیا بووە بە ئیمان؛ چونکە ئەمەیان لای پەروەردگاری میهرەبانەوە ڕێگەی پێ دراوە، بەڵکوو ئیتر بە دڵ بێگانە بوونەوە لە ئیسلام.

خۆزگە لەم سنوورەشدا دەوەستان، بگرە: ﴿وَلَئِن جاءَ نَصرٌ مِن رَبِّكَ لَيَقولُنَّ إِنّا كُنّا مَعَكُم﴾ [العنكبوت: ١٠]

«ئەگەریش سەرخستنێک لای پەروەردگارتەوە بێت، دەڵێن: "بەڕاستی خۆ ئێمەش لەگەڵتاندا بووین."» جا کاتێک ئازار نەما و سەرکەوتنێک وەدی هات بۆ موسڵمانان، ئەو دووڕووانە دەگەڕێنەوە سەر بانگەشەی ئیمان، بۆ ئەوەی بەش بەرن لەم قازانجە دونیاییە! دەیانەوێ فێڵ لە خوا و لە باوەڕداران بکەن. پەروەردگاری بەرز و باڵاش فەرمووی:

﴿أَوَلَيسَ اللَّهُ بِأَعلَمَ بِما في صُدورِ العالَمينَ ۝ وَلَيَعلَمَنَّ اللَّهُ الَّذينَ آمَنوا وَلَيَعلَمَنَّ المُنافِقينَ﴾ [العنكبوت: ١٠ – ١١]

«ئەرێ (الله) زاناتر نییە بەوەی لەناو سینەی جیهانیاندایە (١٠) سوێند بێت کە (الله) ئەوانە هەر دەزانێ کە باوەڕیان هێناوە و، ئەوانەشی کە دووڕوون دەزانێ.»

سا بەردەوام بەڵاکان بەسەر خەڵکدا دێن و دەچن تاکوو باوەڕداری لە دووڕوو پێ بناسرێتەوە. پەروەردگار دەفەرمووێت:

﴿ما كانَ اللّهُ لِيَذَرَ المُؤمِنينَ عَلى ما أَنتُم عَلَيهِ حَتّى يَميزَ الخَبيثَ مِنَ الطَّيِّبِ﴾ [آل عمران: ١٧٩]

«پەروەردگار ئەوە نەبوو کە باوەڕداران لێگەڕێ بەو حاڵەی ئێوەی تیان، هەتا پیس لە پاک جیا نەکاتەوە.»

دووڕوو بە دیدگەی تەنگی دونیایی خۆی، هەرگیز دەروونی بۆ ئاسۆکانی دواڕۆژ و ژیانی هەتایی ئەوێ ناڕوانێت. هەرگیز بەو پەیمانە ڕازی نابێ، کە خوا لە بەندە باوەڕدارەکانی وەرگرتووە کە فەرموویەتی (سبحانە):

﴿إِنَّ اللَّهَ اشتَرى مِنَ المُؤمِنينَ أَنفُسَهُم وَأَموالَهُم بِأَنَّ لَهُمُ الجَنَّةَ يُقاتِلونَ فى سَبيلِ اللَّهِ فَيَقتُلونَ وَيُقتَلونَ﴾ [التوبە: ١١١] «بەڕاستی خوا لە باوەڕداران گیان و سامانیانی کڕیوەتەوە کە بەهەشت بۆ ئەوان بێت، لە ڕێگەی خوادا دەجەنگن جا دەکوژن و دەکوژرێن.»

## دووڕوو گومانی خراپ بە پەروەردگاری دەبات لە کاتی بەڵادا:

لێرەدا دەمەوێت چەند دەقێکی مەزنی ئیبن قەییم بگوێزمەوە کە تێیدا دەردی گومانخراپی بەرانبەر بە خوا وەسف دەکات، ئەم دەردەش هاوەڵی دووڕووییە لەو دڵانەدا کە مافی پەروەردگاریان نازانن، وایان داناوە کۆمەڵێک "ئەرک"یان بەسەر خواوە هەیە. جا گەر شتێک لەم "ئەرکانە" کەم بکات، ئیتر گومانی خراپ بە پەروەردگاری دەبات و، هەرچی کێماو و زووخاو و ژەنگ و پیسی دڵەکانە، دێتە سەر زارەکان. دەی نا سوێند بە (اللە)، ئەمە لە دڵێ ناوەشێتەوە کە لەگەڵ پەروەردگاریدا خۆشەویستییەکی خاوێن و قەدرزانینێکی بەجێی هەبێت.

ئیبن قەییم دەفەرمووێت:

(جا زۆرینەی خەڵک، بگرە هەموویان، مەگەر یەکێ خوا بژاری کردبێ، هەر بە نارەوا گومانی خراپ بە خوا دەبەن، زۆرینەی ئادەمیزاد وادەزانن بەشیان کەمە و بەختیان نییە و شایەنی سەرتر لەوە بوون کە ئێستە خوا داویەتی پێیان، زمانحاڵیشیان دەڵێ پەروەردگارم ستەمی لێ کردووم و ئەوەی مافی خۆمە لێی زەوت کردووم. خۆ بە زمانی ناو دەم نکۆڵی لە وتنی ئەمە دەکا و، بوێری ئەوەی نییە بیڵێ. هەر کەسیش دەروونی خۆی بپشکنێ و نغرۆی ناسینی شاراوە و لۆچ و پێچەکانی بێت، دەبینێ ئەمەی تیا شاراوەتەوە، وەک شارانەوەی ئاگر لە شقارتەدا. سا دەست لە شقارتەی گیرفانی هەر کەس بدە، با قیژەی پریشکەی پێت بڵێ چی لە هەمبانەدایە. برۆ هەر کەسیش دەپشکنی، دەبینی ئیللا گلەیی هەیە لە قەدەرەکان و پێشنیاری جیاوازی پێ شک دێ بۆ خولگەی سوورانەوە و ڕوودانیان، دەبوو ئاوا بێ و ئاوا بێ! ئیتر هەیە زۆر و هەیە کەم. ئەوجا ئادەی دەروونی خۆشت بپشکنە بزانە بەسەلامەت لەمە دەرچوویت؟

فإن تنجُ منها تنجُ مـــن ذي عظيمة

وإلا فإنـي لا أخالـــــــك ناجيـــا

✿✿✿✿✿

گەر لەمە ڕزگارت بووبێ، لە یەکێکی گەورە ڕزگارت بووە

گەر نا، وا نازانم لە هیچێـــــــــــــک ڕزگارت بووبێ

سا با ئەوەی ژیرە و دڵسۆزی خۆیەتی خەمی ئەمە بخوات، هەر کات تەوبە بۆ لای پەروەردگاری و داوای لێخۆشبوون بۆ گومانخراپییەکانی بەرانبەری

بکات، گومانی خراپ بە نەفسی خۆت بەرە کە لانکەی هەرچی خراپە و چاوگی هەرچی شەڕێکە.. ئەو لەپێشترە بە گومانی خراپ هەتا خوای داناترینی دانایان و، دادگەرترینی دادگەران و میهرەبانترینی میهرەبانان، خوای دەوڵەمەندی ستایشکراو، کە دەوڵەمەندیی تەواو و ستایشی تەواو و دانایی تەواو هی ئەوە، خوای دوور و پاک و بێگەرد لە هەموو کەمی و خراپەیەک، لە زاتیدا و لە سیفاتیدا و لە کردار و لە ناویدا، کارەکانی هەموو دانایی و بەرژەوەندی و میهرەبانی و دادگەرین، ناوەکانی هەرەجوان و تەواون.

**فلا تظنن بربـــــك ظن سوء**

**فإن الله أولـــــــى بالجميل**

**ولا تظنن بنفســـك قط خيرا**

**وكيف بظالـــــم جان جهـول**

**وقل يا نفـــس مأوى كل سوء**

**أيرجى الخيـــــر من ميت بخيل**

**وظن بنفسـك السوآى تجدها**

**كذاك وخيرهـــا كالمستحيـل**

**وما بك من تقـــى فيها وخير**

**فتلك مواهـــــب الرب الجليل**

**وليس بهـــــا ولا منها ولكن**

**من الرحمـــــن فاشكر للدليل**



سا گومانی خـــــراپ بـــە پەروەردگارت مەبە
چونکە خـــــوا شایەنترینە بـــە هەموو چاکێک

گومانی باشیـــــــش بـــــە نەفست مەبە
بە ستەمکارێکــــــــی تاوانباری نــــــەزان

بڵێ ئەی نەفـــــــس، لانکەی هـــەر خراپەیەک
ئەرێ چاکە لە مردوویەکـــی ڕەزیل چاوەڕێ دەکرێ؟!

خراپترین شکیشـــت بـــە نەفست هەبێ، دەبینی
کە وایە و چاکیشی بـــە دەگمەن و ئەستەم هەیە

نە تەقوایەکـــــــی تێـــــدایە، نە چاکەیەک
ئەوەشی هەبێ، میهــــر و بەخشینی خوای مەزنە

نە بە یارمەتی نەفســــــــە و، نە لەوەوەیە بەڵام
لە خوای میهرەبانەوەیە، ســـا شوکرانەی خاوەنی بکە

جا ئەو فەرمایشتەی ئیبن قەییم: "سا دەست لە شقارتەی گیرفانی هەر کەس بدە، با قیژەی پریشکەی پێت بڵێ چی لە هەمبانەدایە."، واتە ئەو کەسەی ئەم سیفەتە دووڕوویەی تێدا بێت، ئەگەر بخرێتە سەر مەحەک و بخرێتە ڕوو بۆ تاقیکردنەوە، گومانخراپبوونی بە خوا و بۆڵە و ناسزایی و بێئارامییەکەی، لە سەرجەم هەڵسوکەوت و چرچ و لۆچەکانی ڕوخسار و وشە لەزماندەرپەڕیوەکانیدا دەردەکەوێت.

بەڵام باوەڕدار، لە ناڕەحەتییەکاندا دەچەسپێت، ئەم چەسپانەش ڕۆژییەکە

خوا بەوانەی دەدات کە لە ڕۆژانی خۆشی و فراوانیدا لەخواترسییان هەبووە. پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرمووێت:

"لە خۆشیدا خۆت بە خوا بناسێنە، لە سەختیدا دەتناسێت".[١]

دووڕووان لە خۆشییاندا لە خوا نەترساون، ئەویش لە ناخۆشیدا دامەزراوی نەکردن.

ئامۆژگاریشمان بەو کتێبەمانە "حسن الظن بالله" کە بخوێنرێتەوە، کە بە ویستی خوا سوودی دەبێ بۆ یارمەتیدانی باوەڕدار، بۆ ڕازیبوون بە قەزا و قەدەری پەروەردگار و گومانباشی بە پەروەردگاری لە وەختی بەڵادا.

داوامانە لە پەروەردگار، ڕەزامەندیمان لە قەدەرەکانیدا و چەسپانمان لە ئاشوبەکاندا پێ ببەخشێت و وەختێکیش سزای بۆ خەڵکێک هێنا، ئێمەی بەسەلامەتی لێ بپەڕێنێتەوە.

---

(١) [مسند أحمد: ٢٨٠٣]

# ١٣- ترسنۆکی و قەبووڵکردنی ژیانی سەرکزی و نوشوستی

سەیر نییە کە دووڕوو ترسنۆک بێت، چونکە گومانکردنی لە خوا و لە ڕۆژی دوایی، ئەو ڕێگەیەی لێ گرتووە بڵندیی نەفسبەرزی لە خوای باڵا و بەرزەوە وەربگرێ:

﴿وَلِلَّهِ العِزَّةُ وَلِرَسولِهِ وَلِلمُؤمِنينَ وَلٰكِنَّ المُنافِقينَ لا يَعلَمونَ﴾ [المنافقون: ٨] «بۆ خوایە بڵندی و عیززەت و، بۆ پێغەمبەرەکەی و بۆ باوەڕداران، بەڵام دووڕووان نازانن.»

دووڕوو لەوەشدا هێشتا لە هەندێک لە بێباوەڕان و ئەهلی بەتاڵ سووک و چرووکترە، کە ئەوان بەرگری لە پرەنسیپگەلێک دەکەن و وەهمی ئەوە لای خۆیان دروست دەکەن کە ڕاستە، ئیدی -با بەتاڵیش بێت- بۆیان دەبێتە ڕەمزێک هێزی لێوە وەردەگرن. بەڵام دووڕوو خۆ پرەنسیپی نییە. نە عیززەت و بڵندی ڕاستەقینەی لە پەنای پەروەردگاردا (عز وجل) بەرکەوتووە، نە بڵندی و عیززەتی وەهمی لە پرەنسیپە بەتاڵەکانی دیکەشەوە. بۆیە دەبینی لە حاڵەتێکی هەمیشەیی ترسدا دەژی، هەر ساتە و وادەزانێت بە تۆڵەی ئەو کەتنانەی شاردوویەتییەوە و لە دەروونیدایە، بچنە سەری و شتێکی بەسەر بێنن:

﴿يَحسَبونَ كُلَّ صَيحَةٍ عَلَيهِم﴾ [المنافقون: ٤] «وادەزانن هەر هاوارێک بۆ گیانی ئەوانە.»

ڕێک وەک تاوانبارێک بییەوێ تاوانێ بشارێتەوە و، بە ڕێگەکاندا دەڕوات و هەر هاوارێکی گوێ لێ بێ وا تێدەگا، ئەوە ئیتر کۆتاییە.

دووڕوو دەروونێکی پەرت و شڕە و دڕاوی هەیە. لەناو موسڵماناندا دەژی و ترسیشی لێیان هەیە کە ڕۆژێک بە حاڵی بزانن، ئەویش سوێندیان بۆ دەخوات کە بە دڵ و بە جەستەش لەگەڵ واندایە:

﴿وَيَحلِفونَ بِاللَّهِ إِنَّهُم لَمِنكُم وَما هُم مِنكُم وَلٰكِنَّهُم قَومٌ يَفرَقونَ﴾ [التوبە: ٥٦]

«سوێندیش بە خوا دەخۆن کە ئەوان لە ئێوەن، کە ئەوانیش لە ئێوە نین؛ بەڵام ئەوەیە خەڵکێکن ترسیان هەیە.»، واتە: لێتان دەترسن ئەی باوەڕداران. پاشان دەفەرمووێت (سبحانە وتعالی):

﴿لَو يَجِدونَ مَلجَأً أَو مَغاراتٍ أَو مُدَّخَلًا لَوَلَّوا إِلَيهِ وَهُم يَجمَحونَ﴾ [التوبە: ٥٧]

«گەر پەناگەیەک شک بەرن، یان ئەشکەوتێک، یان دەلاقەیەک بۆ ناو زەوی، ڕووی لێ دەکەن بەخێرایی.»

واتە: دووڕووان ئاواتەخوازن شوێنێک هەبوایە هەڵبهاتنایە بۆی لە دەست باوەڕداران، وەک پەناگە، یان کونی شاخێک و چاڵاوێکی ژێر زەوی. هەموو ئەوە تەنیا بۆ ئەوەی لەو حاڵەتی ترسی بەردەوامە ڕزگاریان ببێت، بەڵام هەڵنەهاتن، بۆچی؟ چونکە بژێوی و سامان و ماڵ و منداڵیان لەو شوێنانەدایە کە باوەردارانی لێیە.

لەگەڵمدا وردبەوە لە بەخەمبوونی دووڕوو و چاوتێبڕینی بۆ هەر جۆرە ژیانێک، تەنانەت با ژیانی سووکی و سەرنەوێتیش بێ؛ کێشە نییە، گرنگ ئەوەیە بژی! با لە کونەکێو و ژێرزەمینێکی تاریکیش بێت؛ لەوێ لەگەڵ شەمشەمەکوێرەکان لە تاریکیدا، کێشە نییە، ئەو لەوە ڕاهاتووە لە تاریکییەکاندا پیلان بۆ موسڵمانان بگێڕێت، وێنەی شەمشەمەکوێرە؛ لەوێ بگەڕێتەوە سەر ڕووەکەی دیکەی و بە برا دووڕووەکانی بڵێت کە ئەو گاڵتە بە باوەڕداران دەکات و گومانی لە ئایینەکەیان هەیە و جێی دڵنیایی نییە بۆی، چرپەی

شەمشەمەکوێرەکان لە کونە ڕەشەکاندا! دڵیشی تاریک بە دووڕوویی، وێنەی تاریکیی تونێلەکان؛ ئیدی بۆ ئەمیش وەکوو شەمشەمەکوێرەکان نەژی؟!

ئەوجا لەگەڵمدا ڕابمێنە لە حاڵی ئەم دووڕووە کە تەنیا لەبەر دونیا لەگەڵ موسڵماناندا ماوەتەوە، حاڵی چۆنی لێ دێ گەر پێی بڵێی وا مەترسییەکی نزیک لە دەرەوە دێت و بەرۆکی موسڵمانان دەگرێت! هێندی تر دڵی دادەخورپێت و لەرزیوتر و سەرگەردانتر. پەروەردگار لە وەسفی حاڵیان لەو ساتانەدا دەفەرموورێت: .

﴿فَإِذا جاءَ الخَوفُ رَأَيتَهُم يَنظُرونَ إِلَيكَ تَدورُ أَعيُنُهُم كَالَّذى يُغشى عَلَيهِ مِنَ المَوتِ﴾ [الأحزاب: ١٩]

«جا وەختێک ترس بێت، دەیانبینی سەیرت دەکەن؛ وێنەی ئەوەی لەبەر حاڵی سەرەمەرگ بوورابێتەوە.»

﴿فَإِذا أُنزِلَت سورَةٌ مُحكَمَةٌ وَذُكِرَ فيهَا القِتالُ رَأَيتَ الَّذينَ فى قُلوبِهِم مَرَضٌ يَنظُرونَ إِلَيكَ نَظَرَ المَغشِيِّ عَلَيهِ مِنَ المَوتِ﴾ [محمد: ٢٠]

«جا کاتێک سوورەتێکی چەسپاو و ڕۆشن داببەزێت و باسی جەنگی تێدا بکرێت، دەبینی ئەوانەی دڵیان نەخۆشی تێدایە تەماشات دەکەن، وێنەی تەماشای ئەوەی لەبەر مەرگ بووراوەتەوە.»

ترس و تۆقینێک کە لە باس نەیەت! لە وەختی قوربانیدانەکاندا، بەرۆکی هەر کەس دەگرێت کە دڵی بە گومانکردن لە ئایین و حەزکردن و ویستی توندی ژیانی زەلیلانە نەخۆش کەوتبێت.

باجی سەرکزی:

با هەر کەس کە دەبینێ لە دەروونیدا ڕازیبوون بە ترسنۆکی و سەرکزی هەیە، بزانێ کە دڵی دووڕوویی تێدایە. ئەمەش بەداخەوە حاڵی زۆرێکە لەمرۆدا، سوورن لەسەر ژیانێک، هەر ژیانێک، دەشترسن لە بەجێهێنانی مافەکانی خوا، لە دۆستایەتیکردنی باوەڕداران و خۆبێبەریکردن لە بێباوەڕان و دەربڕینی نەیاری بۆیان. هەموو ئەمە تەنیا لەپێناو ژیاندا، سا تف لە ژیانێ، ژیانی سەرکزی بێ:

ذَلَّ من يغبط الذليـــــل بعيش

رُبَّ عيش أخف منــــه الحِمامُ

من يَهُن يسهل عليــــه الهوان

ما لجرح بميت إيـــــــلامُ



ڕسوا بێ هەر کەس، دڵی بە ژیانی ڕسوایان خۆش بێ

چەند ژیان هەیــــە کە مردن لـــــەو زۆر ئاســانترە

هەر کەس ســـووک بووبێت، سووکــی بەلاوە ئاسانە

مردوو چووزانـــــــێ ئازاری بریــــــــــن چییە!

ئەوانە نازانن کە ئەگەر باجی سەربەرزی نەدەن بە چاوەڕوانیی پاداشتی ڕۆژی دواییەوە، باجی سەرکزی هەر دەدەن، بە باری تاوان و ڕسوایی هەردوو دونیاوە. جوانترینێک کە لەم بارەیەوە خوێندبێتمەوە، ئەو دەقەی سەیید قوطبە ڕەحمەتی خوای لێ بێ:

"بەدڵنیاییەوە سەرکزیش باجی هەیە، وەک چۆن سەربەرزی باجی هەیە. زۆرجار باجی سەرکزیش گرانتر دەکەوێتەوە. هەندێکیش لە نەفسە نزم و لاوازەکان خەیاڵیان وایە، کە سەربەرزی باجێکی بەنرخ و سەختی دەوێ و، بە کەس هەڵناسووڕێ و هەڵناگیرێ، ئیدی ڕسوایی و سووکی هەڵدەبژێرن بۆ هەڵاتن لەم تێچووە قورسانە، ژیانێکی پووچی هەرزان دەژین، ژیانێکی ڕاڕایی و لەرزیوی و ترسنۆکی، کە لە سێبەر و سەدای خۆشیان زەندەقیان بچێ، وادەزانن هەر هاوارێک بۆ گیانی ئەوانە، دەشیانبینی بەخەمترین و سوورترینی خەڵکن لەسەر هەر ژیانێک.

ئەو زەلیلانە باجێکی قورستر لە باجی کەرامەت دەدەن. تەواوی باجی زەلیلی بەتەواوی، دەبێ لە گیانیان بیدەن، لە ڕێز و بەهایان بیدەن، لە شکۆیان بیدەن، لە ئۆقرە و ئارامییان، زۆرجاریش هەر لە خوێن و ماڵیان دەیدەن و هەستیشی پێ ناکەن.

بێگومان باجێک هەیە کە دەبێ تاکەکان بیدەن و کۆمەڵان بیدەن و گەلان بیدەن؛ جا ئەم باجە یان لەبری بڵندی و شەرەف و ئازادی دەدرێت، یان لەبری ڕسوایی و سووکی و کۆیلایەتی. ئەزموونەکان سەرجەمیان گۆیای ئەم حەقیقەتەن، کە نە دەرچەیەک هەیە لێی و نە دەربازبوونێک." فەرمایشتەکانی دواییان هات ڕەحمەتی خوای لێ بێ.

سا لێرەوە، گەورەترین تاوانەکان دەرهەق بە ئیسلام ئەوەیە، وا لە ئەهلەکەی بگەیەنرێت ئایینەکەیان ڕسوایی بۆ ئەوان پێ قەبووڵە. ئەم تاوانە لەم ڕۆژانەدا زۆر دەبرێ بەڕێوە، لەلایەن خەڵکێکیشەوە کە بەشێک لە زانستی پەرتووکەکەی خوا و فەرمموودەکانی پێغەمبەری عیزەتییشی، پێ دراوە. تەنانەت گوێگرانیان خەریکە وەهمی ئەوەیان لا دروست ببێت، کە ئەم [زانایانە] وەحییەکی نوێیان چاو پێ کەوتووە، کە ئایەت و فەرموودەکانی عیززەتی نەسخ کردۆتەوە!

﴿فَلَا تَخَافُوهُمْ وَخَافُونِ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ﴾:

ئەو زمانە شکاوە چرووکەی لەم ڕۆژانەماندا موسڵمانانی لەسەر پەروەردە دەکرێت، واتای زۆرێک لە ئایەت و فەرموودەکانی لە دڵیاندا مراندۆ. سا کوا فەرمایشتەکەی پەروەردگار:

﴿فَلَا تَخشَوُا النَّاسَ وَاخشَونِ﴾ [المائدە: ٤٤] «سا لە خەڵک مەترسن و لە من بترسن.»

ئەگەر ئایینی ئێمە ئایینی بڵندی و ئازایەتی نییە، ئیدی ئەو فەرمایشتەی پەروەردگار واتای چییە:

﴿إِنَّما ذلِكُمُ الشَّيطانُ يُخَوِّفُ أَولِياءَهُ فَلا تَخافوهُم وَخافونِ إِن كُنتُم مُؤمِنينَ﴾ [آل عمران: ١٧٥] «بەڕاستی ئەوە شەیتانە [کە ئێوە] لە دۆستەکانی خۆی دەترسێنێت، سا لێیان مەترسن و لە من بترسن ئەگەر باوەڕدارن.»

ئەگەر فرمانی ئازایەتی و پێداگریمان لە لادانی خراپەدا پێ نەکراوە، دەی ئەو فەرمایشتەی خوا بۆ کێیە:

﴿الَّذينَ يُبَلِّغونَ رِسالاتِ اللَّهِ وَيَخشَونَهُ وَلا يَخشَونَ أَحَدًا إِلَّا اللَّهَ وَكَفى بِاللَّهِ حَسيبًا﴾ [الأحزاب: ٣٩] «ئەوانەی پەیامەکانی خوا دەگەیەنن و لە ئەو دەترسن و لە یەکێکی دیکە جگە لە (الله) ناترسن؛ هەر خواش بەسە کە لێپرسینەوە بکا.»

ئەگەر ڕاگرتنی دروشمەکان بەسە لە کاتێکدا هێشتا دەروونەکان زەلیلن، دەی واتای ئەو فەرمایشتەی خوا چییە:

﴿إِنَّما يَعمُرُ مَساجِدَ اللَّهِ مَن آمَنَ بِاللَّهِ وَاليَومِ الآخِرِ وَأَقامَ الصَّلاةَ وَآتَى الزَّكاةَ وَلَم يَخشَ إِلَّا اللَّهَ﴾ [التوبە: ١٨] «بەڕاستی تەنیا ئەوانە مزگەوتەکانی خوا ئاوەدان دەکەنەوە کە باوەڕیان بە خوا و ڕۆژی دوایی هێناوە و، نوێژیان ڕاگرتۆ و

زەکاتیان داوە و لە غەیری خواش ناترسن.»

جا با گوێی لێ بێ هەر کەس کە بانگەشەی ڕێبازی پێغەمبەرایەتی دەکات! هەڵەی وا نەکەی بە زمانە شکاوەکەی خۆت، بەرگی زەلیلی بەبەر ڕێبازی پێغەمبەرایەتیدا بکەیت! هەر سەرداری سەربەرزانە (ﷺ) کە فەرموویەتی:

"ئەرێ ئاگادار بن، یەکێک لە ئێوە ترسی خەڵک دەمی نەبەستێ لە وتنی حەقێک وەختێک کە زانی."(١)

سەرداری سەربەرزانە (ﷺ) کە فەرمانی کردووە بە نکۆڵیکردن لە خراپە و لادانی و، تێکۆشان دژ بە ناهەقرەوتان؛ بە دڵ و دەست و زمان. ئەوە فەرموویەتی ئیمانی نییە هەر کەس، لانی کەم ڕقی لە خراپە نەبێتەوە و پێی ناخۆش نەبێ. بەڵێ، ئەمانە گشت ڕێسا و ڕێکاری خۆیان هەیە، بەڵام بە شێوەیەک نا، دەقەکان بمرێنرێن و وەهمی ئەوە بسازێنرێ کە خوا (سبحانە) زەلیلی بۆ دۆستانی خۆی پێ قەبووڵە؛ بەشێوەیەک نا، پرەنسیپی (ڕسوایی، نەک مەرگ)ی پێ ببووژێنرێتەوە، بەبێ هەڵبژاردنی ڕێبازی سەلامەتی بەسەر سەلامەتیی ڕێبازدا، بێ ئەوەی ڕێگەی ئەو قسەیە بۆ دەمبەتاڵان خۆش بکەین کە بڵێن، "ئایینەکەی ئێمە خەڵک سڕ دەکات لە داواکردنی ماف و ململانێکردنی ستەمکاران"؛ بەشێوەیەک نا، وەها لە هەستی بوێری و پیاوەتیی موسڵمانان بدەین و بیکوژین، کە ئاوات بە غیرەت و پیاوەتیی ئەبوو طالیب و ئیبن عەدی بخوازرێ!

گەر نەفسنزمان و ورەڕووخاوان تێگەشتنێکیان هەبووایە، دەیانزانی کە چاونەترسی و هێزی دڵ، مافێکی پارێزراوی موسڵمانە. (الله) فەرموویەتی:

---

(١) [مسند أحمد: ١١٤٠٣]

﴿الَّذينَ آمَنوا وَلَم يَلبِسوا إيمانَهُم بِظُلمٍ أُولئِكَ لَهُمُ الأَمنُ وَهُم مُهتَدونَ﴾[الأنعام: ٨٢] «ئەوانەی باوەڕیان هێناوە و ستەمێکیان تێکەڵ بە باوەڕەکەیان نەکردووە؛ ئەوانەن بێترس و ئەرخەیان و، ئەوانن هیدایەتدراو.»

لە وەختێکدا تەنیا بەشی دووڕوو، سەرکزی و ترسنۆکی و سەرگەردانی و گومانە.

لەگەڵ هەموو ئەمەشدا، پێویستە وریاش بین لەوەی موسڵمانان بە ترسنۆکی و ورەڕووخاوی و قوربانینەدان وەسف بکەین و، بیانشکێنینەوە لەسەر ئەوەی بەرەنگاریی ستەم ناکەن. لەگەڵ ئەوەشدا کە لە پێشەکی باسەکەدا، هێندێک لەسەر سیفەتی "ڕقبوونەوە لە قوربانیدان لە ڕێگەی خوادا" دواین، بەڵام دیسان لێرەشدا دێینەوە سەر جەختکردن لەم هۆشیاریدانە.

لە چەندان پێشهاتدا ئەوە سەلماوە کە زۆرێک لە موسڵمانان کێشەی حەقیقییان، ترسنۆکی یان ئامادەنەبوون بۆ قوربانیدان، نییە، بەڵکوو نەبوونی بڕوایەکی تەواوە بەو شتەی قوربانی دەدەن لە پێناویدا و، نەبوونی ئامانجێکی ڕوونە بۆ قوربانیدان، یان ئەوەی چۆن دەکرێ قوربانیدانەکەی ئەوان ڕێگە ببڕێ بەرەو دۆخی خوازراو، هەروەها کەمیی پێشەنگی ڕاستاڵ و کردەیی و، کاریگەریی بەئازاری نموونەکانی ڕووبەڕووبوونەوە، کە چەوسانەوە و ستەم و دەسەڵاتی زیاتری بۆ خراپەکاران هێناوە و، هەستکردنی موسڵمان بە کەمیی دەروون و خواریی بەهای خۆی و، لاوازیی پاڵنان و لاوازیی هۆشیاریدان سەبارەت بەو بەها بەرزەی هەیەتی و لە ئایینەکەی خۆی وەریگرتووە.

ئەوەی موسڵمانان لە نموونەی ئەم دۆخەدا پێویستییانە، ئەو گوتارە هاندەرە گشتییە بێسەروبەرەیە نییە کە نە ئامانجەکان دەخاتە ڕوو، نە هەنگاوەکان؛ پاشانیش دەیانشکێنێتەوە لەسەر نەبوونی وەڵامێکی شایەن و، وەسفییان دەکات بە ترسنۆکی و دووڕوویی و لەسەر هەرچی کە پێیان دەکرێ و پێیان ناکرێ

لۆمەیان بکا و ئۆباڵیان بخاتە ئەستۆ، هێندی تر ڕووخان و خۆبەسووکبینینان بخاتە دڵ، یان زێدەتر بیانڕەتێنێ لە ئینتیما بۆ ئایین و ئوممەتیان، چونکە ئیتر ئەوان ئەم ئینیتمایە بە سەرچاوەیەکی ماندووکەری ئازاری دەروونی دەبینن، یاخود پاڵیان بنێت بۆ کۆمەڵێک ڕووبەڕووبوونەوە و کاردانەوە، کە تاکە خشتێکیش بۆ بونیادی ئیسلام زیاد ناکات و تەڵە درزێکی دوژمنیش ناشکێنێت؛ بگرە بۆ موسڵمان هەر لاوازی و شکان و، بۆ دوژمن هێز و داچەسپانی زیاتری پێیە.

ئێمە لە قۆناغێکداین کە هەر تاکە مرۆیەکی موسڵمانمان بۆ گرنگە، هەرچیش پێوەندیدارە پێوەی لە کات و سامان و هەوڵ، دەبێ ڕەزیلی پێ بکەین لە ئاست هەر بەفیڕۆدان و پەلەپەلکاری و هەڵەشەیی جوان دانەڕێژراو. بەڵام لە هەمان کاتیشدا، دەبێ حاڵەتی ڕەتکردنەوەی خراپە درێژە پێ بدەین، هەروا خۆجیاکردنەوە لە ئەهلی بەتاڵ و خۆبەرزگرتن لە هاوبەشیکردنیان لە بەتاڵ و ناهەقیکارییاندا، یاخود یارمەتیدانیان بە هەر شێوەیەک لە شێوەکانی یارمەتیدان. ئەوەش ڕوونە کە پاککردنەوەی بیروڕا و چەمک و بۆچوونە گشتییەکان، ئامانجێکی مەزن و بەندایەتییەکە شایەنی قوربانی بۆ دانە، هەروەها کۆششی بەردەوام بۆ ڕاگیرکردنی شەریعەتی (الله) لە سەرزەمیندا و ئامادەکاری بۆی لە سەرجەم کایە جیاوازەکاندا. درکی ئەوەش بکەین کە لەمەدا پێویستیمان بە ئارامگری و کۆڵنەدان و پشوودرێژی و چەسپان و وەسێتکردنی یەکتری بە حەق و دەستپێوەگرتنی هەیە.

جا وەختێک موسڵمانان لەم پێناوەدا تاقیکرانەوە، ئەوکات ئەم گوتارەی چاکسازان دێ بۆ یادهێنانەوەیان بە واتاکانی بڵندی و ڕەتکردنەوەی ستەم و ژینی سەرکزی. گومانیش وایە کە زۆرێکیان وەڵامیان بۆ ئەمە هەبێت، بۆ نا، وەختێک ئامانجەکان ڕوون بووبێتنەوە و باوەڕیان بۆ دروست بووبێ سەبارەت بە قوربانیدان لە ڕێگەیدا و، ببینن چاکسازان خۆیان دەستپێشخەری دەکەن

بۆ ئەوەی بانگەوازییان بۆ کردووە و، ببینن چاکسازان ورەیان بەرز دەکەنەوە و هەستی ڕێزگرتن لە خودیان بۆ بنیات دەنێن بەبۆنەی ئایینەکەیانەوە وەک موسڵمان. ئەمەشە ڕێگەی پێغەمبەر (ﷺ)، کە خوای گەورە کردییە مایەی ڕێنوێنی و شوێنکەوتنی بۆ هەر کەس خێر لە دڵیدا بوو، جگە لە بێباوەڕان و دووڕووانیش، کەس لە قافڵەکەی دوا نەکەوت. سا جێی خۆیەتی هەر چاکسازێک لەوە ڕابمێنێ بەر لەوەی بڕیار لەسەر خەڵک بدات کە ترسنۆکن یان دووڕوون و زەلیلییان پێ قەبووڵە، لە کاتێکدا دەشێ ئەسڵەن نەنگییەکە لە بانگەوازی ئەمدا بێت.

## ١٤) ڕووپامایی و کاسەلێسیکردن بۆ دەسەڵاتداران و داشکاندنی ئایین بۆیان

ئەم ڕەوشتە نزم و هەرزانە یەکەم شتێکە دێ بە زەینی خەڵکدا، کاتێک وشەی (دووڕوو) دەبیسترێت.

خەڵکێک بە ئیبن عومەریان گوت: "ئێمە دەچینە لای کاربەدەستمان و شتێک کە لەلای ئەو دەیڵێین جیاوازە لەوەی کاتێک لای ئەوان دێینە دەرەوە دەیڵێین"، فەرمووی: "ئێمە ئەوەمان بە دووڕوویی دەزانی".

دیسان لە ئیبن عومەرەوە، خەڵکی دەبینی دەچوونە ناو مزگەوت، فەرمووی: "ئەوانە لە کوێوە دەگەڕێنەوە؟" گوتیان: "لەلای میرەوە" فەرمووی: "کە خراپەیەک دەبینن، نکۆڵی دەکەن؟ کە چاکەیەک دەبینن، فرمانی پێ دەکەن؟" گوتیان: "نا" فەرمووی: "ئەی چی دەکەن لەوێ؟" گوتیان: "لەوێ ستایشی دەکەن و کاتێکیش دێنە دەرەوە جنێوی پێ دەدەن!" ئیبن عومەریش فەرمووی: "بەڕاستی ئێمە ئەوەمان بە دووڕوویی دەزانی لە دەورانی پێغەمبەردا (ﷺ)، تەنانەت کەمتر لەوەش!"

ئەمە لە ڕۆژانی ئیبن عومەردا، ڕۆژانێک کە کاربەدەستان دروشمەکانی ئایینیان بەرز ڕادەگرت و، بەگشتی پابەند و پشتگیر و خزمەتکاری بوون و کاریان پێ دەکرد و مەرجەعێکیان جگە لە ئیسلام نەبوو، جیهادیان بەرپا دەکرد لەپێناو پاراستنی ئیسلام و ئەهلەکەی و فرەوانکردنی دەسەڵاتی، تەنیا ئەوە بوو لە هەندێک ناوەندا ستەمکار بوون. ئیدی ئیبن عومەر گەر دووڕووانی ڕۆژگاری ئێمە ببینێ چۆن سەنا و ستایشی ئەمانەی لای ئێمە دەکەن و،

گەورەیان دەکەنەوە و بە شیعر و پەخشان پیایاندا هەڵدەدەن؟!

یەکێکیش نیفاقی لە دڵدا بێت، وادەزانێ کە لەسەر خێرە؛ مادەم کاتێک لەگەڵ هەندێک لە هاوەڵانی خۆیدایە نکۆڵی لە خراپە بکات، لە وەختێکدا لەولاشەوە لەبەردەم ئەهلی باتڵ و ناهەقیدا، خەریکی مەراییکردن و داشکاندنە و دووڕووییان لەگەڵ دەکات و دان بە باتڵەکەیاندا دەنێت. ئەمە لە کوێی ئەو فەرمایشتەی پێغەمبەردایە (ﷺ):

"خەڵک دەبیننەوە کانزاگەلێکن: باشترینیان لە نەفامیدا، باشترینیانە لە ئیسلامدا ئەگەر تێ بگەن. دەشبیننەوە باشترین خەڵکێک سەبارەت بەم کارە[کاربەدەستێتی ودەسەڵات]، ئەوەیانە کە زۆرترین ڕقی لێیەتی و حەزی پێی نییە. دەشبیننەوە خراپترین خەڵک کابرایەکی دوو ڕوخسارە، بە ڕوخسارێک دەچێتە لای ئەوانە و بە ڕوخسارێکی دی دەچێتە لای ئەوانی دیکە."[١]

جا وەک لە فەرموودەکەدا هاتووە، لەوانەیە ببینیت مرۆڤێک ئەوپەڕی دوژمنایەتیی سەختی ئیسلام دەکات، بەڵام جوامێری و ڕەسەنایەتی تێدایە و ناتوانێ زۆر لەسەر دژیەکیکردنی بڕواکانی خۆی بەرگە بگرێت. هەر لەم ڕەسەنانە، عومەری کوڕی خەطاب، خالیدی کوڕی وەلید، عەمری کوڕی عاص، عیکریمەی کوڕی ئەبی جەهل و سوهەیلی کوڕی عەمر خوا لێیان ڕازی بێ، ئەوانەی کاتێک کە هاتنە ناو ئیسلامەوە دڵسۆزی بوون و، خۆشەویستییەکی توند و بێپایانیان بۆی هەبوو، بە باشترین تێکۆشانێکیش لە ڕێگەی پەروەردگاردا تێکۆشان.

بەڵام دووڕوو؛ ڕەنگاوڕەنگ و دوو ڕوخسارە. لە بەردەم هەر خەڵکێکدا بەو جۆرە قسە دەکات کە پێی ڕازین و، وای پیشان بدات ئەویش لەوانە، بۆ ئەوەی خۆی لە شەڕیان لابدات و ڕەزامەندی و قازانجیان وەگیر خات. نموونەی

---

(١) [صحيح البخاري: ٣٤٩٣]

ئەمانە، پیس و نارەسەنن، بگرە پێغەمبەرمان ( ﷺ ) وایان وەسف دەکات کە "خراپترینی خەڵک"ن.

## باوەڕدار مەرایی و داشکاندن بۆ کەس ناکات:

تیرمیذی گێڕاویتیەوە کە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) فەرموویەتی:

"ببیستن! ئایا بیستووتانە؟ کە پاشی من کاربەدەستانێک دەبن، جا هەر کەس بچێتە لایان و درۆیان بۆ بەڕاست بخاتەوە و لە ستەمیاندا پشتگیریان بێ، نە ئەو لە منە، نە من لە ئەوم و، نە دێتە سەر حەوز بۆ لام. هەر کەسیش نەچێتە لایان و یارمەتییان نەدا لە ستەمیاندا و درۆیان بۆ بەڕاست نەخاتەوە، ئەوا ئەو لە منە و من لە ئەوم و، ئەوە کە دێتە سەر حەوز بۆ لام."[1]

کاتێکیش پیاوێک پرسیاری لێ کرد، "کام جیهاد باشترینە" وای وەڵام دایەوە ( ﷺ ): "قسەیەکی حەق، لەلای دەسەڵاتدارێکی ستەمکاردا."[2]

لەگەڵ ئەمەشدا، دەشێ موسڵمان خۆی لە خراپەکارێک بپارێزێ بە جۆرێک قسەی نەرم، کە نە شەرعاندنی بۆ باتڵ تێدا بێ و، نە دانپێدانانی و نە شێواندنی حەق لای خەڵک و ڕووسپیکردنەوەی ئەم خراپەکارە لەلایان. بوخاری و موسلیم لە دایکی باوەڕداران عائیشەوە خوا لێی ڕازی بێ، گێڕاویانەتەوە: "پیاوێک مۆڵەتی وەرگرت بێتە لای پێغەمبەر ( ﷺ )، ئەویش فەرمووی: 'مۆڵەتی بدەن خراپترین برای هۆزە، یان کوڕی هۆزە' کەچی کاتێک هاتە ژوورەوە قسەی نەرمی لەگەڵدا کرد، گوتم: 'ئەی پێغەمبەری خوا، لە پێشدا ئەوەت گوت، پاشانیش قسەی نەرمت لەگەڵدا کرد؟' فەرمووی:

---

(١) [الترمذي: ٢٢٥٩].

(٢) [النسائي: ٤٢٠٩].

'ئەی عائیشە، بەڕاستی خراپترینی خەڵک ئەوانەن کە خەڵک وازیان لێ دێنێ، لە ترسی خراپە و ئاشووبیان'."[١] "جا پێغەمبەر (ﷺ) هیچ قسەیەکی باتڵی لەگەڵ ئەم پیاوەدا نەکرد کە هات بۆ لای، نە وەسفی دا، نە پیایدا هەڵدا، نە بەشداریشی کرد لە ڕەوشتێکی ناشیرینیدا و، نە پشتگیریی کرد لە هیچ ڕێڕەوێکیدا، بەڵام بە ڕووگەشی و کراوەیی لەگەڵیدا هەڵیکرد - کە ڕەوشتی نازداری بەردەوامی بوو (ﷺ) -، بەشکوو کار لە دڵی بکا گەر پاش ئەوە ئامۆژگاری و یادهێنانەوەیەکی ئەوی بیست و پێ گەیشت، سا لەو دووڕوویی و ڕەوشت ناشیرینییە ڕزگاری بکات".

بەمەش جیاوازیی گەورەی نێوان ئیدارەدانی شەرعی، لەگەڵ مەرایی و کاسەلێسی و دووڕوویی دەردەکەوێت، کە ئەمانی دی، سیفەتی دووڕووانن.

---

(١) [البخاري: ٦٠٥٤، مسلم: ٢٥٩١]

# ١٥- بێئەدەبی بەرانبەر بە خوای گەورە و بەرانبەر بە پێغەمبەرەکەی (ﷺ)

ئەوانن مەبەست بەو فەرمایشتەی پەروەردگار:

﴿قُل أَبِاللَّهِ وَآياتِهِ وَرَسولِهِ كُنتُم تَستَهزِئونَ﴾ [التوبە: ٦٥] «بڵێ ئەرێ بە خوا و ئایەتەکانی و پێغەمبەرەکەی گاڵتە دەکەن؟!»

هەر ئەوانیشن کە خوای لێیانی دەگێڕێتەوە کە وتوویانە:

﴿يَقولونَ لَئِن رَجَعنا إِلَى المَدينَةِ لَيُخرِجَنَّ الأَعَزُّ مِنهَا الأَذَلَّ﴾ [المنافقون: ٨] «دەڵێن: "سوێند بێ گەر بگەڕێینەوە مەدینە، بڵندترین و بەهێزترین، لاوازترین و نزمترین لەوێ وەدەردەنێت."[١]»

هەر ئەوانیش بوون بە نهێنی و چرپەچرپی ناو خۆیان کوفریان دەگوت و دەکرد، کەچی پاشانیش: ﴿يَحلِفونَ بِاللَّهِ ما قالوا وَلَقَد قالوا كَلِمَةَ الكُفرِ وَكَفَروا بَعدَ إِسلامِهِم﴾ [التوبە: ٧٤] «سوێند بە (الله) دەخۆن کە نەیانگوتووە، بەڕاستیش قسەی کوفریان گوتووە و لەپاش موسڵمانێتییان کافر بوونەتەوە.»

ئیبن جەریر و ئیبن ئەبی حاتیم و ئیبن کەثیر، بە چەندان سەنەد گێڕانەوەی هاوشێوە و لێک نزیکیان سەبارەت بە هۆی دابەزینی هێناوە. یەک لەوانە: "پێغەمبەر (ﷺ) وتاری دەدا، پیاوێک لە دووڕووان گوتی: 'ئەگەر ڕاستگۆ بێ، ئێمە لە گوێدرێژ کەمترین' زەیدی کوڕی ئەرقەمیش خوا لێی ڕازی بێ، پێی گوت: 'دەی سوێند بە (الله) بەڵێ، ئەو ڕاستگۆیە و تۆش لە کەر کەمتری'. پاشان ئەمەی گەیاندە پێغەمبەری خوا (ﷺ) و کابرای دووڕوو نکۆڵی لێ

---

(١) مەبەستیان پێغەمبەر (ﷺ) و کۆچەرانە.

کرد، پەروەردگاریش ئەو ئایەتەی بۆ بەڕاستخستنەوەی زمید دابەزاند."

هەر کەسیش لەم ڕۆژگارەی ئێمەدا لە سیفەتی دووڕووان گلابێ، دەبینی مەزنڕاگرتنی بۆ پەروەردگار و ئایەتەکانی و پێغەمبەرەکەی (ﷺ)، کەمە. تەنانەت لەوانەشە بۆ خۆشی نوکتەگەلێک بۆ خەڵک باس بکات، تەنیا بۆ پێکەنین، تیایدا دەڵێ خوا وای بە جبریل وت و جبریل وای بە خوا وت، بۆ خۆشی و پێکەنین! یان ئایەتەکانی قورئان لە غەیری جێگەی خۆیاندا بەکاردێنێ، دیسان بۆ پێکەناندنی خەڵک. ئای چەندێک بەمە نزیک بۆتەوە لەو وەسفەی پەروەردگار کە دەفەرمووێت:

﴿وَإِذَا عَلِمَ مِنْ آيَاتِنَا شَيْئًا اتَّخَذَهَا هُزُوًا﴾ [الجاثية: ٩] «وەختی بە شتێک لە ئایەتەکانی ئێمەش بزانێ، دەیکاتە مایەی مەسخەرە و گاڵتەوگەپ.»

جا تەنیا کەمێکی لە قورئان لەبەرە، ئەوەشی لەبەریەتی، دەبینی یەکەم شت؛ بۆ دروستکردنی کەشی خۆش و پێکەنین و بەدەرخستنی ئێسکسووکی خۆی بەکاری دێنێ!

دەشێت گاڵتە بە سوننەتێک لە سوننەتەکانی پێغەمبەر (ﷺ) بکات، یان بەوانەی کە کاری پێ دەکەن، لە کاتێکدا خودی خۆشی کەمتەرخەمە تێیدا، وەک ڕیش و سیواک. چەندێک لە خەڵکیش هەن سەرجەم ئەمانە دەکەن، لە کاتێکدا بەڕۆژووش دەبن و نوێژیش دەکەن و خۆشیان بە موسڵمان دەزانن!

واش نازانم هیچێک هێندی ئەمە نموونەی ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەر (ﷺ) بێ:

**"بەڕاستی بەندە یەک قسەیەک دەکات لە تووڕەیی خوادا، کە هیچ بایەخێکیشی پێ نادا، تەنیا بەوە دەیهاوێتە دۆزەخەوە."[١]**

---

(١) [البخاري: ٦٤٧٨]

لەویش بەدتر، ئەوەی زیاد لە سیفەتەکانی دووڕووانیش بڕوات و ئاشکرا جنێو بە خوا یان بە دین بدات، ئەمانەش زۆریان لەسەر نارۆم لێرەدا، بۆ ئەوەی وا نەزانرێت لە دووڕووانن، بەڵکوو بەو جنێوانەیان، کوفری ڕاشکاویان هەیە. لە شەریعەتیشدا مامەڵەی دووڕووانیان لەگەڵدا ناکرێ، سوودیشی بۆیان نییە کە بانگەشەی موسڵمانێتی بکەن، یان بڵێن لەبەر تووڕەیی وامان کرد و وامان تووش دێ. تەنیا تەوبەی یەکلا و ببڕایبڕ و نەصووح بە هاتنەجێی سەرجم مەرجەکانییەوە، دادیان دەدات. خۆ گەر تەوبەش نەکەن، لە بێباوەڕانی مەککە خراپترن کە بانگەشەی ئەوەیان دەکرد بتەکانیان لە خوایان نزیک دەکاتەوە، هەرگیزیش جنێوشیان بە خوا نەدەدا، بەڵام تەنیا بۆیە ئاماژەم بەم چینە کرد کە بڵێم، زۆرێک هەن لەم خەڵکە بۆگەنە سووک و چرووکانە کە هێشتا بەناهەق خۆیان داوەتە پاڵ ئوممەتی ئیسلام. بنەمای ئەم دیاردەیەش کە لێوەی دەرهاتووە و بەم قۆناغ و حاڵە گەیشتۆ، کەم و لاواز مەزنڕاگرییە بۆ سنوورەکانی خوای گەورە (سبحانە وتعالی).

## باوەڕدار مەزنڕاگریی هەیە بۆ پەروەردگاری:

پەروەردگار دەفەرمووێت:

﴿ذٰلِكَ وَمَن يُعَظِّم شَعائِرَ اللَّهِ فَإِنَّها مِن تَقوَى القُلوبِ﴾ [الحج: ٣٢] «ئەوە و هەر کەسیش مەزنڕاگریی بۆ درووشمەکانی (الله) هەبێت، ئەوە لە خواناسی و لەخواترسیی دڵانەوەیە.»

هەروا فەرموویەتی:

﴿ذٰلِكَ وَمَن يُعَظِّم حُرُماتِ اللَّهِ فَهُوَ خَيرٌ لَهُ عِندَ رَبِّهِ﴾ [الحج: ٣٠] «ئەوە و هەر کەسیش مەزنڕاگریی بۆ سنوور و حەرەمەکانی (الله) هەبێ، ئەوە بۆی باشترە لەلای پەروەردگاری.»

هەروەها (الله) لە مەزنڕاگری و ڕێزلێنانی پێغەمبەرەکەیدا (ﷺ) فەرموویەتی: ﴿إِنَّا أَرْسَلْنَاكَ شَاهِدًا وَمُبَشِّرًا وَنَذِيرًا ۝ لِتُؤْمِنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ وَتُعَزِّرُوهُ وَتُوَقِّرُوهُ وَتُسَبِّحُوهُ بُكْرَةً وَأَصِيلًا﴾ [الفتح: ٨ - ٩]

«بەڕاستی ئێمە تۆمان بە شاهێد و مژدەدەر و ترسێنەر ناردوۆ (٨) تاكوو باوەڕ بهێنن بە خوا و پێغەمبەرەكەی و مەزنی ڕابگرن و سەنگینی ڕابگرن و پاكی ڕابگرن و تەسبیحاتی بكەن سپێدان و ئێواران»

خۆ گەر یەكێک لە ئێمە وەختێک لەم دونیایە دەردەچێ، جگە لە مەزنڕاگرییەكی ڕاستاڵانە بۆ الله هیچی دیكەی لەگەڵ خۆیدا نەبردبێ، ئومێدی خێر و سەلامەتی و بردنەوەی لای خوای حەقدا بۆ هەیە، وەک لە فەرموودەكەی هاوكۆكی بوخاری و موسلیمدا هاتووە سەبارەت بەو پیاوەی داوای لە منداڵەكانی كرد بیسووتێنن و خۆڵەمێشەكەی بدەن بەدەم باوە. وەختێكیش پەروەردگار گلێری كردەوە و پێكی هێنایەوە و لێی پرسی: «بۆ وات كرد؟» گوتی: "لە ترسی تۆ، خۆشت باشتر دەزانی"، پەروەردگاریش لێی خۆش بوو.[1]

---

(١) [البخاري: ٧٥٠٦ مسلم: ٢٧٥٦]

## ١٦) ڕقبوونەوە لە باوەڕداران و ناوزڕاندنیان

وەک چۆن باوەڕدار ڕقی لە بێباوەڕی و لەڕێدەرچوون و سەرپێچییە، دووڕووش بە دیتنی ڕەفتاربەرزی و پاکی و چەسپانی ڕێی ڕاست، ڕقی هەڵدەستێ، چونکە ئەوانە سیفەتگەلێکن دەبنە ڕێگر لەوەی کۆمەڵگە ببێتە ماڵی تالانی و لەوەڕی ئازادیی تەماع و، ئارەزووە چڵێس و پیسەکانی ئەو. لێرەوەیە کە دووڕوو ڕقی لەو بانگخواز و چاکسازانەیە کە بانگی خەڵک دەکەن بۆ ئەم بەهایانە.

پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێ:

**"پشتیوانان جگە لە باوەڕدار، کەس خۆشی ناوێن و جگە لە دووڕووش، کەس ڕقی لێیان نییە؛ سا هەر کەس خۆشی بوێن، خوا خۆشی دەوێ و هەر کەسیش ڕقی لێیان بێ، خوا ڕقی لێیەتی."**[1]

فەرمووشیەتی:

**"نیشانەی ئیمان، خۆشویستنی پشتیوانانە و نیشانەی دووڕوویش، ڕقبوونە لە پشتیوانان."**[2]

بە هەمان شێوە، هەر کەس تانە لە چینی هاوەڵان بدا بەناوی سەرخستنی ئالوبەیتەوە، ئەوە کەوتۆتە ئەم سیفەتە نیفاقییەوە.

هەر بۆیە دەبینی دووڕوو زۆر لێنەبڕاوانە کار دەکات بۆ بڵاوەپێکردنی

---

(١) [البخاري: ٣٧٨٣]

(٢) [البخاري: ١٧]

خەڵک لە دەوری باوەڕداران و ڕەتاندنیان لێیان:

- جارێک بەوەی خەڵک لە بەرژەوەندیگەلێکی دونیایی بێبەش بکەن، گەر بێتو ڕوو لە بانگخوازان بکەن و کاریگەر بن بە بانگەوازییەکەیان:

﴿هُمُ الَّذِينَ يَقولونَ لا تُنفِقوا عَلى مَن عِندَ رَسولِ اللَّهِ حَتّى يَنفَضّوا وَلِلَّهِ خَزائِنُ السَّماواتِ وَالأَرضِ وَلٰكِنَّ المُنافِقينَ لا يَفقَهونَ﴾ [المنافقون: ٧]

«ئەوانن کە دەڵێن مەبەخشن بەوانەی لە دەوری پێغەمبەری خوان با بڵاوەی لێ بکەن، خۆ گەنجینەکانی ئاسمانەکان و زەوی هی خوایە، بەڵام دووڕووان تێناگەن.»

- جارێکیش بە دروستکردنی گومان لەسەر نییەتی باوەڕداران. وەک لە فەرمووده هاوکۆکەکەی بوخاری و موسلیمدا هاتووە لە ئەبی مەسعوودەوە: "کاتێک ئایەتی بەخشین دابەزی حەماڵیمان دەکرد -واتە بە پشت بارمان بەکرێ بۆ خەڵک هەڵدەگرت، تاکوو شتێکمان بکەوێتە دەست کە بیبەخشین-، جا پیاوێک هات و بەخشینێکی گەورەی دانا. ئەوانیش(واتە دووڕووان) گوتیان: 'ڕیابازە'. پیاوێکیش هات مەنێک بەخشینی دانا، ئەمجار گوتیان: 'برا خۆ خوا پێویستی بە مەنە خێری ئەمە نییە'. جا ئەوە دابەزی:

﴿الَّذينَ يَلمِزونَ المُطَّوِّعينَ مِنَ المُؤمِنينَ فِي الصَّدَقاتِ وَالَّذينَ لا يَجِدونَ إِلّا جُهدَهُم فَيَسخَرونَ مِنهُم سَخِرَ اللَّهُ مِنهُم وَلَهُم عَذابٌ أَليمٌ﴾ [التوبه: ٧٩] «ئەوانەی کە عەیب دەگرن لە خێرکەرانی باوەڕداران و لەوانەشی کە تەنیا توانای خۆیان لەدەست دایە [بەپێی توانای کەمی خۆیان خێر دەکەن]، جا گاڵتەیان پێ دەکەن، خوا گاڵتەی بەوان کردووە و سزایەکی بەئێشیشیان بۆ هەیە.»[1]

---

(١) [البخاري: ١٤١٥]

✿ جارێکی دیش بە گاڵتەکردن بە باوەڕداران و وەسفکردنیان بە سیفەتگەلێک کە شایەنترینی خەڵک پێی، دووڕووان خۆیانن. وەک لە غەزای تەبووکدا وایان کرد. لەوەدا کە تەفسیرەکان گێڕاویانەتەوە لە عبداللهی کوڕی عومەرەوە کە پیاوێک لە غەزای تەبووکدا گوتی: "نەمدیوە هێندی ئەم قورئانخوێنانەی خۆمان زگبرسی و زمانبەدرۆ و ترسنۆک لە وەختی ڕووبەڕووبوونەوەدا" پیاوێکیش گوتی: "درۆت کرد! بەڵام ئەوە تۆ دووڕوویت. سوێند بێت هەواڵی ئەمە بە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەدەم".جا ئەمە گەشتە پێغەمبەری خوا (ﷺ) و قورئان دابەزی. ئەوجا کابرای گاڵتەکەر خۆی هەڵواسیبوو بە پشتبەستی وشترەکەی پێغەمبەرەوە (ﷺ) و خەڵک بەردیان پێوە دەنا و ئەویش دەیگوت: "ئەی پێغەمبەری خوا، ئێمە تەنیا گاڵتەوگەپمان بوو". جا سەرنج بدە چۆن ئەم کابرای گاڵتەکەرە وەسفی کۆچەرانی بە سیفەتگەلێک کرد، کە ئەوان دوورترین و پاکترینن لێی، بگرە سیفەتی مونافیقان خۆیانە، لە درۆکردن و ترسنۆکی و چاوبرسێتی بۆ دونیا و زگپڕکردن. سەرنجی بەهانەکەشی بدە: "ئێمە تەنیا گاڵتەوگەپمان بوو"، واتە: ئەم قسەیەشم هەر وا بۆ خۆشی و ڕابواردن کرد!

سا ئەو ئایەتە کامە بوو دابەزی؟

﴿وَلَئِن سَأَلتَهُم لَيَقولُنَّ إِنَّما كُنّا نَخوضُ وَنَلعَبُ قُل أَبِاللَّهِ وَآياتِهِ وَرَسولِهِ كُنتُم تَستَهزِئونَ﴾ [التوبە: ٦٥] «ئەگەریش لێیان بپرسی، دەڵێن ئێمە تەنیا گاڵتەوگەپمان بوو، بڵێ: "ئەرێ ئێوە بە (الله) و بە ئایەتەکانی و پێغەمبەرەکەی گاڵتەتان دەکرد؟"»

لە کاتێکدا کابرا تەنیا گاڵتەی بە هاوەڵە کۆچەرەکان کردبوو، بەڵام چونکە لە ڕقی ئایینەکەیان گاڵتەی پێ کردن، وا پەروەردگار ئەمەی بەوە دانا کە گاڵتەکردن بووە بە (الله) و ئایەتەکانی و پێغەمبەرەکەی، بە فەرمایشتی پاشتریش، حوکمی خۆی بەسەریاندا دا:

﴿لا تَعتَذِروا قَد كَفَرتُم بَعدَ إيمانِكُم﴾ [التوبە: ٦٦] «بەهانە مەهێننەوە، تازە ئێوە پاش ئیمانتان کافر بوونەوە.»

ئیسلام لێ ناگەڕێ شوێنکەوتووانی هەر وا بێدەنگ بن و ساویلکە و داماو، مونافیقان و شێوە مونافیقان گاڵتەیان پێ بکەن بە ناوی بیانووی پڕوپووچەوە، لە وەختێکدا هەموو ئەوە، تەنیا پاڵنەری ڕقبوون لە خوا و لە دین لەپشتییەوەیەتی. ئەمجار درۆکردن بەدەم باوەڕدارانەوە و بوختانهەڵبەستن بۆ شکاندنی شکۆیان، وێنەی ئەوەی کردیان، کاتێک تانەیان دا لە دایکی باوەڕداران عائیشە خوا لێی ڕازی بێ، بۆ ئەوەی شکۆی پێغەمبەریشی (ﷺ) پێ لەکەدار بکەن و خەڵکی لەدەور بڕەتێنن:

﴿إِنَّ الَّذينَ جاءوا بِالإِفكِ عُصبَةٌ مِنكُم لا تَحسَبوهُ شَرًّا لَكُم بَل هُوَ خَيرٌ لَكُم لِكُلِّ امرِئٍ مِنهُم مَا اكتَسَبَ مِنَ الإِثمِ وَالَّذي تَوَلّى كِبرَهُ مِنهُم لَهُ عَذابٌ عَظيمٌ﴾ [النور: ١١] «بەڕاستی ئەوانەی بوهتانەکەیان سازاند لە ئێوە، وامەزانن شەڕی پێوەیە بۆتان، بەڵکوو ئەوە خێرە بۆتان. بۆ هەر یەکێکیان ئەوەی کردوویەتی لە تاوان بەشیەتی و، ئەوەشی پشکە گەورەکەی بەدەستەوە بوو لەوان، سزایەکی مەزنی بۆ هەیە.» کە عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی بوو، گەورەی دووڕووان.

"جا کاتێک دوژمن دەستەوەستان دەبێ لە ڕووبەڕووبوونەوەی ڕاستەوخۆ، دەست دەبا بۆ سازاندنی دەنگۆ و قسە و قسەلۆک و، ڕەواجپێدان و بڵاوکردنەوەی، بۆ ئەوەی بتوانێ لەڕێگەی ئەوەوە زەبرێکی دەروونی لە کۆمەڵگە بدات و، هەروەها ڕای گشتی پەرتوبڵاو بکا و بیشڵەژێنێ و سەرقاڵی بکا بە شتی پووچ و، لە کەیسە گرنگ و چارەنووسییەکان لای بدات. چەکی دەنگۆکان، گەلێک چەکێکی مەترسیدار و وێرانکەرە، کە دەشێت بەکاربهێنرێ بۆ شێواندنی ناوبانگی تاکە چاک و چاکسازەکان و، دوورخستنەوەی خەڵک لێیان".

وا دیارە زۆرێکیش لەم کارانەی دووڕووان، بەرهەمی ئیرەییبردنیانە بە

باوەڕداران. کاتێک دەبینن دڵیان ئارامە و هەنگاویان چەسپاوە و، بە تێپەڕینی کاتیش لە وادەی خوا نزیکتر دەبنەوە کە بەهەشتە و لەلای دووڕووان هێشتا ئەگەرێک بۆ ڕاستگەڕانی هەیە!

ئیتر چۆن ناتەقن کە ببینن باوەڕداران لەوان بەرزترن، چۆن ئاوات ناخوازن ئەمانیش وەک وان کافر بوونایە، بۆ ئەوەی هەمان چارنووسی نادیاریان هەبێ کە بۆ خۆیانیان داناوە:

﴿وَدّوا لَو تَكفُرونَ كَما كَفَروا فَتَكونونَ سَواءً﴾ [النساء: ٨٩] «پێیان خۆشە گەر ئێوەش کافر بن وەکچۆن ئەوان کافر بوون و، ئیدی یەکسان ببنەوە.»

هێشتا لەم ڕۆژگارەی خۆشماندا دووڕووان ناوبانگی بانگخوازان و چاکسازان و بەرگریکارانی ئایینەکەی خوا لەکەدار دەکەن و دەشێوێنن. ئەمانیش خۆ ناتوانن بەرگری لە خۆیان بکەن، چونکە دەزگای ڕاگەیاندنیان بەدەست نییە. سا شایەن بە هەموو موسڵمانێکی ژێر ئەوەیە گوێڕایەڵی ئەو فەرمایشتەی پەروەردگار بێ:

﴿لَولا إِذ سَمِعتُموهُ ظَنَّ المُؤمِنونَ وَالمُؤمِناتُ بِأَنفُسِهِم خَيرًا وَقالوا هذا إِفكٌ مُبينٌ﴾ [النور: ١٢] «دەی با وەختێک بیستتان، باوەڕدارانی ژن و پیاو گومانی باشیان بە خۆیان ببردایە و بیانگوتایە ئەمە بوختانێکی ئاشکرایە.»

هەروا ئەو فەرمایشتەی دی:

﴿يا أَيُّهَا الَّذينَ آمَنوا إِن جاءَكُم فاسِقٌ بِنَبَإٍ فَتَبَيَّنوا أَن تُصيبوا قَومًا بِجَهالَةٍ فَتُصبِحوا عَلى ما فَعَلتُم نادِمينَ﴾ [الحجرات: ٦] «ئەی ئەوانەی باوەڕیان هێناوە، ئەگەر لەڕێدەرچوویەک هەواڵێکی گرنگی بۆ هێنان، لێ بکۆڵنەوە؛ نەوەکا زیان بە خەڵکێک بگەیەنن بەنەزانی و ئیدی لەوەودوا پەشیمان ببنەوە لەسەر ئەوەی کردووتانە.»

# ١٧- گەڕان لەدووی فیتنە

دووڕووان هەمان ڕێگەی فیرعەونیان بەکار هێنا، لە بانگەشەکردنی ئەوەدا کە چاکسازان بەشوێن فیتنە و خراپەنانەوەوەن، وەختێک فیرعەون لەبارەی موسای پێغەمبەری خوا (علیه السلام) وتی:

﴿إِنِّي أَخافُ أَن يُبَدِّلَ دينَكُم أَو أَن يُظهِرَ فِي الأَرضِ الفَسادَ﴾ [غافر: ٢٦] «بەڕاستی من دەترسم ئایینەکەتان بگۆڕێ، یان خراپە لە سەرزەویدا بەرپا بکات.»

لە کاتێکدا ڕاستی ئەوەیە، دووڕووان خۆیانن ئەهلی فیتنە و خراپەنانەوە:

﴿وَإِذا قيلَ لَهُم لا تُفسِدوا فِي الأَرضِ قالوا إِنَّما نَحنُ مُصلِحونَ ﴿١١﴾ أَلا إِنَّهُم هُمُ المُفسِدونَ وَلٰكِن لا يَشعُرونَ﴾[البقرة: ١١-١٢] «کاتێکیش پێیان بگوترێ خراپە مەنێنەوە لە سەرزەویدا، دەڵێن: بەڕاستی ئێمە تەنیا چاکسازین (١١) ئەرێ بەڕاستی ئەوانن خراپەنێرەوە، بەڵام هەست ناکەن.»

دەیانەوێ موسڵمانان لاواز بکەن و ورەیان بڕووخێنن، تاکوو شکست بهێنن و هێز و پێگەیان نەمێنێ:

﴿لَو خَرَجوا فيكُم ما زادوكُم إِلّا خَبالًا وَلَأَوضَعوا خِلالَكُم يَبغونَكُمُ الفِتنَةَ﴾ [التوبه: ٤٧] «ئەگەریش دەرچوونایە تیاتاندا، جگە لە پۆخڵەیی و گێرەوکێشە، هیچی دیان بۆتان زیاد نەدەکرد و نێوانتانیان دەشێواند. ئاشووبیان بۆتان دەوێ.»

گرفت ئەوەیە هەندێکیشیان زمانپاراون: ﴿وَإِن يَقولوا تَسمَع لِقَولِهِم﴾[المنافقون: ٤] «ئەگەریش بێنە قسە و بلێن، گوێیان بۆ دەگری»، جا کۆمەڵگەی ئیسلامی

کارىگەر دەبێ پێیان: ﴿وَفِيكُم سَمّاعونَ لَهُم﴾ [التوبه: ٤٧] «تیاشتاندا هەن کە زۆر گوێ بۆ ئەوان دەگرن.»، لێدوانێکی جوانە، بگرە تەنانەت شێوەشیان جوانە. لەو فەرموودەیەدا کە بوخاری و موسلیم گێڕاویانەتەوە لە زەیدی کوڕی ئەرقەمەوە خوا لێی ڕازی بێ، فەرموویەتی: "پیاوانێک بوون، جوانترینێک"[١]، بەڵێ، ئاوها بوو شێوەیان، بەڵام کانزایان کانزای بەد و پیس بوو!

**دووڕووان سوورن لەسەر ئەوەی شەرعییەت و ڕەوایی بدەن بە ئاشووبگێڕیی خۆیان، لەڕێگەی ئەنجامدانی هەندێک کاری باش و بەکارهێنانی خەڵکی باشەوە!:**

ئەمەش تەکنیکێکی زۆر مەترسیدار و بڵاوە لەم سەردەمەی خۆماندا، کە دەبێ ئاگاداری بین و ئەوپەڕی لێی وریا بین.

جا دووڕووان کارگەلێک دەکەن کە بە ڕواڵەت چاکە و خزمەتکردنی ئایینە، بەڵام ئامانجیان لێی تەنیا پەرتکردنی باوەڕدارانە:

﴿وَالَّذينَ اتَّخَذوا مَسجِدًا ضِرارًا وَكُفرًا وَتَفريقًا بَينَ المُؤمِنينَ وَإِرصادًا لِمَن حارَبَ اللَّهَ وَرَسولَهُ مِن قَبلُ وَلَيَحلِفُنَّ إِن أَرَدنا إِلَّا الحُسنى وَاللَّهُ يَشهَدُ إِنَّهُم لَكاذِبونَ﴾ [التوبه: ١٠٧] «ئەوانەشی کە مزگەوتێکیان بۆ زیانگەیاندن و بێباوەڕی و پەرتکردن لەنێوان باوەڕداران و، لە بۆسە و چاوەڕوانیکردنی ئەوانەدا بنیاتنا کە پێشووتر جەنگی خوا و پێغەمبەرەکەیان کردووە، سوێندیش دەخۆن کە جگە لە باشترین هیچمان نەویستووە، خواش شاهێدە ئەوانە درۆ دەکەن.»

ئەوان مزگەوتێکیان درووست کرد، بەڵام تەنیا بە نیازێکی چەپەڵەوە: زەرەردان و بێباوەڕی و دووبەرەکینانەوە و، چاوەڕوانی و بۆسە و پاڵپشتی بۆ دوژمنانی

---

(١) [البخاري: ٤٩٠٧، مسلم:٢٧٧٢]

دیکەی ئیسلام! بۆ ئەوەی ڕیزی باوەڕداران پەرت کەن و لەو مزگەوتەکەیاندا کۆ ببنەوە بۆ پیلانگێڕان لە موسڵمانان!

پاشانیش چییان کرد بۆ ئەوەی شەرعییەت بەم مزگەوتەیان بدەن؟

ئیبن کەثیر لە ڕاڤەی ئەم ئایەتەدا دەفەرمووێ: "هەروەها هاتن و داوایان لە پێغەمبەر (ﷺ) کرد کە بچێت و لەو مزگەوتەیاندا نوێژ بکات، بۆ ئەوەی نوێژکردنی ئەو لەوێ بکەنە بەڵگە لەسەر چەسپاندن و جێگربوونی"، واتە بۆ ئەوەی شەرعییەت بدەن بەم مزگەوتەی کە هەرگیز بە نیازی خێر بنیاتیان نەنابوو.

بەڵام پەروەردگار پەردەی لەسەر هەڵماڵین لای پێغەمبەرەکەی (ﷺ)، نەک هەر نوێژی نەکرد تیایدا، بەڵکوو ڕووخاندیشی.

لەم ڕۆژانەشماندا پڕۆژەگەلی پیس و نابووت دەبینین کە کۆمەڵێک ڕێکخراوی نێودەوڵەتی دەیگرنە خۆیان، تەنیا هەوڵی ڕووخاندنی خێزان و نانەوەی دوژمنایەتییە لەنێوان ژن و مێردا و خراپکردنی ڕۆڵەکانە، تێکەڵ بەم ئەجێندا و هەوڵانەشیان، هێندێک کاری "خێرخوازیش" دەکەن و ئاگاشیان لەوەیە کە دەبێ فەرمانبەرەکانیان کەسانی موسڵمان بن و سیمای پیاوباشی و ڕواڵەتی ئیسلامییان پێوە بێ، فەرمانبەری نوێژکەر و ژنەفەرمانبەری باڵاپۆش. هەموو ئەمەش شەرعییەت دەداتە ئەم دامەزراوانە و پڕۆژەکانیان و، وا دەکات گومانی باشیان پێ ببرێ و خەڵک لەوە سارد دەکاتەوە بەربەرچی ئەو فیتنە و ئاشووبانە بدەنەوە کە ئەمان بڵاوی دەکەنەوە. دەشبینی ئەم فەرمانبەرانە بەهانەی ئەوە بۆ خۆیان دەهێننەوە کە ئێمە لێرە تا لە تواناماندا بێ خراپە لادەدەین و، لە ڕێگەی ئەم دامەزراوانەوە دەبینە هۆی زۆرێک لە چاکە و یارمەتی بۆ کۆمەڵگەکانمان. بەڵام لە ڕاستیدا ئەوان تەنیا ئامرازن بەدەست ئەم ڕێکخراوە دووڕووانەوە، بۆ بڵاوکردنەوەی فیتنە و خراپەی خۆیان و وێرانکردنی کۆمەڵگە موسڵمانەکان و سڕینەوەی ئایین و ئاکار و فیترەتیان. دیسان هەر لەم ڕۆژانەی خۆماندا،

کۆمەڵێک کەناڵی هەرچیوپەرچی هەن کە جگە لە فیتنە، مەرامێکی دیکەیان نییە. دەبینی میوانداریی بانگخوازێک دەکەن و قسانێک دەکا، دڵ نەرم بکاتەوە و چاو بخاتە فرمێسک، بەڵام پێش و پاشی بەرنامەکەی ئەو، هەمووی ڕیکلامی خراپ و لادەر و هەواڵی درۆ و نابەجێیە. هەندێکیش لە بانگخوازان بەڵگە بەوە دەهێننەوە کە ئێمە سڵ لەوە ناکەینەوە هەر مینبەرێک بەکار بهێنین بۆ گەیاندنی بانگەوازی چاک، بەڵام ئەوان بەوە، شەرعییەتێکیان داوە بەم کەناڵانەی لانکەی فیتنە و فەساد و، بابەتەکەیان لای خەڵکی عەوام و سادە نەرم و ئاسایی کردۆتەوە و، ڕقبوونەوەی گەرم و تیژی خەڵک لەبارەی خراپەیانەوە، سارد و خامۆش دەکەنەوە.

ئەرێ نابینی پێغەمبەری خوا (ﷺ) چ هەڵوێستێکی ڕوونی لە هەمبەر مزگەوتی ضیرارڕدا هەبوو؟ کاتێک زانی سیستەمی ئەم مزگەوتە لەسەر خراپە دارێژراوە، نەیفەرموو: من نوێژی تێدا دەکەم و هەر هەلێک دەقۆزمەوە، بەشکوو جادووی جادووباز بەسەر خۆیدا بهێنمەوە و بانگەوازیی خۆم بچەسپێنم لەو جێگەیەوە کە ئەوان وادەزانن پرۆژەی خۆیان دەبەنە سەر، وای نەفەرموو (ﷺ). خاوەنی بانگەواز، ژیر و نەفسبەرزە. بانگەوازییەکەی خۆی لەوە دەپارێزێ بکرێتە چەش[1] و داوێک، خراپەکاران بۆ ڕازاندنەوەی باتڵی خۆیان بەکاری بێنن.

نموونەی ئەو فیتنەیەش کە دووڕووان ویستیان لێیەتی لەم ڕۆژانەدا: هەوڵی هێشتنەوە و جێگیرکردنی حاڵەتی پەرتی و لێکجیاوازیی موسڵمانان و ئوممەتەکەیان. وەک چۆن پەروەردگار وەسفی هاوەڵانی مزگەوتی ضیرارڕی کرد کە ویستیان لەوەیە ﴿وَتَفرِيقًا بَينَ المُؤمِنِينَ﴾ [التوبه: ١٠٧] «جیاوازی خستنە ناو باوەڕداران.»، لەو پێناوەشدا دروشمگەلی پێشخستن و پیرۆزکردنی نیشتمان بەکار دێنن، لەبری (إن هذه أمتكم أمة واحدة). کە لە ڕاستیدا تەنانەت نیشتمانەکانیش

---

(١) ئەو خۆراکەی بە قولاپی ماسی و جۆرە جیاوازەکانی تەڵەوە دەکرێت.

بەسەلامەتی نەماونەتەوە بۆ خەڵکەکانیان، بەڵکوو کراونەتە ئامراز و بەهانەی بەتاڵانبردنی سامانی موسڵمانان بەناوی بەرژەوەندییانەوە و، دوورینەوەی دەمی هەر موسڵمانێک و لەناوبردنی بەناوی پاراستنی ئاسایشی نیشتمانەوە.

پێغەمبەری خوا (ﷺ)، جەختی توندی کردۆتەوە لە تاوانی پەرتکردنی نێوان موسڵمانان و، بڕینەوە و بەشبەشکردنی جەستەی ئوممەت لەسەر بنەماگەلێکی نەفامی، فەرموویەتی:

**"بەڕاستی پەروەردگار لووتبەرزیی نەفامی و شانازیکردنی بە باووباپیران لەناوتاندا سڕیوەتەوە؛ باوەڕدارێکی لەخواترس، یان خراپەکارێکی نەگبەت و ماڵوێران. ئێوە نەوەی ئادەمن و ئادەمیش لە گڵە. دەسا پیاوانێک دەست هەڵدەگرن لە شانازیکردنیان بە خەڵکانێکەوە، یان پەروەردگار دەیانکاتە پشکێک لە سووتەمەنی دۆزەخ، یان بەلای پەروەردگارەوە سووک و چرووکتر دەبن لەو قالۆنچانەی بە لووت، پیسی پاڵ دەنێن."**[1]

جا خەڵکێک هەبوون شانازییان بە بەهاگەلێکەوە دەکرد جگە لە ئیسلام، وەک خۆدانەپاڵ باوانێک کە لەسەر کوفر مردوون. شانازییان بە نەژاد، یان دەوڵەمەندی، یان پێگەی ئەوانەوە دەکرد. سا ئەویش (ﷺ) ڕوونکردنەوەی بەوە دا کە ئەم شانازیکردنە، لەلای (الله) دەبێتە مایەی سووکبوون، بەجۆرێک کابرای شانازیکەر کەمتر بێ لەو مێروانەی پیسی پاڵ دەنێن و وەپێش خۆیانی دەدەن. تاوانی ئەم خەڵکە شانازیکەر و سنگدەرپەڕێنە ئەوەیە، بەهاگەلێک بەرز دەکەنەوە کە لە ئایینی خوادا هیچ سەنگێکی نییە، بگرە گەر تەشەنە بسەنێت، مایەی پەرتبوون و ئاشووبنانەوەی ناو موسڵمانانیشە. بە هەمان شێوە لەم ڕۆژانەی ئێمەشدا، هەر کەس بەهایەک بەرز بکاتەوە کە لە شەریعەتدا بەها نەبێ و لەبەرچاو نەگیرێ، ئەویش لەوپەڕی سووکیدایە بەلای پەروەردگارەوە.

---

(١) [مسند أحمد: ٨٧٣٦]

# ١٨) دڵڕەقی لە ئاست قورئاندا

ئەم سیفەتەش -وەک سیفەتەکانی دیکەی دووڕوویی- پێوەستی بە گومانکردن لە ئایینی خواوە هەیە:

﴿وَإِذا قَرَأتَ القُرآنَ جَعَلنا بَينَكَ وَبَينَ الَّذينَ لا يُؤمِنونَ بِالآخِرَةِ حِجابًا مَستورًا ۝ وَجَعَلنا عَلى قُلوبِهِم أَكِنَّةً أَن يَفقَهوهُ وَفي آذانِهِم وَقرًا﴾ [الإسراء: ٤٥ – ٤٦] «کاتێکیش قورئان دەخوێنیتەوە، پەردەیەکی داپۆشەر و تۆکمە دەخەینە نێوان تۆ و ئەوانەوە کە باوەڕیان بە دواڕۆژ نییە (٤٥) هەروا پەردەگەلێک دەدەین بەسەر دڵەکانیاندا لەوەی لێی تێبگەن و، قورسیش دەخەینە گوێیەکانیانەوە.»

ئەم ئایەتەش لە بنەڕەتدا سەبارەت بە بێباوەڕان دابەزیوە، بەڵام پێوەندیی نێوان ئەو دوو شتە بەدەر دەخات.

پەروەردگار لەبارەی ئەو ڕەقی و داخرانەوە کە ڕێگریی ڕامانی قورئان لە دووڕووان دەکات، دەفەرمووێت:

﴿أَفَلا يَتَدَبَّرونَ القُرآنَ وَلَو كانَ مِن عِندِ غَيرِ اللَّهِ لَوَجَدوا فيهِ اختِلافًا كَثيرًا﴾ [النساء: ٨٢]، «ئەرێ لە قورئان ڕانامێنن و ورد نابنەوە، کە گەر لای غەیری پەروەردگارەوە بووایە، جیاوازی و دژیەکی زۆریان تێدا دەبینییەوە.»

﴿أَفَلا يَتَدَبَّرونَ القُرآنَ أَم عَلى قُلوبٍ أَقفالُها﴾[محمد: ٢٤]، «ئەرێ لە قورئان ڕانامێنن و ورد نابنەوە، یان دڵانێک قفڵی خۆیانیان لێ دراوە و بەسەریانەوەیە.»

ئای چ ڕەقییەکیش بێ ڕەقیی دڵی دووڕووان! دەهاتنە دانیشتنەکانی پێغەمبەرەوە (ﷺ) و گوێیان لە قورئان دەبوو لە زاری ئەوەوە بە تەڕ و تازەیی

و، ئەویش ڕاستەوخۆ لە جبریلی ئەمینەوە و لە خوای بڵند و بەرزەوە (جل جلاله)، هیچ سوودێکیشی پێ نەدەگەیاندن و کێوە زبڵی کوفری هەڵڕژاوی ناو دڵیانی نەدەبزواند:

﴿وَإِذا جاءوكُم قالوا آمَنّا وَقَد دَخَلوا بِالكُفرِ وَهُم قَد خَرَجوا بِهِ وَاللَّهُ أَعلَمُ بِما كانوا يَكتُمونَ﴾ [المائده: ٦١] «کاتێکیش دێنە لاتان دەڵێن: "باوەڕمان هێناوە"، کە بەڕاستی بەبێباوەڕی هاتوونەتە ژوور و چوونەتە دەریشەوە و خواش زاناترە بەوەی دەیانشاردەوە.»

بەڵکوو سەیریان کە کاتێک دەرچووبوون لای پێغەمبەر (ﷺ)، پاش ئەوەی ئایەتی قورئان و دانایی سوننەتیان بیستبوو، ئەوجا گێژگێژ دەیانپرسی لە هاوەڵان: ئەوە تۆزێک لەمەوپێش چی گوت؟

﴿وَمِنهُم مَن يَستَمِعُ إِلَيكَ حَتّى إِذا خَرَجوا مِن عِندِكَ قالوا لِلَّذينَ أوتُوا العِلمَ ماذا قالَ آنِفًا أُولئِكَ الَّذينَ طَبَعَ اللَّهُ عَلى قُلوبِهِم وَاتَّبَعوا أَهواءَهُم﴾ [محمد: ١٦] «هەشیانە گوێ دەگرێ بۆ تۆ هەتا کاتێک دەردەچن لەلات، بەوانە دەڵێن کە زانستیان پێ دراوە: "ئەوە هەندێک لەمەوپێش چی گوت؟" ئەوانەن خوا مۆری داوە لە دڵیان و شوێن ئارەزوویان کەوتوون.»

لەبەر ئەوبەڕی بێئاگاییان، لە هیچ حاڵی نەبووبوون، یان لەوانەیە وەک گاڵتەپێکردن و بەکەمگرتن وتبێتیان؛ وەک بڵێی ئێمە زۆر بایەخ بە قسەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) نادەین و گوێمان لێی نییە.

بگرە شەرمیشیان لەم دڵڕەقییەیان نەدەکرد:

﴿وَإِذا ما أُنزِلَت سورَةٌ فَمِنهُم مَن يَقولُ أَيُّكُم زادَتهُ هذِهِ إيمانًا﴾ [التوبە: ١٢٤] «کاتێکیش سوورەتێک دادەبەزێت، هەیانە کە دەڵێت: "ئەرێ کامتان ئیمانی بەمە زیادی کرد؟"»

هەر دەڵێی لەپێشچاومە لەناو خۆیاندا لە یەک دەپرسن: "ئەرێ خوا ناڵێت قورئان ئیمان زیاد دەکات؟! ئەرێ خۆ دیومانە ئەم کۆمەڵەیە (واتە: هاوەڵان) دەگرین و ورەیان بەرز دەبێتەوە وەختێک قورئانیان گوێ لێ دەبێ! دەی توخوا فلان کەس، تۆ ئیمانت پێی زیادی کرد؟" ئەویش دەڵێ: "نا بەخوا" کابرای پرسیارکەریش دەڵێ: "دەی بەخوا منیش"!

پەروەردگاریش وەڵامی ئەم پرسیارەیان دەداتەوە: ﴿فَأَمَّا الَّذِينَ آمَنُوا فَزَادَتْهُم إِيمَانًا وَهُم يَسْتَبْشِرُونَ ﴿١٢٤﴾ وَأَمَّا الَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ فَزَادَتْهُم رِجْسًا إِلَى رِجْسِهِم وَمَاتُوا وَهُم كَافِرُونَ﴾ [التوبه: ١٢٤ - ١٢٥] «جا ئەوانەی باوەڕیان هێناوە، ئیمانی زیاد کردن و مژدە دەبەخشنەوە پێی (١٢٤) بەڵام ئەوانەی نەخۆشی لە دڵیاندایە، پیسی بۆ پیسییان زیاد کرد و مردیشن بەبێباوەڕی.»

لەگەڵمدا لەم ڕەقییەی دڵیان ڕابمێنە! ئەو قورئانەی گەر دابەزیایەتە سەر کێوێک، ملکەچی دەکرد و شەقی تێ دەبرد لە ترسی (الله)، بۆ دووڕووانی ستەمکار، جگە لە گومان و دۆڕان هیچی زیاد نەکرد!

وریا بە برام کە بەشت لەم ئایەتانەدا هەبێ! زۆرێک لە خەڵک ڕۆژەکەیان بە پێکردنی دەنگی قورئانخوێنێک دەست پێ دەکەن، پاشان چەند خولەک دوای ئەوە، زۆر یان کەم، دەچێتەوە سەر ئەو گۆرانییانەی بانگ بۆ تاوان و خراپە و سەرپێچی (الله) دەکەن. لەوانەشە بەو جۆرەی دڵی لەگەڵ ئەم گۆرانییانەدا دەبزوێت و کاردانەوەی بۆی هەبێ، کە بەو جۆرە لەگەڵ ئایەتەکانی قورئاندا ئاوا کاردانەوە و بزوانی نەبووبێ. سا ئایا ئەو قورئانەی گوێبیستی بوو، گەیشتە دڵی؟ ئایا ئایەتەکانی (الله) ئیمانی زیاد کرد و، ڕووی گەش و مژدەبەخشی پێ دا؟ دڵی لەرزی و بوویە شیفا و میهری خوایی بۆی؟ وەک چۆن پەروەردگار وەسفی حاڵی باوەڕداران دەکا وەختێک قورئان دەبیستن؟ پاشان گەر هەر یەکێک لەمانەشی دەست کەوتبێ و چەشتبێ، دڵی قبووڵی

دەکا پاشی وی، گوێبیستی شتێکی پێچەوانەی قورئان بێ؟

دڵڕەقتر لەمانەش، ئەوانەی ناوبانگییان بەوە دەرکردووە خاوەن دەنگی جوان و نایابن، هەر یەکێکیان لە یەک لە مزگەوتە هەرەگەورەکاندا پێشنوێژی بۆ موسڵمانان دەکا، پاشانیش دەبینی دۆستایەتی تاوانباران دەکا و شەرعییەت بە ستەمکاران دەدا! یان دەبینی بەئاشکرا دەڵێ: پەشیمانم کە پێشتر گوێم لە گۆرانی نەگرتووە! خۆزگە ئاواتی ئەوە بووایە پێشتری ژیانی تەنیا یەک هەڵوێستی لە سەرخستنی ئیسلامدا هەبووایە!

پێغەمبەری خوا (ﷺ ) دەفەرمووێ: **"زۆرینەی دووڕووانی ئوممەتەکەم، قورئانخوێنەکانین."**[1]

مەناوی لە ڕاڤەی ئەم فەرمودەیەدا دەفەرمووێ: "واتە: ئەوانەی تەئویلی دەکەن بە جگە واتای ڕاستیی خۆی و، لە جگە جێگەی خۆیدا دایدەنێن" پاشان دەفەرمووێ: "عەطاء فەرموویەتی: 'وریا بن لە قورئانخوێنان و وریای منیش بن لەگەڵ واندا. سوێند بێ، گەر لەگەڵ کامەیاندا کە زۆرترین دۆستایەتی بۆم هەیە، بکەومە ناکۆکی لەسەر هەنارێک، من بڵێم شیرینە و ئەو بڵێ ترشە، بێترس و دڵپاک نیم لێی کە هەوڵی ڕشتنی خوێنم بدا لەلای دەسەڵاتدارێکی ستەمکار!'"، واتە یەکێکیان لەسەر هیچترین هۆکار، خراپترین دوژمنایەتی بەرپا دەکا.

تا ئەوێی کە مەناوی دەفەرمووێ: "هەر بۆیە دەبینی یەکێکیان لووتبەرزی بەسەر خەڵکدا دەکا و بەسووکی سەیریان دەکا و ڕوویان لێ تاڵ دەکا، وەک بڵێی منەتیان بەسەردا دەکا بە دوو ڕکات نوێژێک کە زیاد لەوان ئەم هەیبێ، یان وەک بڵێی لای خواوە نووسراوێکی بۆ هاتبێ بە چوونە بەهەشت و پارێزران لە ئاگر، یان وەک ئەوەی دڵنیا بێ لە بەختەوەری و بردنەوەی خۆی و،

---

(١) [مسند أحمد: ٦٦٣٣]

نەگبەتی و دۆڕانی سەرجەم ئەو خەڵکەی دی. کەچی پاش هەموو ئەوەش، دەبینی بەرگی خۆبەکەمزانان لەبەر دەکا و خۆی دەمرێنێ، کە لە ڕاستیدا ئەو جۆرە بەرگ و خۆمراندنە، لەگەڵ لووتبەرزی و زلفیزیدا نایەتەوە و بگرە دژیشیەتی، بەڵام خۆ کوێر نابینێ".

ئەم وشە ئاڵتوونیانەی "مەناوی"ش باسی چەندین سیفەتی دووڕووانی تێدایە: دڵڕەقی لە ئاست قورئان، ناخۆشکردن لە دوژمنایەتیدا، گەورەبینینی چاکە و پەرستشی خود، ئەرخەیانبوون لە سزای خوا و ڕیاکردن بە ڕواڵەتی خۆبەکەمزانانەوە. بەداخەوە کە هەموو ئەمەش وەک مەناوی فەرمووی، لە خەڵکێکدا هەبێ کە قورئانیان خوێندۆتەوە و بگرە لەوەیە پشکێکیان لە زانستیش پێ درابێ! سا پەنا بە خوا لەم وەسف و حاڵە.

پێغەمبەرمان (ﷺ) فەرموویەتی: "نموونەی ئەو دووڕووەی قورئان دەخوێنێتەوە، نموونەی ڕێحانە؛ بۆنی خۆشە و تامی تاڵە."[1]

جا ئەمە نموونەی ئەو دووڕووەیە کە زۆریش قورئان دەخوێنێتەوە بەڵام کاری پێ ناکا و دڵی بۆ ئیمان ناسوڵحێ، لەپێش خەڵکیشدا وا دەنوێنێ ئیماندارە. خەڵکیش لەگەڵ ئەوەدا، هێشتا قورئانخوێندنی ئەویان پێ خۆشە. ئیدی بەم حاڵە وەک ڕێحان وایە، کە بۆنێکی خۆشی هەیە بەڵام تامی تاڵە، بۆنی خۆشی وێنەی قورئانخوێندنیەتی، تامی تاڵیشی وێنەی دووڕوویيەکەی.

---

(١) [البخاري: ٥٤٢٧]

# ١٩- بەکەمگرتنی تاوان و بەزۆرگرتنی چاکە

وەختێک دووڕوو گومانی لە ئایین هەیە، ئیتر هەر چاکەیەک کە بیکات، قەبارەی گەورەترە لە ئیمانی لاوازی ئەو، گەر ئەسڵەن ئیمانێک بوونی هەبێ. بۆیە ئەم چاکەیەی خۆی زۆر بە گەورە دەبینێ، بەڵام تاوان؛ چونکە ئەو یەقینی بە گەورەیی ئەو خوایە نییە کە سەرپێچیی دەکات، ئیمانی تەواوی بە ئاگرێک نییە تێیدا ئەشکەنجە بدرێ لەسەر سەرپێچییەکەی، سا بچووک لە تاوانی خۆی دەڕوانێ، با شاخەکانیش لێی بێنە ڕووخان! ﴿وَما قَدَرُوا اللَّهَ حَقَّ قَدرِهِ﴾ [الأنعام: ٩١]، «بەڕاستی ئەوانە ڕێز و پێگەی ڕاستیی خوایان لا نەبوو.»

دووڕوو لەمەدا لەسەر ڕێگە و ڕێبازی کابرای خاوەن دووباخەکەیە، کە فریوی خوارد پێیان و بوغرا بوو و گوتی: ﴿وَما أَظُنُّ السّاعَةَ قائِمَةً وَلَئِن رُدِدتُ إِلى رَبّي لَأَجِدَنَّ خَيرًا مِنها مُنقَلَبًا﴾ [الكهف: ٣٦] «وا نازانم قیامەتیش هەڵبستێ و گەر بشگەڕێنرێمەوە بۆ لای پەروەردگارم، هێشتا لەمەش باشتر دەبینمەوە لەوێ.»

ئەوی دیش کە گوتی: ﴿وَما أَظُنُّ السّاعَةَ قائِمَةً وَلَئِن رُجِعتُ إِلى رَبّي إِنَّ لي عِندَهُ لَلحُسنى﴾ [فصلت: ٥٠] «وا نازانم قیامەت هەڵبستێ و گەر بشگەڕێنرێمەوە بۆ لای پەروەردگارم، من لەلای ئەو باشترینەکەم[بەهەشت] بۆ هەیە.»

﴿وَلَئِن رُدِدتُ﴾ و، ﴿وَلَئِن رُجِعتُ﴾، بەهەشت "ئەمە ئەگەر هەبێ" ئەمان گرەنتییان کردووە! ئاوایە دووڕوو. کەمێک چاکەی دەبێ بۆ ئەوەی بچێتە بەهەشتەوە "ئەمە ئەگەر هەبێ". بەڵام بڵێی ژیان و مردنی بۆ (الله)ی پەروەردگاری جیهانیان بێ؟ نا! دەی ئەم چاکەیە و چەندقاتی ئەویش سوودی

پێ ناگەیەنێ، مادەم گومان لە دڵیدایە.

حەسەنی بەصری دەفەرمووێ: "باوەڕدار چاکەکاری و ترسی کۆکردۆتەوە، دووڕوویش خراپەکاری و بێترسی کۆکردۆتەوە".

واتە: باوەڕدار چاکترین کردەوەگەلێکیشی هەیە، لەگەڵ ئەوەشدا هێشتا لە ترس و بیمی سزای خوادا ئێوارە و بەیانی دەکاتەوە. لە کاتێکدا دووڕوو خراپترین کردەوەگەلێکی وەپێش داوە و لەگەڵیشیدا بێترسە لە ئاگر، کوڕە جاری وایە فشەش دەکا، دەڵێ: "پێش تۆ دەچمە بەهەشتەوە"!

هەندێک دۆخی دیکە، دووڕوو بەوە بەهانە بۆ وازنەهێنانی لە تاوان دێنێتەوە کە گومانی باشی بە خوا هەیە. حەسەنی بەصری دەفەرمووێ: "ئیمان بە ئاواتخواستن و ئومێدبازی نابێ، بەڵام ئەوەیە لە دڵدا بگیرسێتەوە و کردەوە پشتڕاستی بکاتەوە. بەڕاستی خەڵکێک ئاواتی لێخۆشبوونی خوا بە سەرگەرمیدا بردبوونی، هەتا ئەوەی لە دونیا دەرچوون و تاقە چاکەیەکیشیان لەگەڵ خۆدا نەبرد و هەر دەیانگۆت: 'ئێمە گومانمان بە خوا باشە، ئومێدمان بە خوایە'، درۆشیان کرد! گومانیان گەر بە خوا باش بووایە، کردەوەشیان باش دەبوو".

ئاواتی لێخۆشبوون بەبێ کردەوە، هەر ئەوەیە کە تانەی پێ دەدرێ لە دووڕووان وەختێک شووراکە لەنێوان ئەوان و باوەڕداراندا لێدەدرێ:

﴿وَغَرَّتۡكُمُ الأَمانِيُّ حَتّى جاءَ أَمرُ اللَّهِ وَغَرَّكُم بِاللَّهِ الغَرورُ﴾ [الحديد: ١٤]
«ئومێد و ئاواتەکان فریوی دان، هەتا ئەوەی فرمانی خوا هات و هەروا شەیتانی بوغرا و فریوخواردوو، ئێوەشی بوغرا کرد و فریو دا.»

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود خوا لێی ڕازی بێ دەفەرمووێ: "باوەڕدار تاوانەکانی وەها دەبینێ، وەک ئەوەی لە ژێی کێوێکدا دانیشتبێ و بترسێ بەسەریدا بڕووخێ. خراپەکاریش تاوانەکانی وەک مێشوولەیەک لێ دەڕوانێ،

نزیکی لووتی بێتەوە و بە دەست باوەشێنێکی بکا و دووری بخاتەوە".

ڕاستیشی فەرمووە! چەند خەڵک دەبینی سەبارەت بە پەروەردگار قسەی نالایەق دەکەن، یان غەیبەت و تانەبازی، ئەوجا یەکێکیان دەڵێ: "أستغفر الله" و گێلگێل پێدەکەنێ! چۆن بڵێی ئەو ئیستیغفارکردنەی سوودێکی بۆی هەبێ!

بوخاری لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە گێڕاوێتییەوە کە فەرموویەتی:

"ئێوە کاری وا دەکەن لە چاوی خۆتاندا لە موو باریک و سووکتر، ئێمە دەورانی پێغەمبەر (ﷺ) لە تاوانە زلە و ملشکێنەکان هەژمارمان دەکرد."

"لە موو باریکتر" واتە بچووکتر لە موو، واتە ئەسڵەن بایەخی بۆ دانانێن.[1]

ئەنەس خوا لێی ڕازی بێ ئەمەی بە تابیعین فەرموویێ، کە تابیعینن و لەو فەزڵ و چاکییەدان کە تێیدان، چی دەگوت گەر ڕووی دەمی لە خەڵکی دەورانی ئێمە بکردایە، کە خۆیان لە تاوانی گەورە و فەوتێنەر گەوزاندۆ و مێشێکیش میوانیان نییە؟! (الله المستعان).

لە سەردەمی بەربڵاویی تۆڕە کۆمەڵایەتییەکانیشدا، دەشێت یەکێکمان قسەیەک بنووسێ، یان وێنەیەک بڵاو بکاتەوە، یان کۆمێنتێک بدا، لایکێک یان شەیری بڵاوکراوەیەک، لەوەشدا ئاوڕێک بۆ لایەنی شەرعیبوون و نەبوونی کارەکەی نەداتەوە، کە لەوانەیە لێکەوتە خراپەکانی هەتا پاش مردنیشی بمێنێتەوە.

بەڕاستی کەسێک بکەوێتە سەرپێچییەوە، بە فاسیقەکانی بەنی ئیسرائیل چووە کە خوا لەبارەیانەوە فەرموویەتی ﴿فَخَلَفَ مِن بَعدِهِم خَلفٌ وَرِثُوا الكِتابَ يَأخُذونَ عَرَضَ هذَا الأَدنى وَيَقولونَ سَيُغفَرُ لَنا وَإِن يَأتِهِم عَرَضٌ مِثلُهُ يَأخُذوهُ﴾ [الأعراف: ١٦٩] «جا پاشینانێک پاش وان هاتن و جێیان گرتنەوە و پەرتووکیان

---

(١) [البخاري: ٦٤٩٢]

بەمیرات بۆ مایەوە، کە ماڵ و بابەتی ئەم نزم و نزیکەیان [دونیا] دەوێت و وەردەگرن، دەشڵێن لێخۆشبوونمان بۆ دەردەچێت، ئەگەریش ماڵێکی تر هەر وێنەی ئەوەیان بۆ بێت، دیسانەوە وەری دەگرنەوە.»

ئەوان تاوانیان دەکرد جار لەدوای جار و، دەستیشیان لێ هەڵنەدەگرت و لەگەڵ ئەوەشدا دەیانگوت: "خوا لێمان خۆش دەبێ"!

حەسەنی بەصری دەفەرمووێ:

"باوەڕدار ئەوەیە کە دەزانێت ئەوەی خوا فەرموویەتی، هەر ئەوەیە کە فەرموویەتی. باوەڕدار باشترین کردەوەی هەیە لەناو خەڵکدا و زۆرترین ترسیش لەناویاندا، گەر شاخێک سامان ببەخشێت هێشتا ئەرخەیان نییە؛ مەگەر بە چاوی سەر ببینێت -واتە بەهەشت ببینێ ڕۆژی دوایی و بزانێ کە دەچێتە ناوی-. هەتا چاکی و پاکی و پەرستشیشی زیاد بکات، ترسیشی زیاد دەکات، پێ بە پێ. دەڵێ: ڕزگارم نابێ! ڕزگارم نابێ! دووڕووش دەڵێ: خەڵک زۆرن -واتە: منیش یەکێکم لەو خەڵکە زۆرە و بەرۆکی من هەروا ناگیرێ و سزا بدرێم- و خوا لێم خۆش دەبێ، ترسمان نییە. کردەوەی شەڕە و ئاوات بەسەر خواوە دەخوازێ".

باوەڕدار دەزانێ وەختێک خوا فەرموویەتی: ﴿مَن يَعمَل سوءًا يُجزَ بِهِ﴾[النساء: ١٢٣] «هەر کەس هەر کارێکی خراپ بکا، تۆڵەی پێ لێ وەردەگیرێتەوە».

ئەوەی خوا فەرموویەتی هەر ئەوەیە کە فەرموویەتی، وەختێکیش فەرموویەتی: ﴿وَمَن يَعمَل مِثقالَ ذَرَّةٍ شَرًّا يَرَهُ﴾[الزلزلة: ٨] «هەر کەس قورسایی مێروولەیەکیش خراپە بکا، دەیبینێتەوە» هەر ئاوایە کە فەرموویەتی. سا ئەرخەیان نییە لە سزای (الله) مەگەر بەهەشت بەچاوی خۆی ببینێ ڕۆژی قیامەت. هەرگیز ناکرێ بگاتە قۆناغێک کە تێیدا بڵێ: "من باشترین و بەهەشتم لای پەروەردگارم بۆ دانراوە بەو باڵانسە چاکەیەی کە کردوومە،

با پاش وی هەرچی تریشم لەدەست قەومابێ" ناکرێ گاڵتەی بە تاوان بێت، بەڵکوو جگە لە ترس، هیچی بۆ زیاد نابێ؛ ئەمەش ڕەنگدانەوەی مەزنڕاگرتنیەتی بۆ پەروەردگاری.

ئەم فەرمایشتەی حەسەن، دژایەتی لەگەڵ ئەوەدا نابێ کە باوەڕدار دڵی بە چاکەی خۆی خۆش دەبێ و، هەست دەکات پەروەردگار ویستی خێری پێی هەیە وەختێک بەکاری هێناوە لە کارگەلێکی چاکدا.

ئەم سیفەتەش لە بەکەمگرتنی تاوان و بەگەورەبینینی چاکە، لەم ڕۆژگارەی خۆماندا گەلێک لەناو ڕۆڵەی موسڵماندا بەربڵاوە. تەنانەت هەست دەکەی هەندێکیان مننەت بەسەر (الله)دا دەکەن بە کردەوەکانیان!

﴿قُل لا تَمُنّوا عَلَيَّ إِسلامَكُم بَلِ اللَّهُ يَمُنُّ عَلَيكُم أَن هَداكُم لِلإيمانِ إِن كُنتُم صادِقينَ﴾ [الحجرات: ١٧] «بێژە منەتی موسڵمانبوونتان بەسەرمدا مەکەن، بەڵکوو خوا منەت بەسەر ئێوەدا دەکا کە ڕێنوێنی کردوون بۆ ئیمان، ئەگەر ئێوە ڕاست بکەن»، با هەموو خوێنەرێکیش نەفسی خۆی بپشکنێت، ئاخر ناشێ تۆ لە هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) زیاتر ئومێدی بەهەشتت هەبێ و کەمتر لە ئاگر بترسی!

ڕاپرسییەکمان پێشتر کردبوو بۆ هۆکارەکانی کەوتنە تاوانەوە، لەسەر شێوەی چەند دەربڕینێک کە بەشداربووی ڕاپرسییەکە بە هەڵبژاردن پیایاندا تێپەڕ دەبوو، بەسەر نوێژخوێنانی ڕۆژی هەینیدا دابەشمان کرد لە چەن مزگەوتێکی ئوردوندا، نزیکەی ٧٧٠ نوێژخوێن وەڵامیان دابۆوە، دووەم زۆرترین هۆکار کە هەڵبژێردرابوو بریتی بوو لە: ئومێدەوارکردن بە ڕەحمەتی خوا و هەستکردنی کەسی تاوانکار بەوەی کە سزا نادرێ -وەک بەدەستی خۆیان هەڵیان بژاردۆ-.

دەشبینین کە بەکەمگرتنی تاوان و بەزۆرگرتنی چاکە، بەرەو سیفەتێکی دیکەی دووڕوویی دەچێت کە: پشت لە تەوبە کردنە.

## حاڵی باوەڕدار:

عائیشە پرسیاری لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) کرد سەبارەت بەو فەرمایشتەی پەروەردگار:

﴿وَالَّذِينَ يُؤْتُونَ ما آتَوا وَقُلوبُهُم وَجِلَةٌ أَنَّهُم إِلى رَبِّهِم راجِعونَ﴾ [المؤمنون: ٦٠] «هەروەها ئەوانەی ئەوەی دەیکەن لە کاری چاکە و بەخشین دەیکەن و دەیبەخشن، هێشتاش هەمان وەخت دڵیان لە ترس و لەرزدایە لەوەی دەگەڕێنەوە لای پەروەردگاریان.» عائیشە پرسی: "ئەوانەن کە مەی دەخۆنەوە و دزی دەکەن؟"

وەڵامی دایەوە (علیه الصلاة والسلام): "نا ئەی کچی صدیق، ئەوانەن کە بەڕۆژوو دەبن و نوێژ دەکەن و خێریش دەبەخشن، هەمان کاتیش دەترسن لێیان وەرنەگیرێ، ئەوانەن کە بەهەڵپە و خێرایین بۆ کارە چاکەکان و، پێشی دەگەنەوە و دەیبەنەوە."[١]

ئیبراهیمی تەیمی فەرموویەتی: "هەرگیز گوفتارم لە بێژنگی کردار نەداوە، ئیللا ترسام بەدرۆ بخرێمەوە." واتە: ترساوم کردارم گوفتارم بەدرۆ بخاتەوە.

ئاوایە باوەڕدار، چەندی گوێڕایەڵی هەبێ و چاکەی وەبەر دابێ، سوور دەزانێ هێشتا کەمتەرخەمە لە مافی پەروەردگاریدا (تبارك وتعالی). چەندی سەرپێچیی بچووک بێ، هەرگیز گاڵتەی پێی نایە، چونکە دەزانێ سەرپێچیی خوای مەزنی قەدرگرانی کردووە (سبحانە وتعالی).

---

(١) [مسند أحمد: ٢٥٢٦٣]

# ٢٠- پشتکردن لە تەوبە

پەروەردگار (تبارك وتعالى) لە وەسفی دووڕووواندا دەفەرمووێ: ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمۡ تَعَالَوۡا يَسۡتَغۡفِرۡ لَكُمۡ رَسُولُ ٱللَّهِ لَوَّوۡا رُءُوسَهُمۡ وَرَأَيۡتَهُمۡ يَصُدُّونَ وَهُم مُّسۡتَكۡبِرُونَ﴾ [المنافقون: ٥] «وەختێکیش پێیان بگوترێ "وەرن با پێغەمبەری خوا داوای لێخۆشبوونتان بۆ بکا"، سەریان بادەدەن و دەیانبینی بەرهەڵستی دەکەن و لووتبەرزن.»

هیچیش سەیر نییە، وەختێک دووڕوو بێئەدەب بێت لەگەڵ پێغەمبەری خوادا (ﷺ) وەک باسمان کرد، تاوانی خۆشی بە بچووک لێ بڕوانێ چونکە ڕێز و پێگەی لایەق بە (الله)ی لەلا نییە، ئیتر بۆچی تەوبە بکا؟!

بەڵکوو بڕوانە مەودای پشتکردن و گاڵتەهاتنیان بە لێخۆشبوونی خوا: وەک موسلیم لە جابری کوڕی عەبدوڵلاوە گێڕاوێتییەوە، دەفەرمووێت: "پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: 'هەر کەس بچێتە سەر ئەم بەرزاییە، بەرزایی موراڕ، هێندی ئەوەی خوا لە تاوانی بەنی ئیسرائیل خۆش بوو؛ هێندی ئەوە لێی خۆش دەبێ.'"

جابر دەفەرمووێ: "جا یەکەم پۆلێک کە چوونە سەری، ئەسپەکانی ئێمە بوو، ئەسپەکانی بەنی خەزرەج. پاشان تەواوی خەڵک بەشوێن یەکدا" پێغەمبەری خواش (ﷺ) فەرمووی: "سەرجەمتان خوا لێی خۆش بووە، کابرای ئەو وشترە سوورە نەبێ" کە دووڕوویەک بوو گوێی بەم هەلەی لێخۆشبوون نەدا. جابر فەرمووی: "چووینە لای و گوتمان: 'وەرە با پێغەمبەری خوا (ﷺ) داوای لێخۆشبوونت بۆ بکا.'"

گوتی: "بە خوا ونبووەکەی خۆم بدۆزمەوە، پێم خۆشترە لەوەی کابراکەی لای ئێوە داوای لێۆشبوونم بۆ بکا" جابر فەرمووێ: "چونکە ئەو شتێکی ون کردبوو و بەشوێنیدا دەگەڕا."[1]

تەماشای ئەم پیاوە کە، لەو ئاژەڵەی بەشوێنیدا دەگەڕا بێعەقڵتر بوو، ئاوها دۆزینەوەی ولاغەکەی لە ئیستیغفاربۆکردنی پێغەمبەر (ﷺ) پێ خۆشترە!

پەروەردگار دیسان لە وەسفی دووڕوواندا فەرموویەتی:

﴿أَوَلا يَرونَ أَنَّهُم يُفتَنونَ فى كُلِّ عامٍ مَرَّةً أَو مَرَّتَينِ ثُمَّ لا يَتوبونَ وَلا هُم يَذَّكَّرونَ﴾ [التوبە: ١٢٦] «نابینن هەموو ساڵێک جارێک یان دوو جار تاقی دەکرێنەوە، پاشانیش نە تەوبە دەکەن و، نە یادێک دەکەنەوە.» بەڵاکان یەک لەدوای یەک دەیانکوتێتەوە، کەچی هەر تەوبە ناکەن.

ئەم سیفەتەش دیسان یەک لەوانەیە کە تانەی پێ دەدرێ لە دووڕووان پاش لێدانی شووراکە، کە پێیان دەگوترێ "وتربصتم". واتە: تەوبەتان دواخست لە کاتێکەوە بۆ کاتێکی دواتر، وەک ئیبن کەثیر دەفەرمووێ.

## ئەرێ ڕۆژێک لە ڕۆژان هەلیان لەبەر دەستدا نەبوو؟:

﴿إِذ ظَلَموا أَنفُسَهُم جاءوكَ فَاستَغفَرُوا اللَّهَ وَاستَغفَرَ لَهُمُ الرَّسولُ لَوَجَدُوا اللَّهَ تَوّابًا رَحيمًا﴾ [النساء: ٦٤] «خۆ گەر ئەوان وەختێک ستەمیان لە خۆیان کرد، بهاتنایەتە لات و جا داوای لێخۆشبوونیان لە خوا بکردایە و پێغەمبەر داوای لێخۆشبوونی بۆ بکردنایە، خوایان دەدییەوە زۆر تەوبەوەرگر و میهرەبان.»

لە خەڵکیشدا هەیە بە دووڕووان دەچێ لەم سیفەتەدا، کاتێک ئامۆژگاری

---

(١) [مسلم: ٢٧٨٠]

دەکرێ واز لە تاوانێک بێنێ و نەیەوێ وازی لێ بێنێ، دەڵێ: "مامۆستا دوعای هیدایەتمان بۆ بکە"، بەڵام لە قووڵایی دڵیدا گاڵتەی بە تاوانەکەی دێ و بەهانەگەلێک دەهێنێتەوە ڕاستی نین. سا با وریا بێ هەر کەس ئەوە کاریەتی، کە بەوانە بچێ خوا لەبارەیانەوە فەرموویەتی: ﴿سَيَقولُ لَكَ المُخَلَّفونَ مِنَ الأَعرابِ شَغَلَتنا أَموالُنا وَأَهلونا فَاستَغفِر لَنا يَقولونَ بِأَلسِنَتِهِم ما لَيسَ في قُلوبِهِم﴾ [الفتح: ١١] «لەجێماوانی دەشتەکی پێت دەڵێن: "سامان و خێزانەکانمان سەرقاڵیان کردین، سا داوای لێخۆشبوونمان بۆ بکە"، بە زمانیان شتێک دەڵێن کە لە دڵیاندا نییە.»

لە بەرامبەریشدا ئەمەیان سیفەتی باوەڕدارانە: ﴿إِنَّ الَّذينَ اتَّقَوا إِذا مَسَّهُم طائِفٌ مِنَ الشَّيطانِ تَذَكَّروا فَإِذا هُم مُبصِرونَ﴾ [الأعراف: ٢٠١] «بەڕاستی ئەوانەی لەخواترسانیان هەیە، وەختێک شتێک لای شەیتانەوە بەرۆکیان بگرێ، یاد دەکەنەوە و سا وا دەبینی بەرچاوڕۆشنن.»

سیعدی لە ڕاڤەیدا دەفەرمووێ: "لەخواترس وەختێک هەست بە تاوانێک بکا و شنەیەکی لای شەیتانەوە بۆ بێ، ئیدی گوناهبار بێ بە کردنی تاوانێک، یان زایەکردنی واجبێک - بەیادی دێتەوە لە چ دەرگەیەکەوە بۆی هاتوون، لە چ دەلاقەیەکەوە شەیتان دزەی کردۆتە لای، فرمانێک خوا بەسەریدا داوە و مەرجەکانی ئیمان دێتەوە یادی، جا چاوی دەکرێتەوە و داوای لێخۆشبوون لە (الله) دەکا، ئەوەی لێی فەوتاوە، بە تەوبەیەکی یەکلا و پاک و چاکەی زۆر قەرەبووی دەکاتەوە، ئەوسا شەیتانەکەی ڕسوا و سووک و چرووک و دەستبەتاڵ دەگەڕێتەوە، هەرچیش دەستی پێ گەشتبوو، بەزیادەوە تۆڵەی کرایەوە."

# ٢١- خۆدانە بەر فیتنە

یەکەم شتێک کە بە دووروووان دەوترێت پاش لێدرانی شووراکە: ﴿وَلَٰكِنَّكُمْ فَتَنتُمْ أَنفُسَكُمْ﴾ [الحديد: ١٤]، «بەڵام ئێوە خۆتان دایە بەر فیتنە.»

ئەوەی نیفاق لە دڵیدا بێ، هەر دەوروخولی تاوان دەدات و، تاو نا تاو تووشی دەبێ، بیانووش بەوە دێنێتەوە کە ئەو کارەی دەیکات، زانایان ڕاجیان لە حوکمەکەیدا و حەرامیی یەکلایی نییە، بەشوێن فەتوای شاز و گومڕاشدا دەگەڕێ، بۆ خۆی و بۆ خەڵکیش بیانووی ئەوە دێنێتەوە کە نییەتیان پاکە. وەک ئەوانەی گوێ بە ڕێکارە شەرعییەکان نادەن لە مامەڵەکردنی نێوان دوو ڕەگەزەکەدا و، دڵیشیان لەوەدا بەمەیل و ئیشتیهایە؛ هەروا ئەوانەی چاو بەناو حەرامەکاندا دەگێڕن، تەماشای زنجیرە و گۆرانییە لادەرەکان دەکەن. جا هەر کەس کە دڵی بەوە وێران بووە و ئیتر تاوانی لەلا بەلاوە جوانە و، درووشم و حوکمەکانی (الله)ش ناشیرین دەبینێ. ئیدی گومانی ئەوەی پێ نابڕێ کە لە وەختی لێدرانی شووراکەدا، لەوانە بێ کە نووریان لە پێش و لای ڕاستیانەوە دێت و دەچێ و بەسەر سیراتەوە دەیانپەڕێنێتەوە! بگرە ترسی ئەوەی هەیە لەوانە بێ کە پێیان دەگوترێ: ﴿وَلَٰكِنَّكُمْ فَتَنتُمْ أَنفُسَكُمْ﴾ «بەڵام ئێوە خۆتان دایە فیتنە!»

زۆرجاریش لاوان دەپرسن: ئایا دروستە لە فڵان شوێن بخوێنم؟ یان لە فڵان شوێن کار بکەم؟ جا یەکەم وەڵامێک بۆ ئەم پرسیارانە: هیچ شتێکت هێندی سەلامەتبوونی دڵت، لەلا گرنگ نەبێ! خۆت مەدە بەر دۆخێکی فیتنە کە دەزانی توانات بەسەریدا ناشکێ.

با بیریشت بێ ئەی لاو، وەختێک بەشداری لە تۆڕێک لە تۆڕەکان، یان کەناڵە تایبەتەکان بە فیلم و زنجیرەکان دەکەیت کە ناسراون بە لادان و خراپەنانەوە؛ بیرت بێ بەر لەوەی ئەپڵیکەیشنەکەی لەسەر مۆبایلەکەت دابگری، یاخود ئاریاڵی ماڵەکەت ڕوو بکەیتە وێستگەکەی (Receiver)، بێتەوە بیرت: ﴿وَلَٰكِنَّكُمۡ فَتَنتُمۡ أَنفُسَكُمۡ﴾ «بەڵام ئێوە خۆتان دایە بەر فیتنە!»

ئەو ساتەی ڕۆژی دوایی کە لەبەردەم دووڕووواندا شوورایەک لێ دەدرێ و جیایان دەکاتەوە لە باوەڕداران و، جا دەپرسن: (ألم نكن معكم؟ - ئەرێ ئێمە لەگەڵتاندا نەبووین؟) وەڵامیان بۆ دێت: (بلى ولكنكم فتنتم أنفسكم - با، بەڵام ئێوە خۆتان دایە بەر فیتنە.) [سورة الحدید]، خۆتان تووشی فیتنە کرد؛ ئەوسا دەزانن کە ئیدی فەوتاون.

## ٢٢- ناخۆشکردن لە وەختی دوژمنکاریدا[1]

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: "چوار هەن لە هەر کەسدا هەبن، دووڕوویەکی پەتییە؛ هەر کەسیش یەک سیفەتیانی تێدا بێ، ئەوا سیفەتێکی دووڕوویی تێدایە هەتا وازی لێ دێنێت: کاتێک ڕاسپاردەی بدرێتێ، ناپاکی بکات. کاتێک قسە دەکا، درۆ بکات. کاتێک پەیمان بدا، بیشکێنێ. کاتێک دژایەتی دەکا، ناخۆشی بکا."[2]

ناخۆشکردن و سنوورشکاندن سیفەتێکی زەمکراوە. بەوە پێناسە دەکرێ کە بریتییە لە: درۆکردن و لادان لە ڕاستگۆیی و لە حەق و، دەستبردنە بۆ سەرپێچییەکان. ئەمەش لە کەسێکدا دەردەکەوێ، کە دووڕوویی تێدا بێ لە وەختی دوژمنایەتیکردنیدا بۆ هەر کەسێک.

سنووربەزێنی و دەستنەگەڕاندنەوە لە هەر گورزوەشاندنێک، وەک سیفەتەکانی دیکەی نیفاق، پێوەندی هەیە بە گومان هەبوون لە دواڕوژ. کابرای دوژمن و دژایەتیکار، ئەگەر باوەڕی بە ڕۆژی دوایی هەبێ، ئەوە ئارامی بە دەروونی دەبەخشێ؛ چونکە هەر مافێکی کە لە دونیادا بفەوتێ، بێشک لە بالانسی هەڵگیراوی دواڕۆژیدا لەلای پەروەردگاری (سبحانە و تعالی) دەیبینێتەوە؛ لەو ڕۆژەدا کە ئەوپەڕ پێویستیی پێی دەبێ. بەڵام ئەوەی باوەڕی بە دواڕۆژ لاواز بێ، ئەم واتا و بیرۆکەیەی لەلا نییە، بۆیە دەترسێ ئەو مافەی بفەوتێ. دەبێ هەر چۆنێک بووە ئاگری دڵی بکوژێنێتەوە و زێدەڕەوییەکی

---

(١) لە شەڕدا بەشی ئاشتی ناهێڵێتەوە.

(٢) [البخاري: ٣٤]

هەبێ لە تۆڵەکردنەوەدا؛ هاوکات وەفای بۆ هیچ دۆستایەتییەک نابێ کە لەنێوان خۆی و دوژمنەکەی ئێستایدا، پێشتر هەبووە.

لە ڕۆژگاری ئەمڕۆی خۆماندا، بەزۆری ئەم سیفەتە لە کێشەکانی هاوسەران و دۆخی حاڵەتی جیابوونەوە و قۆناغی بەر لەویشدا دەبینینەوە، ئیتر ڕەچاوی ئەو ژیانەی پێشوو ناکەن پێکەوە بەسەریان بردووە، گوێڕایەڵی ئەو فەرمایشتەی پەروەردگار نابن:

﴿وَلا تَنسَوُا الفَضلَ بَينَكُم﴾ [البقرة: ٢٣٧] «فەزڵ و چاکەی نێوانتان لەیاد مەکەن.»

زۆرجاریش ئەمە لای خانەوادەکانی هاوسەرانەوە دێت، کە هاندەرن بۆ تۆڵەکردنەوە و ناخۆشکردن و زەرەردان لە لایەنی بەرانبەر! ئەو فەرمایشتەی پێغەمبەر (ﷺ) پێ نازانن، یان لەبیریان کردووە کە دەفەرمووێت: "لە ئێمە نییە هەر کەس، ژنێک لە مێردەکەی هان بدا"، واتە: نێوانی لەگەڵ مێردەکەی تێک بدا و هانی دوژمنکاری، یان خراپمامەڵەکردنی بدا لەگەڵیدا. ئەوەشی کە دەفەرمووێ (ﷺ): "لە ئێمە نییە"، بەڵگەیە کە ئەوە لە تاوانە گەورەکانە

# ٢٣- شکاندنی پەیمانی خوا

دووڕوو وەک بڵێی لێکەوتەکانی تاوان "تاقی دەکاتەوە"! چونکە گومانی لە خوا هەیە، گەر باوەڕیشی بە بوونی هەبێ، وێناکاری و خوێندنەوەکانی بۆی، لاواز و داخوراوە. هیچ حسابێکیش بۆ سزای دوارۆژ ناکات، هەرچی بەلایەوە گرنگ بێ، ئەوەیە لە خۆشی دونیای کەم نەبێتەوە. ئیدی بەرەبەرە دەکەوێتە شکاندنی پەیمانی خواوە، جا گەر ئەوە کار نەکاتە سەر بەرژەوەندییە دونیاییەکانی، دڵئارامە و یەکجاری پێ درێژ دەکا. بە حاڵی ئەو جوولەکانەی بێنەدەبییان بەرانبەر بە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەکرد و پاشانیش:

﴿وَيَقولونَ فِى أَنفُسِهِم لَولا يُعَذِّبُنَا اللَّهُ بِما نَقولُ﴾[المجادلة: ٨] «لە دڵی خۆشیاندا دەڵێن: بۆچی خوا سزامان بدا لەسەر ئەوەی کە دەیڵێین.» جا تەنیا بەوەی سزا زوو یەخەیان نەگرێ، ئەرخەیان و ئاسوودەن! پاشی ئەوە پەروەردگار دەفەرمووێ:

﴿حَسبُهُم جَهَنَّمُ يَصلَونَها فَبِئسَ المَصيرُ﴾[المجادلة: ٨] «بەسیانە دۆزەخ بچنە ناوی و بیچەشن، سا خراپترین سەرەنجام و چارەنووسە.»

با هەر یەکێکیش لە دڵی خۆیدا بکەوێتە بیری ئەوەوە، کە چۆن بەدڵ و بەکوڵ داوای لە خوا دەکرد و پەیمانی دەدایە کە گەر شتێکی لە دونیا پێ ببەخشێ، یان لە شەڕێک بیپارێزێ کە نزیکە لێیەوە، ئەوا دەبێتە یەکێک لە پیاوچاکان و ئەو تاوانانەی هەیەتی، دەستیان لێ هەڵدەگرێ. جا پەروەردگاری بەخشندەش (سبحانە) میهری پێ دەکا و ئەوەی داوای کردووە، دەیداتێ؛ کەچی چەند ڕۆژ زیاتر و کەمتر بەسەریدا ناڕوا، دەبینی کابرای پەیماندەر گەڕاوەتەوە سەر تاوانەکانی و تاس و حەمامەکەی جارانی! لە دڵی خۆشیدا

دەڵێ: "ئەوەی ڕوویدا، بەڕێکەوت ڕوویدا"، "ئەو نارەحەتییە هیچ پێوەندیی بە تاوانی منەوە نەبوو"، یان "لاچوون و ڕزگاربوونەکە پێوەندی بە دووعاکانەوە نەبوو"، "هۆکارگەلی ماددی زۆرن". [داوای لێخۆشبوون و سەلامەتیمان لە پەروەردگارە]

ئەم کردەوەیە لە گرنگترین هۆکارەکانی ڕووانی نیفاقە لە دڵدا. پەروەردگار دەفەرمووێ:

﴿وَمِنهُم مَن عاهَدَ اللَّهَ لَئِن آتانا مِن فَضلِهِ لَنَصَّدَّقَنَّ وَلَنَكونَنَّ مِنَ الصّالِحينَ ﴿٧٥﴾ فَلَمّا آتاهُم مِن فَضلِهِ بَخِلوا بِهِ وَتَوَلَّوا وَهُم مُعرِضونَ ﴿٧٦﴾ فَأَعقَبَهُم نِفاقًا في قُلوبِهِم إِلى يَومِ يَلقَونَهُ بِما أَخلَفُوا اللَّهَ ما وَعَدوهُ وَبِما كانوا يَكذِبونَ﴾ [التوبه: ٧٥ - ٧٧] «هەشیانە کە پەیمانی دابووە خوا کە گەر لە فەزڵ و بەخششی خۆی پێمان بدا، خێرات دەکەین و لە پیاوچاکان دەبین (٧٥) کەچی کاتێک لە فەزڵی خۆی پێی دان، چرووک بوون پێی و پشتیان کرد و بەرهەڵست بوون (٧٦) سا ئەویش دووڕوویيەکی لە دڵیان نا، هەتا ئەو ڕۆژی کە پێی دەگەنەوە، بەرانبەر بە شکاندنی ئەو بەڵێنەی بە خوایان دابوو و ئەوەشی کە درۆیان دەکرد.»

پاداشی ئەم کارە نزم و ناشیرینەیان ئەوە بوو؛ دڵیان کەوتە دووڕووییەوە هەتا ڕۆژی گەشتنەوە بەو پەروەردگارەی بەڵێنیان لەگەڵیدا شکاند و نەبردە سەر، جا چۆن ئەگەر ئێمە چەندان و چەندان جار ئەمەمان کردبێ! داوای لێخۆشبوون و سەلامەتیمانە لە پەروەردگار و، ئەوەی بە بەخشندەیی و نیانیی خۆی لەگەڵماندا بکا (سبحانه وتعالی).

# ٢٤- مۆرکێکی ناسراوە لە قسەدا و گاڵتەکردن بە ئایین

دووڕووان ڕقیان لە (الله)یە. ڕقیان لە پەرتووکەکەیەتی، چونکە دژە بە ئارەزووەکانیان؛ ئەوانیش بەندەی ئارەزوون.

ڕقیان لە شەریعەتەکەیەتی، چونکە مرۆڤ بەرەو لووتکەکان بەرز دەکاتەوە؛ ئەوانیش بە ژیانی زۆنگاوەکان ڕاهاتوون!

ناتوانن ئەمە بە ڕاشکاوی بڵێن، جا چی دەکەن؟ پەنا دەبەنە بەر شێوازێکی تایبەت لە قسەدا، بەر قسەیەک کە ڕواڵەتی دەشێت زۆرێک لە خەڵک قایل بکا، بەڵام لە هەناویدا پیسیی زۆر هەیە.

پەروەردگار لە وەسفی دووڕوواندا فەرموویەتی: ﴿وَلَتَعرِفَنَّهُم فی لَحنِ القَولِ﴾ [محمد: ٣٠] «سوێند بێ لە مۆرکی قسەکردنیشدا دەیانناسیتەوە.»

ئەم مۆرکە تایبەتە، شێوەی زۆری هەیە:

هەیانە ژەهری خۆی لە قسەیەکی ڕازێنراوەدا دەڕژێت؛ ڕواڵەتی خۆشویستنی ئایین و بەرگریکردنە لێی و، ناوەڕۆکیشی گومانبازی و تانەدانە.

وەختێ هەندێک لە ڕقلەدڵانی ڕۆژئاوایی هەوڵی سنوورشکاندنیان دا بەرانبەر بە پێغەمبەری خوا (ﷺ)، کە زیانی بۆ ئەو نییە لە پێگەی بەرز و وێستگەی ئاسمانی و مەقامی مەحموودی خۆیەوە، ئەوکات هەندێک لە دووڕووان زاریان کردەوە و گوتیان:

"نا بۆ گاڵتەکردن بە پێغەمبەری خوا (ﷺ)، بەڵام دەرگەی ڕەخنە کراوەیە"!

کاتێکیش هەڵمەتی بایکۆتکردنی بەرهەمەکانی ئەو ڕۆژئاواییە گاڵتەکارانە دەستی پێ کرد، مونافیقێکی دیکە هاواری کرد، گوتی:

"ئەمە هەڵمەتێکی ئاژاوەگێڕە، ڕق و کینە لە دڵی ئەوانی دیکەدا قووڵ دەکاتەوە و تیرۆر گۆش دەکات"!

هەردوو قسەکە نموونەن لەسەر مۆرکی تایبەتی قسەی دووڕووان. یەکەمیان وای دەردەخات ڕێزی هەیە بۆ پێغەمبەر و دان بە پێغەمبەرایەتی ئەودا دەنێت و بەرگری لێ دەکات، بگرە سەڵاواتیشی لەسەر دا (ﷺ)؛ بەڵام تەنیا مەبەستی ئەو دەربڕینەی کۆتایی بوو، کە تێیدا بانگەوازی دەکات بۆ ڕەخنەگرتن لە پێغەمبەری مەعصووم (ﷺ)، ئەو پێغەمبەرەی خوا لەبارەیەوە فەرموویەتی: ﴿وَما يَنطِقُ عَنِ الهَوى ۝ إِن هُوَ إِلّا وَحيٌ يوحى﴾ [النجم: ٣ - ٤] «ئەو لە هەوانتە و ئارەزووەوە نایەتە گۆ (٣) ئەوە جگە لە وەحییەک کە بۆی وەحی کراوە، شتێکی دیکە نییە.»

دووەمیشیان وای دەر دەخا هاوڕایە لەگەڵ موسڵمانان، کە ئەو کارەی گاڵتەکاران سازێنەری ڕق و کینەیە؛ بەڵام لە ڕاستیدا پێشی قەبووڵ ناکرێ ئەو کافرانە بایکۆت بکرێن کە ئازاری پێغەمبەری خوایان (ﷺ) داوە، بگرە پێشی سەخت بوو ناویان لێ بنێ کافر لەگەڵ ئەوەشدا کە کردوویانە! ناوی لێ نان "ئەوانی دیکە"، دەستەواژەی بەرفراوان و لاستیکیی تیرۆریشی بەکار هێنا؛ ئەوەی هەمیشە پەنای بۆ دەبەن و هەر کەس بیانەوێ لە باوەڕدارانی خاوەن عیززەت، دەیبەنە ژێریەوە، هەر یەکێک هەوڵی سەرخستنی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بێ و ڕەتی بکاتەوە لاقرتێی پێ بکرێ، ئەوانەی گوێڕایەڵ و جێبەجێکاری فەرمایشتەکەی پەروەردگاریانن: ﴿وَالَّذينَ إِذا أَصابَهُمُ البَغيُ هُم يَنتَصِرونَ﴾ [الشورى: ٣٩] «هەروا ئەوانەی وەختێک سنووریان بەرانبەر بشکێنرێ، تۆڵەی ڕەوا وەردەگرنەوە.»

هەرگیزیش نابێ بگوترێ کە "درووست نییە گومانی خراپ بەوانە ببرێ کە نموونەی ئەم قسانەیان لێ دەردەکەوێ، یان حوکم بدرێ لەسەر نییەتیان"! چونکە ئەم گوتەیە نەزانین و نەگەشتنە لە ڕێسای کارکردن بە ڕووالەتەکان (الأخذ بالظاهر). چونکە وەرگرتنی ڕووالەت و کارپێکردنی، وەک چۆن بریتییە لەوەی گومانی باش بە کەسێک بەری کە ڕووالەتێکی باش پیشان دەدات، بە هەمان شێوە بریتییە لەوەشی کە حوکمی خراپە بدرێ بەسەر کەسانێکدا کە ئەم جۆرە قسە نیفاقییانەیان لێ دەردەکەوێ؛ بەتایبەت گەر بێتو ناسراو بن بە وێنەی دیکەی ئەم قسانە و، بەسووکگرتنی بابەتی ئایینیان لێ بینرابێ. وەگەر نا، پەروەردگار مۆرکی ناسراوەی قسەی نەدەکردە نیشانەیەکی جیاکەرەوە بۆ دووڕووان، کە ئێمە بیانناسینەوە پێی: ﴿وَلَتَعرِفَنَّهُم فِى لَحنِ القَولِ﴾ «سوێند بێ لە مۆرکی قسەکردنیشدا دەیانناسیتەوە.»

هەشە لە دووڕووان، شێوازێکی دیکەیان هەیە. دەبینی لە چاوەڕوانیدان، هەتا وەختی دوژمنێکی خوا و پێغەمبەر و قورئان و شەریعەت دەمرێ؛ دەست دەکەن بە پیاهەڵدانی ئەو تیاچووە، باس دەکەن لە "ئازایەتی" و "بوێری" و "بەهێزبوونی لە بڵاوکردنەوەی مەبدەئی خۆیدا"!

بە باڵ و بە گەز، وەها بە باڵایدا دەدوورن و ستایشی دەکەن، دەڵێی لەگەڵیدا ژیاون و نیسکێنەیان خواردۆ و، هەستاون و دانیشتوون و هێندە لە نزیکەوە شارەزای ئاکار و ژیاننامەی ئەون، بۆیە ئاوا ئاگریان گرتووە بۆ پیاهەڵدانی!

لەگەڵ ئەوەدا کە لەوانەشە ئەسڵەن نە کتێبێکی ویان خوێندبێتەوە، نە ئامادەی وتارێکی بووبێتن، تەنیا و تەنیا یەک شتی لەبارەوە دەزانن: دوژمنی خوا و پێغەمبەرەکەیەتی (ﷺ)! ئەمەش بەسە بۆ ئەوان تا پیایدا هەڵبدەن و بەرگری لێ بکەن! زمانحاڵیشیان دەڵێ: "تۆ [ئەی کابرای مردوو] شتانێکت دەربڕیوە و گوتووە کە ئێمە ناتوانین بیڵێین، یان دابەشکردنی ڕۆڵەکان وای

ویستووه ئێمه ئاشکرا نەیڵێین".

ئیتر میهرەبانی و مرۆڤایەتی و "هاوسەنگی" دەردەخەن لە بڕیاردان بەسەر کەسەکاندا، بۆ ئەوەی ڕقبوونی خۆیان لە (الله) و قەڵسبوونیان بە یادی ئەو و، کینەی شاراوەیان دەرهەق بە شەریعەت بەوە داپۆشن.

﴿وَلَتَعرِفَنَّهُم فى لَحنِ القَولِ﴾

هەمان شێوە دەبینی هی دیکەش هەن کە بە گەورەمولحیدەکاندا هەڵدەدەن وەختی تیاچوونیان، وەک پیاهەڵدانی نەبڕاوەیان بۆ ستیڤن هۆکینگ، بگرە بە باڵای کاهینانی زیندووی ئیلحادیشدا هەڵدەدا و گەورەی دەکاتەوە کە لەبارەی ڕیچارد دۆکینزەوە (کە لە گەشتی دڵنیاییدا ڕوونمان کردەوە چ ساختەکارێکی گەورەی زانست و، درۆزنێکی قۆڵبڕە) دەڵێ: "زانایە، (سبحان الله)! ناکۆکی بی، هاوڕا بی کابرا زانایە. دەروونی زانای هەیە، هەستی زانای هەیە، زانستی لەلا پیرۆزە، بە زانست دەگەشێتەوە، بە زانست شاد دەبێ، شتێکی سەیروسەمەرەیە". هەموو ئەمانەش شێوەگەلی ئەو مۆرکە ناسراوەیەی قسەن.

هەروا لە شێوەکانی ئەو مۆرکەی قسە: ئەوەی ڕێکخراوگەلێکی نێودەوڵەتی دەیکەن لە نواندنی ڕێز بۆ ئیسلام لەگەڵ ئایینەکانی دیکەدا، لە هەمان کاتدا کە ڕەواج بە بێباوەڕی و لەناوبەرە ڕەوشتییەکان دەدەن و، دژ بە فیترەت و خواڕسک دەجەنگن لە کۆمەڵگە موسڵمانەکاندا، بانگەشەی ئەوەش دەکەن کە دژ بە تێگەشتنی هەڵە بۆ ئیسلام دەجەنگن! دەربڕینی باقوبریقاویش بەکاردێنن، وێنەی "پێچەسپاندنی ئافرەت"، "مافەکانی منداڵ" بۆ ئەوەی ئەو ڕاستییە بشارنەوە کە بریتییە لە وێرانکردنی ئافرەت و منداڵ و خێزان و، بەکۆیلەکردنی خەڵک.

سەبارەت بەمەش بڕوانە ئەو زنجیرەیەمان (الحرب على الفطرة) لە یوتیوب.

جا باوەڕدار لەسەریەتی کە بەم قسە ڕازاوانە نەخەڵەتێ، هەر کەس و لایەنێک بیانکات؛ ئەوەی لەیاد بێ کە بوخاری گێڕاوێتییەوە لە عومەرەوە خوا لێی ڕازی بێ، دەفەرمووێ:

"بەڕاستی خەڵکێک لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا (ﷺ) بە بەڵگە و پاڵپشتیی وەحی بەرۆکیان دەگیرا، وا ئەمڕۆ وەحی پچڕاوە. ئێستە ئێمە تەنیا بەو کارانەتان کە لێمان دیارە بەرۆکتان دەگرین، جا هەر کەس چاکمان نیشان بدات، لێی بێخەم دەبین و نزیکی دەخەینەوە. نهێنیی هەر چۆن بێت لە ئەستۆی ئێمە نییە، خوا لێی دەپرسێتەوە لەسەر نهێنی و شاراوەکانی. هەر کەسیش خراپمان بۆ دەر بخات، نە لێی بێترس دەبین و نە بڕوایەکی پێ دەکەین، با بیشڵێت: نهێنی و شاراوەم پاکە."[١]

ئامۆژگاریشمانە پەرتووکی (زخرف القول)ی دکتۆر فەهد عەجلان و ئەندازیار عەبدوڵڵا عوجێری بخوێنرێتەوە کە بەسوودە لەم ناوەندەدا، بە ویستی پەروەردگار.

---

(١) [البخاري: ٢٦٤١]

# ٢٥- بێئاگایی لە خوێندنەوەی حیکمەتەکانی پەروەردگار لە قەدەرەکانیدا

بوخاری لە (الأدب المفرد)دا هێناویەتی لە سەعیدی کوڕی موسەییەبەوە، فەرموویەتی: "لەگەڵ سەلمان بووم کە سەردانی نەخۆشێکی کرد لە کیندە، جا وەختێک چووە لای گوتی: 'مژدەت لێ بێ، نەخۆشیی باوەڕدار خوا بۆی دەکاتە لێخۆشبوونی گوناهـ و مایەی لۆمەکاری. نەخۆشیی مرۆڤی خراپەکاریش وێنەی وشترە، خاوەنەکەی بەستوویەتییەوە و پاشان بەرەڵای کردووە، نە دەزانێ بۆ بەستراوەتەوە یان بەرەڵا کراوە.'"(١)

"واتای ئەوەی کە نەخۆشی دەبێتە مایەی لۆمەکاری بۆ باوەڕدار ئەوەیە کە، دەبێتە هۆکار بۆ لێپرسینەوەی لە نەفسی خۆی و گەڕانەوەی لە خراپەکان و بەئاگاهاتنەوەی لە غەفڵەت.

بەپێچەوانەی خراپەکارەوە، کە نەخۆشکەوتنی سوودی بۆی نییە؛ هێشتاش سوورە لەسەر تاوانی، بۆیە ئەو وشترەیە خاوەنەکەی گرتوویەتی و بەستوویەتییەوە پاشان بەرەڵای کردووە، نازانێ بۆچی ڕاگیراوە یان بەرەڵا کراوە! هەمان شێوە، خراپەکار وەختێک نەخۆش دەکەوێ، نازانێ بۆچی نەخۆش کەوتووە و حیکمەت لە نەخۆشبوونی چییە. چاوەڕوانی پاداشتێک نییە و ناشگەڕێتەوە لای خوا!"

باوەڕدار دەزانێ پەروەردگار دانایە لە سەرجەم کارەکانیدا، دەزانێ کە لە ڕێگەی تاقیکردنەوە بە خۆشی و ناخۆشییەکان پەرستشی جیاواز دێنێتە دەر.

---

(١) [البخاري: ٤٩٢]

﴿وَنَبلوكُم بِالشَّرِّ وَالخَيرِ فِتنَةً وَإِلَينا تُرجَعونَ﴾ [الأنبياء: ٣٥] «تاقیتان دەكەینەوە بە ناخۆشی و خۆشی بە تاقیكردنەوە و، بۆ لای ئێمەش دەگەڕێنرێنەوە.» هەمیشە بیردەكاتەوە "بڵێی ئەو پەرستشە چی بێ پەروەردگار لە منی بوێ لەم هەلومەرجەدا؟"

بەڵام دووڕوو، لە زۆر لە حاڵەكانیدا ئەسڵەن خوای لەبیر چووە (كە سیفەتی پاش ئەم سیفەتەیە)، ڕووداوەكان لەژێر ڕۆشنایی باوەڕبوون بە حیكمەتی خوادا لێک ناداتەوە. بیر لەم پەرستشانە ناكاتەوە. پەروەردگار لە بەگژداچوونی دووڕوواندا فەرموویەتی: ﴿أَوَلا يَرَونَ أَنَّهُم يُفتَنونَ فى كُلِّ عامٍ مَرَّةً أَو مَرَّتَينِ ثُمَّ لا يَتوبونَ وَلا هُم يَذَّكَّرونَ﴾ [التوبە: ١٢٦] «ئەرێ نابینن كە هەر ساڵ جارێک، یان دوو جار تاقی دەكرێنەوە؛ پاشانیش نە تەوبە دەكەن و نە یادێک دەكەنەوە.» بڕوانە كە دەفەرمووێ: ﴿وَلا هُم يَذَّكَّرونَ﴾ [التوبە: ١٢٦] «نە یادێک دەكەنەوە.»).

لە موسڵمانانیش هەن كە دەكەونە وێنەی ئەمەوە. جا كاتی پەتایەک بڵاو دەبێتەوە، یان بەڵایەک دێ و دەگوترێ: "ئەمە یادخستنەوەیەكە لای خوای گەورەوە" دەڵێ: "پێوەندیی بەوەوە نییە! ئەمانە هۆكارگەلێكی ماددین". بەشێک لەم گرفتەشیان نەزانینێكی مەعریفییە، كە وادەزانن شتەكە دەبێ یان بە هۆكاری ماددی بێ، یان هۆكاری غەیبی؛ نازانن پەروەردگار بەندەكانی لە خۆشی و ناخۆشیدا دێنێت و دەبا، هەر بە هۆكارگەلی ماددی، هەمووشی هەر لای خواوەیە. ﴿أَلا لَهُ الخَلقُ وَالأَمرُ تَبارَكَ اللَّهُ رَبُّ العالَمينَ﴾ «ئەرێ بەڕاست ئافراندن و فرماندانیش هەر بۆ ئەوە؛ پیرۆز و خاوەن فەڕ بێ (الله)ی پەروەردگاری جیهانیان.» جا پێكدادان نابێ گەر لە هەمان ڕووداو، هۆكاری ماددی و هۆكاری غەیبیشی هەیە. دەشێ كەسێک ئازاری دایک و باوكی بدا و پاشی ویش تووشی نەخۆشییەک بێت. خۆ زانینی هۆكارە ماددییەكانی نەخۆشییەكە، پێكدادانی لەگەڵ ئەوەدا نییە كە هۆكاری قەدەریی هاتنی ئەم

نەخۆشییە، ئازاردانی دایک و باوک بێ. پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرمووێ: "نە دەمارێک و نە چاوێک سڕ نابن و نائێشێن، مەگەر بە گوناهێک. ئەوەشی خوا لایدەدات و لێی دەبوورێت، زۆرترە)."[1]

لەگەڵ ئەوەشدا، موسڵمان یەکلا و بڕاوە ناڵێ کە ئەم ڕووداوە پێشهاتە، یان ئەوەیان خوای گەورە لەبەر ئەم حیکمەتە یان ئەوەیان تەقدیری کردووە. تەنیا ئەوەیە، دەزانێ کە ئەوانەی ڕوو دەدەن بیرخستنەوەن و بۆیە هاتوون، وای لێ بکەن پەنا بەرێتە بەر بە (الله). لە خۆشیدا بە سوپاسگوزاری و، لەناخۆشیدا بە تەوبەکردن و ئارامگری. لەپاڵ ئەوەشدا، هەرچی ڕووداوەکان لەم گەردوونەدا هەیە، بە خۆیان و هۆکارە ماددییەکانیشیانەوە، گرێدراون بە هۆیەکی غەیبییەوە، کە ئەویش ویست و ئیدارەدانی پەروەردگارە (سبحانه وتعالى).

---

(١) [رواه الطبري في التفسير والبيهقي في شعب الإيمان]

# ٢٦- لەبیرکردنی (الله)

وای چەند سەیرە لەبیرکردنی هەندێک لە خەڵکی بۆ پەروەردگاری خۆیان (سبحانە وتعالی)! نە فێری ئەوە دەبن کە نزیکیان دەکاتەوە لێی (سبحانە)، نە کاری پێ دەکەن؛ نە دەبینی یەکێکیان پرسیاری حەڵاڵ و حەرامێک بکات. ئەمەش سیفەتی مونافیقانە:

﴿المُنافِقونَ وَالمُنافِقاتُ بَعضُهُم مِن بَعضٍ يَأمُرونَ بِالمُنكَرِ وَيَنهَونَ عَنِ المَعروفِ وَيَقبِضونَ أَيدِيَهُم نَسُوا اللَّهَ فَنَسِيَهُم﴾ [التوبە: ٦٧] «دووڕووانی پیاو و ئافرەت، لە یەکن و یەک دەستەن. فرمان بە خراپە دەکەن و ڕێگری لە چاکە دەکەن. خوایان لەبیر کردووە و خواش ئەوانی فەرامۆش کردە.»

﴿نَسُوا اللَّهَ فَنَسِيَهُم﴾، سا پەروەردگار بایەخ بە یەکێکیان نادات، لە هەر دۆڵێکدا ملی بشکێت.

تۆڵەشیان ئەوەیە، کە پەروەردگار لەبیری خۆشیانیان دەباتەوە؛ جا کار ناکەن بەوەی سوودی بۆیان هەیە و، دڵیان زیندوو دەکاتەوە و ڕزگاریان دەکا لە ڕۆژی زیندووبوونەوەدا:

﴿وَلا تَكونوا كَالَّذينَ نَسُوا اللَّهَ فَأَنساهُم أَنفُسَهُم أُولئِكَ هُمُ الفاسِقونَ﴾ [الحشر: ١٩] «وەکوو ئەوانە مەبن خوایان لەبیر کرد و، خواش خۆیانی لەبیر بردنەوە؛ هەر ئەوانەن لە ڕێ دەرچووان.»

دیسان پەروەردگار لە وەسفی زۆرینەی خەڵکیدا، دەفەرمووێ:

﴿يَعلَمونَ ظاهِرًا مِنَ الحَياةِ الدُّنيا وَهُم عَنِ الآخِرَةِ هُم غافِلونَ﴾ [الروم: ٧] «لە

ڕووالەتێکی ژیانی دونیا دەزانن و کەچی ئەوان لە ڕۆژی دوایی ئەوان بێئاگان.»

ئیبن کەثیر دەفەرمووێ: "واتە: زۆرینەی خەڵک لە هیچ نازانن، جگە لە دونیا و بژێوی و کاسبییەکانی ناوی و، کاروباری جیاوازی و ئەوەی تێیدایە. زیرەک و بیرتیژن لە پەیداکردن و ڕێگەکانی مانەوە و خۆشژیان تێیدا، بەڵام بێئاگان لە بەرژەوەندیی دوارۆژیان. لەم ڕووەوە، وەک بڵێی هەر یەکێکیان بۆ خۆی گەوج و گێل و وڕێکی تەواوە. حەسەنی بەصری فەرموویەتی: سوێند بە خوا، دونیا هێند زاڵ و ئازیزە لای یەکێکیاندا، دەتوانێ درهەم بخاتە سەر نینۆکی و کێشەکەیت پێ بڵێ، کەچی نازانێ نوێژەکانی بکا".

حاڵی زۆرێک لە خەڵکی ڕۆژگاری خۆشمان هەر نزیک بەمەیە. دەیبینی بۆ کاری دونیای چوست و پێداگرە، قۆڵ و قاچیشی لێ هەڵماڵیوە، وەختێکیش لێی بپرسی: "نوێژ دەکەیت؟" دەڵێ: "کاڵنوێژم"! سا پەنا بە (الله) لە غەفڵەتی دڵان!

جا لە فاکتەرەکانی چارەسەر:

١. ڕاستکردنەوەی مەرکەزییەت و تەوەریبوون و، پێوەرە داوەر و بڕیاردەرەکان، لە ژیانی ڕۆژانە موسڵماندا:

ئەوەش بە زیندووکردنەوەی چەمکی تەوەریبوونی (الله) و ڕۆژی دوایی لە ژیانی موسڵماندا، لە بەرانبەر تەوەریبوونی ئارەزووی مرۆڤ و حەزەکانیدا. ئەوەشمان لە ئەڵقەی (وهم الحرية)دا خستە ڕوو. ئەمەش چەسپاندنی باوەڕی دەوێ بە (الله) و ڕۆژی دوایی، پاشان کارکردن بە مەرج و دواهاتەکانی ئەم باوەڕە؛ هەروەها ئەوەی گەورەترین خەمی مرۆڤ، بەدەستهێنانی ڕەزامەندیی خوا بێ، لەپێناو ڕزگاربوون لە دوارۆژدا و، ئەو پێوەرانەشی بڕیاریان پێ دەدا بەسەر شتەکاندا، تەنیا لە شەرعەوە سەرچاوە بگرن؛ هاوڕێی ئەوەش،

سەرجەم پێوەرە مرۆییەکانی دیکە وەلا بنێ. بە نموونە: پێوەری "ئازادی"، کە چەمکێکی هەیە ڕۆژئاوا دایناوە و، لە دیدگەی ئەوانەوە بۆ ژیان، داڕێژراوە. ئاخر ناگونجێ ئێمە وەریبگرین بە چاوپۆشین لەو ڕازاندنەوە و جوانکارییانەی بەبەریدا کراوە بۆ تێپەڕاندنی بەسەرماندا، چونکە دژە بەو پێوەری بەندایەتیی یەکتاپەرستانە و ملکەچییە ڕەهایەی، لەسەرمانە لە مافی پەروەردگارماندا (سبحانە).

هەروەها پێوەری "یەکسانی"ی ڕەها، چونکە هەڵوەشێنەرەوەی شەرع، عەقڵ، فیترەت و خوارسکیشە، ئەو پێوەرەشی موسڵمان لێیەوە دەست پێ دەکات، پێوەری ئەو دادپەروەرییەیە کە شەریعەت هێناویەتی.

٢. پاراستنی ڕێکوپێکیی فیترەتی:

ئەمەش لێزانینی هونەری پەروەردەی دەوێ. سیفەتەکانی دووڕوویش زۆرجار لە لادانی فیترەت و سڕینەوەیەوە سەر هەڵدەدات، چونکە دژی سیفەتە خوارسک و ڕەسەنەکانە لە واتاکانی شەرم، میهرەبانی، مەردایەتی، غیرەت، پیاوەتی، عیززەت و بەرهەڵستیکردنی ستەم.

٣. فێربوونی ئەوەی خوا دایبەزاندووە و، ڕاستکردنەوەی وێنەی زەینی لەبارەی ئەحکامی ئیسلام و، خستنەڕووی واقیعی کۆمەڵگە دابڕاوەکان لە وەحی:

جا دۆخی ئەو کۆمەڵگانە بزانە کە دابڕاون لەوەی خوا دایبەزاندووە، ئەوجا بپرسە: ئایا دەبێ ئێمە هەمان ئەزموونی ئەم کۆمەڵگانە تاقی بکەینەوە، بە تەواوی بەش و قۆناغ و چاڵ و تەگەرەکانیەوە؟! یانی هەر دەبێ هەرچی تاڵی و چەرمەسەریی ڕۆحی تیایە بیچەشین، بەر لەوەی بزانین کە (الله) حەقە و حەقی فەرمووە و حەقی حوکم داوە و، ئەو هاوبەشانەی ئەوان لەدەوری خڕبوون جگە لە (الله)، پووچ و باتڵە و هەر (الله)یە بەرز و مەزن؟!

٤. پێکهێنانی ڕوانینی ڕێسایی: بە زانینی ئەوەی کە بێشک هەر دەبێت تەدافوع و شانکێ شانکێ ڕوو بدا، حاڵی مرۆڤایەتی بێنینە پێشچاو، هەر لەو کاتەوەی بێبەش کرا لە بەرقەراربوونی حوکم و سالارێتیی ئیسلام؛ وێنەی جیهانێک بەبێ شانکێ شانکێ و تێکپرژان. کە هەمووان لەگەڵ یەکدا بگونجێن بەپێی پێوەرگەلێکی مرۆیی و، بە بەتاڵکردنەوەی ئایەتەکانی وەلاء و بەڕاء و، لەسەر بنەمای عەقیدە و جیهاد ﴿حَتَّىٰ لَا تَكُونَ فِتْنَةٌ﴾ «بۆ ئەوەی ئاشووبی شیرک نەیەتە ئاراوە.»، بزانین کە ئەم وێنە خەیاڵپڵاوە درۆیە و شکستخواردووە و، هیچ باڵانسێکی نە لە مێژوو و، نە لە واقیعدا نییە. ئەم وێنەیە لەناو ڕۆڵەی موسڵماناندا بڵاو دەکرێتەوە، تەنیا بۆ شکاندنی ورە و داڕنینی ئیرادە و خەساندنیان و، کوشتنی گیانی عیززەت و بەرەنگاری؛ گەر بەشێکیان تێدا مابێتەوە.

٥. وازهێنان لە تاوان: بێنە پێشچاوی خۆت، وەختێک نەفست بانگی تاوانێکت دەکا، کە دەکرێ ئەم وەڵامدانەوەیەت بەرەو نیفاقت بەرێ؛ با بێتەوە بیرت: ﴿فَلْيَحْذَرِ الَّذِينَ يُخَالِفُونَ عَنْ أَمْرِهِ أَن تُصِيبَهُمْ فِتْنَةٌ أَوْ يُصِيبَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ [النور: ٦٣] «با وریا بن ئەوانەی سەرپێچی فرمانی ئەو دەکەن، کە ئاشووبێکیان تووش بێت، یان سزایەکی بەئێش.»

٦. درککردن بە سنووردارێتیی عەقڵی مرۆڤ:

وەختێک درکت بە نوقسانیی عەقڵی مرۆیی خۆت کرد، لەگەڵ زاڵێتیی ئارەزوو و حەزەکاندا؛ ئەوسا دەزانیت نامۆبوونی حوکمێکی ئاشکرا و ڕوونی (الله) بەلاتەوە، تەنیا لە نوقسانیی خۆتەوەیە، نەک لە خودی حوکمەکەوە.

مرۆڤ سروشتی ئەو ڕۆحە نازانێ کە پێی دەژی؛ گەر گەورەترین پزیشکانی سەرزەوی کۆ ببنەوە لەسەر نەخۆشێک کە (الله) لە چارەی نووسیبێ ڕۆحی دەربچێ، ناتوانن ئەو ڕۆحەی بۆ بگێڕنەوە. (الله) فەرموویەتی: ﴿فَلَوْلَا إِن

كُنتُم غَيرَ مَدينينَ ﴿٨٦﴾ تَرجِعونَها إِن كُنتُم صادِقينَ﴾ [الواقعة: ٨٦ - ٨٧]

«جا گەر ئێوە لێتان ناپرسرێتەوە و گەڕانەوە نییە (٨٦) دەیگەڕێننەوە ئەو ڕۆحە ئەگەر ڕاست دەکەن». واتە: ئەگەر ڕاست دەکەن کە ئێوە پاش مەرگ لێتان ناپرسرێتەوە، دەی با هەوڵێک بدەن کە لە سەرەمەرگی مرۆڤێکدا کە ڕۆحی دەگاتە قورقوراگەی، بیگەڕێننەوە جێگەی خۆی لەناو بەشەکانی جەستەی! هیچێک دەستی نەگرتوون ئەوە بکەن؛ مەگەر ئەوەی کە دڵنیای دڵنیان، ڕۆح هەر دەبێ دەرچێ و تاسەر نامێنێ. سپاردنی ڕۆح بە جەستە، تەنیا لە کار و ویستی (اللە)یە (سبحانە وتعالى)، ئەویش حەکیم و دانایە. ڕۆحی لە جەستە دەرنەهێناوە پاش ئەوەی پێی سپاردبوو، مەگەر چونکە تازە حیکمەت لە دەرهێنان و کێشانیدایە، بۆ ئەوەی بەژێر لێپرسینەوەدا تێپەڕێ لەسەر هەرچی کردەوە و زادەی ماوەی ژیانی دونیایەتی.

ئیدی چۆن ئەم مرۆڤە ڕێگە دەدات، کە نە دەتوانێ ژیان دروست کا و نە ڕێگری مردن بکا و، نە دەزانێ سروشتی ئەو ڕۆحە چییە کە پێی دەژی؛ چۆن ڕێگە بە خۆی دەدا بەرەنگاریی شتێک لە ئەحکامی ئافرێنەری مەزنی بکا، چونکە لەگەڵ عەقڵی ناتەواویدا ناگونجێ؟

﴿أَوَلَم يَرَ الإِنسانُ أَنّا خَلَقناهُ مِن نُطفَةٍ فَإِذا هُوَ خَصيمٌ مُبينٌ﴾ [يس: ٧٧] «ئەرێ مرۆڤ نەیزانیوە ئێمە لە نوتفەیەک دروستمان کردووە و، هاکا ئەویش بۆتە دوژمنێکی ئاشکرا[ی ئێمە].»

٧. متمانەکردن بە زانایی و دانایی و میهرەبانی (اللە):

ئەوەش لە بەرانبەر لاوازی و کورتبڕیی عەقڵی مرۆڤدا.

﴿وَعَسى أَن تَكرَهوا شَيئًا وَهُوَ خَيرٌ لَكُم وَعَسى أَن تُحِبّوا شَيئًا وَهُوَ شَرٌّ لَكُم وَاللَّهُ يَعلَمُ وَأَنتُم لا تَعلَمونَ﴾ [البقرة: ٢١٦] «نزیکە شتێکتان ڕق لێ بێ و خێر

بێ بۆتان و، نزیکە شتێکتان خۆش بوێ و شەڕ بێ بۆتان، (الله) ئەزانێ و ئێوە نازانن.»

بیرت بێ کە ئەو (سبحانە)، ئافرێنەری تۆیە. ئەو زاناترە چی گونجاوە بۆت و، چی دەتگونجێنێ. خوای گەورە دەفەرمووێ:

﴿أَلَا يَعلَمُ مَن خَلَقَ وَهُوَ اللَّطِيفُ الخَبيرُ﴾ [الملك: ١٤] «ئەرێ ئەوەی دروستی کردووە نازانێ! کە ئەو وردکار و ئاگادار و شارەزایە.»

حیکمەتی خوات بێتەوە بیر:

﴿أَلَيسَ اللَّهُ بِأَحكَمِ الحاكِمينَ﴾ [التين: ٨] «ئەرێ خوا داناترینی داوەران نییە.»

میهرەبانی پەروەردگارت بێتەوە یاد، کە ئەو (سبحانە) ئەم حوکمانەی تەشریع کردووە لەبەر زانابوونی بە لاوازیی تۆ، ویستوویەتی لەو ناڕەحەتییە لات بدات کە بەرهەم دێت لە شوێنکەوتنی ئارەزووەکان. لە سوورەتی نیساءدا، پاش ئەوەی پەروەردگار کۆمەڵێک حوکم دەخاتە ڕوو پێوەند بە مامەڵەی نێوان دوو ڕەگەزەکە، دەفەرمووێ:

﴿يُريدُ اللَّهُ لِيُبَيِّنَ لَكُم وَيَهدِيَكُم سُنَنَ الَّذينَ مِن قَبلِكُم وَيَتوبَ عَلَيكُم وَاللَّهُ عَليمٌ حَكيمٌ ﴿٢٦﴾ وَاللَّهُ يُريدُ أَن يَتوبَ عَلَيكُم وَيُريدُ الَّذينَ يَتَّبِعونَ الشَّهَواتِ أَن تَميلوا مَيلًا عَظيمًا ﴿٢٧﴾ يُريدُ اللَّهُ أَن يُخَفِّفَ عَنكُم وَخُلِقَ الإِنسانُ ضَعيفًا﴾ [النساء: ٢٦ – ٢٨] «(الله) دەیەوێت بۆتان ڕوون بکاتەوە و، ڕێنوێنی ڕێسا و دابەکانی ئەوانەی بەر لە خۆتانتان بکا و تەوبەتان لێ وەربگرێ، کە خوا زانا و دانایە (٢٦) (الله) دەیەوێ تەوبەتان لێ وەربگرێ و، ئەوانەی شوێن حەزەکان کەوتوون، دەیانەوێ ئێوە بە لادانێکی گەورە لابدەن (٢٧) (الله) دەیەوێ بارتان سووک بکات، کە مرۆڤیش بە لاوازی درووست کراوە.»

سا وریا بە لەوەی ڕقت لە شتێک ببێتەوە لەوەی خوا دایبەزاندوە، چونکە هەست دەکەیت سەختە لەسەر دەروونی لاوازی مرۆڤ؛ ئەو (سبحانە)، میهرەبانترە بە لاوازیت. وریا بە لەوەی گوێڕایەڵیی ئەوانە بکەی شوێن حەزەکان کەوتوون؛ ئەوان ئەوەیان لە تۆ دەوێ لادانێکی گەورەت لەدەست بقۆمێ و، لە دوو دونیادا ڕسوا بیت، بەدبەخت و لانەواز، لە هەمان کاتدا کە (الله) دەیەوێ تەوبەت لێ وەرگرێ و، بارت سووک بکا و ئاسانکاریت بۆ بێنێ.

فەرمایشتەکەی خوا بێنەرەوە یاد:

﴿وَاعلَموا أَنَّ فيكُم رَسولَ اللَّهِ لَو يُطيعُكُم فى كَثيرٍ مِنَ الأَمرِ لَعَنِتُّم وَلٰكِنَّ اللَّهَ حَبَّبَ إِلَيكُمُ الإيمانَ وَزَيَّنَهُ فى قُلوبِكُم وَكَرَّهَ إِلَيكُمُ الكُفرَ وَالفُسوقَ وَالعِصيانَ أُولٰئِكَ هُمُ الرّاشِدونَ ۝ فَضلًا مِنَ اللَّهِ وَنِعمَةً وَاللَّهُ عَليمٌ حَكيمٌ﴾ [الحجرات: ٧ - ٨]

ئیبن کەثیر دەفەرمووێ:

"واتە: بزانن کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەناوتاندایە، سا مەزنی ڕابگرن، پێگەی بزانن، سەنگی بۆ دانێن، بەئەدەب بن لەگەڵیدا و بۆ فرمانی ملکەچ بن. ئەو زاناترە بە بەرژەوەندیتان و بەبەزییترە پێتان لە خۆتان. ڕای ئەو بۆ ئێوە، تەواوترە لە ڕای خۆتان بۆ خۆتان. وەک پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿النَّبِيُّ أَولىٰ بِالمُؤمِنينَ مِن أَنفُسِهِم﴾ [الأحزاب: ٦] «پێغەمبەر لەپێشترە بۆ باوەڕداران، لە خۆیان زیاتر». پاشان ئەوەیان پێ ڕادەگەیەنێ کە بۆچوونی خۆیان هیچە و، ڕەچاوکردنی بەرژەوەندییەکانیانی پێ ڕایی ناکرێ، دەفەرمووێ: ﴿لَو يُطيعُكُم فى كَثيرٍ مِنَ الأَمرِ لَعَنِتُّم﴾ واتە: گەر بەگوێتان بکا لە هەموو ئەوەدا کە هەڵیدەبژێرن، بەوە بەرەو ناڕەحەتی و سەغڵەتی و قورسی دەڕۆن." تەواو بوون فەرمایشتەکانی ئیبن کەثیر.

کەواتە، گەر کارەکان لەسەر ڕێڕەوی ئارەزووەکان مرۆڤ بچوونایە، تووشی سەختی دەهاتن، بەڵام پەروەردگار دڵی هاوەڵانی پاراست لەوەی تووشی

نەخۆشیی ڕقبوونەوە بێت لەوەی خوا دایبەزاندووە. پەروەردگار لە درێژەی ئەم ئایەتەدا دەفەرمووێ: ﴿وَلَٰكِنَّ اللَّهَ حَبَّبَ إِلَيْكُمُ الإيمانَ وَزَيَّنَهُ فِي قُلوبِكُم وَكَرَّهَ إِلَيْكُمُ الكُفرَ وَالفُسوقَ وَالعِصيانَ أُولَئِكَ هُمُ الرّاشِدونَ ۝ فَضلًا مِنَ اللَّهِ وَنِعمَةً وَاللَّهُ عَليمٌ حَكيمٌ﴾ [الحجرات: ٧ – ٨]

«بەڵام (الله) ئیمانی لەلاتان خۆشەویست کردۆ و لە دڵتاندا ڕازاندوویەتیەوە و، کوفر و لەڕێدەرچوون و سەرپێچی لەلاتان بوغزاندووە، ئەوانەن چاوکراوە و سەرساغ و ڕێڕۆشنان (٧) وەک فەزڵ و چاکە و بەخششێک لای (الله)وە؛ (الله)ش زانا و دانایە.»

٨. چارەسەکردنی گرفت لە یەقین بە خوا و ڕاستێتیی پەیامەکەدا:

گەر گرفت، یان لاوازییەکت هەیە لە بوونی یەقین بە بوونی خوا و، تاک و تەنیابوونی و، ئەوەی قورئان فەرمایشتی خوایە، موحەممەد (ﷺ) پێغەمبەری خوایە؛ ئەوا ئەم گرفت یان لاوازییە، زیاتر دەتخاتە ڕوو بۆ تووشبوون بە نیفاق. لە بەرانبەریشدا، پەروەردگار (سبحانه وتعالى) فەرموویەتی:

﴿وَمَن أَحسَنُ مِنَ اللَّهِ حُكمًا لِقَومٍ يوقِنونَ﴾ [المائدە: ٥٠] «ئەرێ حوکمی کێ لە هی خوا باشترە، بۆ خەڵکێک یەقینیان هەبێ!»

خاوەن یەقین، ئەو حەقیقەتە درک پێ دەکات کە حوکمی خوا باشترینە؛ چاکی، جوانی، تەواوی و کەماڵی ئەم حوکمەش دەبینێ.

٩. دوعا:

بە دوعا و لاڵانەوەی بەکوڵ ڕوو لە (الله) بکە و، داوای هیدایەت لە خاوەنی دڵەکان و هەڵسووڕێنەریان بکە. ئەوە (سبحانه) کە لە فەرموودەی قودسیدا دەفەرمووێت: "ئەی بەندەکانم، سەرجەمتان گومڕان؛ مەگەر یەکێ

من هیدایەتم دابێ، سا داوای هیدایەتمان لێ بکەن با هیدایەتتان بدەم."[١]

لە نزای پێغەمبەرمان (ﷺ):

"داوای خۆشەویستی خۆتت لێ دەکەم و، خۆشەویستی هەر کەس تۆی خۆش دەوێت و خۆشەویستی هەر کارێک، کە نزیکخەرەوەیە لە تۆ."

ئەم واتایەت لە پێشچاو بێ، وەختێک ویردەکانی ئێواران و بەیانییان دەخوێنی: (رضيت بالله ربّا، وبالإسلام دينا، وبمحمد (ﷺ) نبيا.)

بیهێنییە پێشچاو کە بەڕاست تۆ ڕازیت (الله) پەروەردگارت بێ. بە هەر ئایەتێکی ناو پەرتووکەکەی ئەو ڕازیت و پێت قبووڵە، چونکە فەرمایشتی (الله)یە.

ڕازیت ئیسلام ئایینت بێ. ڕازی بی بە شەریعەت و دروشمەکانی.

ڕازیت موحەممەد (ﷺ) پێغەمبەرت بێ. سوننەتی ئەوت خۆش بوێ و لە سینەتدا تۆسقاڵێکیش تەنگژە لەبارەیەوە بوونی نەبێ.

سا سوور بە لەسەر کارکردن بەم چارەسەرانە، بۆ ئەوەی بە دڵێکی پڕ خۆشەویستی بۆ ئەو (سبحانە) و ئایینەکەی، بگەیتەوە بەردەستی. دڵێک، سەلامەت لە ڕقبوونەوە لەوەی ئەو دایبەزاندووە ﴿يَوْمَ لَا يَنفَعُ مَالٌ وَلَا بَنُونَ ۝ إِلَّا مَنْ أَتَى اللَّهَ بِقَلْبٍ سَلِيمٍ﴾ [الشعراء: ٨٨ – ٨٩] «ڕۆژێک، نەماڵێک و نە کوڕگەلێک سوودیان نییە (٨٨) مەگەر یەکێ بە دڵێکی ساغ هاتبێ بۆ لای (الله).»

ئیدی لە پاشان، سیفەتەکانی دووڕووان و ڕێگەی تاوانبارانمان بۆ ڕۆشن بوویەوە. پەروەردگار لە پەرتووکەکەیدا و لەسەر زمانی پێغەمبەرەکەی (ﷺ)

---

(١) [مسلم: ٢٥٧٧]

خستوویەتییە ڕوو. ﴿لِيَهلِكَ مَن هَلَكَ عَن بَيِّنَةٍ وَيَحيى مَن حَيَّ عَن بَيِّنَةٍ﴾ [الأنفال: ٤٢] «تاکوو هەر کەس تیاچوو، لەسەر بەرچاوڕوونی تیابچێ و؛ هەر کەسیش ژیا، لەسەر بەرچاوڕوونی بمێنێ و بژێ.». هەمووان ڕۆژ دەکەنەوە و دەردەچن، هەیە خۆی دەفرۆشێ و هەیە خۆی ئازاد دەکا و هەیە خۆی تیا دەبات.

با هەر مرۆیەک بۆ خۆی هەڵبژێرێت: دەیەوێ لەوانە بێ خوا لەبارەیانەوە فەرموویەتی:

﴿فَأَعرِضوا عَنهُم إِنَّهُم رِجسٌ وَمَأواهُم جَهَنَّمُ جَزاءً بِما كانوا يَكسِبونَ﴾ [التوبە: ٩٥] «سا پشتیان لێ بکەن و وازیان لێ بێنن، ئەوانە پیسین و لانەشیان دۆزەخە لە تۆڵەی ئەوەی دەیانکرد.»؟ پیسی و بۆگەنییەک، کە کەس لە جێگەی خۆی نایبزوێنێ و بۆشی ناڕوانێ!

ئەمە هەر لە ژیانیشیاندا.

با هەر مرۆیەک بۆ خۆی هەڵبژێرێ: دەیەوێ لەسەر ڕێچکەی خەڵکانێک بێ خوا هێندە ڕقی لێیانە، هەڵێکی دیکەی پێ نەداون بۆ پاککردنەوەی فایلی ڕەشیان؛ چونکە زانی دەروونیان زۆر لەوە سووک و خوارترە؟:

﴿فَإِن رَجَعَكَ اللَّهُ إِلى طائِفَةٍ مِنهُم فَاستَأذَنوكَ لِلخُروجِ فَقُل لَن تَخرُجوا مَعِيَ أَبَدًا وَلَن تُقاتِلوا مَعِيَ عَدُوًّا إِنَّكُم رَضيتُم بِالقُعودِ أَوَّلَ مَرَّةٍ فَاقعُدوا مَعَ الخالِفينَ﴾ [التوبە: ٨٣] «سا گەر خوا گەڕاندیتییەوە لای گرۆیەک لەوان و، داوای مۆڵەتیان لێ کردی بۆ دەرچوون؛ ئەوسا پێیان بڵێ: ئیدی هەرگیز ئێوە لەگەڵ مندا دەرناچن و شەڕی دوژمنێکیشم لەگەڵ ناکەن، ئێوە هەر لە سەرەتاوە ڕازی بوون بە پاڵدانەوە و نیشتن، سا هەر بۆخۆتان دانیشن لەگەڵ لەجێماواندا.»

باهەر مرۆیەک بۆ خۆی هەڵبژێرێ: دەیەوێ لە سووک و چرووکان بێ وەختی کێشانی ڕۆحەکان؟:

﴿فَكَيفَ إِذا تَوَفَّتهُمُ المَلائِكَةُ يَضرِبونَ وُجوهَهُم وَأَدبارَهُم﴾ [محمد: ٢٧] «جا چۆن ئەو وەختەی فریشتەکان گیانیان دەکێشن لە ڕوخسار و لە پاشیان دەدەن.»

با هەر مرۆیەک بۆ خۆی هەڵبژێرێ: دەیەوێ لەسەر ڕێچکەی خەڵکانێک بێ، کە خوا ڕازی نەبوو پێغەمبەرەکەی (ﷺ) نوێژیان لەسەر بکا و دووعایان بۆ بکا کاتی مردنیان؟:

﴿وَلا تُصَلِّ عَلى أَحَدٍ مِنهُم ماتَ أَبَدًا وَلا تَقُم عَلى قَبرِهِ﴾ [التوبه: ٨٤] «هەرگیزیش نوێژ مەکە لەسەر یەکێکیان کە مردۆ و، لەسەر گۆڕیشی ڕامەوەستە.»

با هەر مرۆیەک بۆ خۆی هەڵبژێرێ: دەیەوێ وەختی لەبێژینگدان، لەوانە بێ خوا لەبارەیانەوە فەرموویەتی:

﴿لِيَميزَ اللَّهُ الخَبيثَ مِنَ الطَّيِّبِ وَيَجعَلَ الخَبيثَ بَعضَهُ عَلى بَعضٍ فَيَركُمَهُ جَميعًا فَيَجعَلَهُ في جَهَنَّمَ﴾ [الأنفال: ٣٧] «بۆ ئەوەی خوا پیس لە پاک جیا بکاتەوە و پیس بخاتە سەر یەک، گلێری کاتەوە و بیخاتە دۆزەخەوە»؟

ئاوا! خەرمانێکی خڕکراوە لە نەفسە پیسەکان، چڵکاوێکی تێکەڵ لە دووڕووان و بێباوەڕان، ڕۆژی دوایی، وێنەی زبڵ و خاشاک مامەڵەیان لەگەڵ دەکرێ و دەهاوێژرێنە ئاگرەوە!

ڕسوایی لە دونیا و، ڕسوایی لە وەختی کێشانی ڕۆحە پیسەکە و، ڕسوایی وەختی لێپرسینەوەش؛ پاشان دوای ڕێڕەوی دووروودرێژی ڕسوایی، ماڵیشت چاڵی هەرەخواری ئاگر بێ!

دەی برای موسڵمانم و خوشکی موسڵمانم، وریا بە لەسیفەتەکانی دووڕووان! سوێند بە (الله)، یەک تاقە دانەشی هەبێت، فەوتێنەرە؛ سا چۆن ئەگەر چەند سیفەتی جیاوازی لە یەک کەسدا هەبن!

وریا بە ئەی مرۆی ژیر! خۆ بەوە ڕازی نیت بۆ خۆت کە لەسەر ڕێچکەی خەڵکانێک بە دیداری خوا بگەیتەوە، کە خوا ئوێدی هەموو خاوەن ئومێدێکی لەوە بڕیوە لەوانە خۆش بێت:

﴿استَغفِر لَهُم أَو لا تَستَغفِر لَهُم إِن تَستَغفِر لَهُم سَبعينَ مَرَّةً فَلَن يَغفِرَ اللَّهُ لَهُم﴾ [التوبە: ٨٠] «داوای لێخۆشبوونیان بۆ بکە، یان داوای لێخۆشبوونیان بۆ مەکە؛ گەر حەفتا جاریش داوای لێخۆشبوونیان بۆ بکەی، خوا هەر لێیان خۆش نابێ.»

زۆریی سامان و ژمارەشیان فریوت نەدا، ئەوە تەنیا بۆ قورسترکردنی تۆڵە و سزایە لەسەریان:

﴿فَلا تُعجِبكَ أَموالُهُم وَلا أَولادُهُم إِنَّما يُريدُ اللَّهُ لِيُعَذِّبَهُم بِها فِي الحَياةِ الدُّنيا وَتَزهَقَ أَنفُسُهُم وَهُم كافِرونَ﴾ [التوبە: ٥٥] «سا سەرسامت نەکا! نە سامانیان، نە منداڵیان؛ خوا تەنیا دەیەوێ بەوە سزایان بدا لە ژیانی دونیادا و، بەبێباوەڕیش گیانیان دەربچێ.»

لە ژیانیاندا جگە لە خەفەت و خەم، هیچ ناکا بۆیان؛ گەر بۆ خێر بیبەخشن، بە ڕق و ناخۆشحاڵی و داخەوە دەیبەخشن؛ ئەگەریش تووشی بەڵا بن لەو سامان یان منداڵانەدا، بە ناشوکری و دۆڕان و دادوبێدادەوە سەر دەنێنەوە.

پاشان پەروەردگار جەختی لێ دەکاتەوە، دوای ڕوونکردنەوەی سیفەتی دیکەیان، دەفەرمووێت: ﴿وَلا تُعجِبكَ أَموالُهُم وَأَولادُهُم إِنَّما يُريدُ اللَّهُ أَن يُعَذِّبَهُم بِها فِي الدُّنيا وَتَزهَقَ أَنفُسُهُم وَهُم كافِرونَ﴾ [التوبە: ٨٥] «سەرسامیشت نەکا سامان و منداڵیان! خوا تەنیا دەیەوێ بەوە سزایان بدا لە ژیانی دونیادا و، بەبێباوەڕیش گیانیان دەربچێ.»

با هەر یەکێکیشمان دیسان ئەوەی لەبیردا بێ کە ئەو نیفاقەی بەدرێژی باسمان لێ کرد، دیاردەیەک نییە دوای هاتبێ و قڕی تێ کەوتبێ؛ بگرە

دەردی هەرەمەترسیداری ئەم چاخەیە. ئەوەی بیر بێ کە هاوەڵان، باشترینی خەڵک، ئەوانەی هاوەڵێتیی پێغەمبەریان (ﷺ) کرد و قوربانیگەلی فرە و مەزنیان دا، ترسی نیفاقیان لە خۆیان هەبوو. ئێمە لەوان شیاوتر نین بە نەترسان؟ با خوێنەر بەسەر ئەو بەشەدا بچێتەوە: "حەقیقەتگەلێکی مەترسیدار سەبارەت بە دووڕوویی، کە زۆرینەی خەڵک نایانزانن" لە سەرەتاکانی کتێبەکەدا؛ تاکوو بیبەستێتەوە بە سیفەتەکانی دووڕووییەوە؛ پاش ئەوەی بەسەر هەموویاندا تێپەڕی و بینینی، بڕوانێ بزانێ پشکی بەرنەکەوتووە لێی؟

با هەر یەکێکیشمان ئەوەی بێتەوە یاد کە (الله)، بوونەوەری نەئافراندووە و پێغەمبەرانی نەناردووە، مەگەر بۆ جیاکردنەوە و لەبێژینگدانی توخم و خەڵکەکان. (الله) فەرموویەتی:

﴿إِنَّا عَرَضنَا الأَمانَةَ عَلَى السَّماواتِ وَالأَرضِ وَالجِبالِ فَأَبَينَ أَن يَحمِلنَها وَأَشفَقنَ مِنها وَحَمَلَهَا الإِنسانُ إِنَّهُ كانَ ظَلومًا جَهولًا ﴿٧٢﴾ لِيُعَذِّبَ اللَّهُ المُنافِقينَ وَالمُنافِقاتِ وَالمُشرِكينَ وَالمُشرِكاتِ وَيَتوبَ اللَّهُ عَلَى المُؤمِنينَ وَالمُؤمِناتِ وَكانَ اللَّهُ غَفورًا رَحيمًا﴾ [الأحزاب: ٧٢ - ٧٣] «بەڕاستی ئێمە ڕاسپاردەمان خستە ڕوو بۆ ئاسمانەکان و زەوی و شاخەکان، ئەوان ڕەتیان کردەوە هەڵیبگرن و مرۆڤ هەڵیگرت؛ بەڕاستی ئەو ستەمکار و نەزان بوو (٧٢) بۆ ئەوەی خوا دووڕووانی پیاو و ژن و، موشریکانی پیاو و ژن سزا بدا و، تەوبە لە باوەڕدارانی پیاو و ژن وەربگرێ؛ کە خوا لێخۆشبوو و میهرەبانە.»

ئیبن قوتەیبە دەفەرمووێ: "واتە: ڕاسپاردەمان خستە ڕوو بۆ ئەوەی دووڕوویی دووڕوو و، شیرکی موشریک بەدەر بکەوێ و، خوا سزایان بدا پێی. باوەڕی باوەڕداریش دەربکەوێ و ئیدی خوا تەوبەی لێ وەربگرێ. واتە: بەمیهرەبانی و لێخۆشبوون مامەڵەی لەگەڵدا بکا گەر کەمتەرخەمیی نواند لە هەندێک تاعەتدا."

دەرگەی تەوبەش کراوەیە: پەروەردگار پاش ئەوەی باسی لەوە فەرموو کە دووڕووان لە چاڵی هەرەخواری ئاگردان، فەرمووی:

﴿إِلَّا الَّذينَ تابوا وَأَصلَحوا وَاعتَصَموا بِاللَّهِ وَأَخلَصوا دينَهُم لِلَّهِ فَأُولئِكَ مَعَ المُؤمِنينَ وَسَوفَ يُؤتِ اللَّهُ المُؤمِنينَ أَجرًا عَظيمًا﴾ [النساء: ١٤٦]

«مەگەر ئەوانەی تەوبەیان کرد و چاکەیان بەرپا کردەوە و، دەستیان بەخواوە گرت و ئایینی خۆیان بۆ خوا پوخت و پاک کردەوە؛ سا ئەوانە لەگەڵ باوەڕداراندان، پەروەردگاریش پاداشتێکی گەورە دەدا بە باوەڕداران.»

سا لە پەروەردگارمان داوایە، دڵەکانمان لە دووڕوویی پاک بکاتەوە و کردەوەکانمان پاکی بۆ خۆی بێ و، لە پۆلی پێغەمبەران و ڕاستاڵان و شەهیدان و پیاوچاکاندا حەشرمان بکا، چاکترینیشن ئەوانە بۆ هاوەڵی.

لە کۆتاییشدا، هەر کەس ئەم کتێبەی خوێندەوە و سوودی لێ بینی لە پاڵفتەکردنی باوەڕیدا، بەشکوو دووعای خێر بۆ نووسەری بکا. لەیادیشی بێ کە فریشتەکە دەڵێ: "ئامین. بۆ تۆش وەکوو ئەو".

هەر کەسیش هەر هەڵەیەکی تێدا بینییەوە لە واتا، یان دەربڕینیدا، با ڕەزیلیمان لەگەڵ نەکا و ئامۆژگارییەکانی ببەخشێ. باوەڕدارانن دڵسۆز و، دووڕووانن گزیکار.

**لە نووسینەوەی چاپی دووەم بوومەوە، لە مانگی جومادای دوایی ١٤٤٤ لە کۆچی پیرۆزی موحەممەدی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)**

**ئومێدەواری میهری خوای خۆی: ئیاد عەبدولحافیظ قونەیبی**

# ناوەڕۆک




هۆ مرۆی خوێنەر!

دەسنیشانی حاڵەتی نەفست بکە و چارەسەری بۆ بدۆزەوە بەر لەوەی شووراکە لێ بدرێت!

﴿فَضُرِبَ بَيْنَهُمْ بِسُورٍ لَهُ بَابٌ﴾، «ئەوجا شوورایەکیان لەنێوان لێدرا کە دەرگەیەکی هەبوو.» شوورایەک کە ڕۆژی دوایی لەنێوان باوەڕداران و دووڕوواندا لێ دەدرێت، مونافیقان ئیدی نە ڕووناکی دەبینن، نە لەگەڵ ئیمانداراتیشدا دەچنە بەهەشتەوە!

ئەم پەڕتووکە:

- هۆشیاریدانێک لە یەک مەترسیدارترین دیاردەکان لە ژیانی هاوچەرخی موسڵماناندا.
- ڕاستکردنەوەیەک بۆ چەمکەکانی خەڵک لەبارەی دیاردەی دووڕووییەوە.
- هەوڵێک بۆ تێگەیشتن لەو پرۆسە دەروونییانەی کە سەر بۆ کەوتنە ناو نیفاقەوە دەکێشن.
- هۆشیارکردنـەوەی موسڵمانان کە زۆرێکیان دەشێــت بکەونە ناو سیفەتگەلێــکی نیفاقەوە و هەستیشی پێ نەکەن.
- یارمەتیدانێک بۆ چارەسەرکردنی نەفس لە سیفەتەکانی دووڕووان.


9 789355 712448

نرخ : ٥٠٠٠ دینار